# ئامۆژگاری بۆ گەنجانی موسڵمان



## لە ڕوونکردنەوەی بیری توندڕەوانەی زانایانی هاوچەرخی سعودی





بە پێنووسی پەرمەندی سعودی
حەسەن فەرحان مالیکی
بە کوردی کردنی
زێیار عەزیزخان مهاجیر

چاپی یەکەم ٢٠١٦

# ئامۆژگاری
# بۆ گەنجانی موسڵمان

## لە ڕون کردنەوەی بیری توند ڕەوانەی زانایانی هاوچەرخی سعودی

بە پێنووسی بیرمەندی سعودی

حەسەن فەرحان مالیکی

بە کوردی کردنی

ژێبار عەزیزخان مهاجیر





ناسنامەی


نـــــــاو : ئامۆژگاری بۆ گەنجانی موسڵمان

خوێندنەوەیەك بۆ كەلەپوری

وەهـابی و زانایـانـی سعودییە

نـــووسیـنی : حەسەن فەرحان مالیکی

بـــابـەت : زێبار عەزیز خان مهاجیر

دیزاینی ناوەوە : محمد حسێن خەتی

بـــــەرگ : قەهار بلباس

چـــــاپ : یەكەم چاپ- هەولێر -٢٠١٦

بـــڵاوكراوەی: كتێبخانەی حاجی قادری كۆیی/هەولێر

نـــــرخ : ٧٠٠٠ دینار





كتێبخانەی

حاجی قادری كۆیی

دیزاین - چاپكردن - بڵاوكردنەوە

٢٢٢٣٨٦٨ ٠٦٦

٢٦٤٨٩٠٧ ٠٦٦

عێراق - كوردستان - هەولێر







لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی ٢٦ ی ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە.





07504671394

Mdmaktaba@gmail.com

# پێرست



(١) مەبەست لە شانشینەکە: شانشینی عەرەبی سعودییە. (وەرگێڕ).

# پێشەکی وەرگێڕ

گومان لەوەدا نییە هەر شتێك بنەچەی هەیە، دیوار لەسەر بناغە، درەخت بە ڕەگ و ڕیشە وەستاوە، کار و کردەوەش سەرچاوە و ڕەگی هەیە، ئەویش بریتییە لە بۆچوون و بیر و هزر، کە لە زەمینی واقیعدا بەرجەستە دەکرێ.

گومان لەوەدا نییە ئەوەی ئەمڕۆ ڕێکخراوی تیرۆریست و توندڕەو و دڕندەی داعش دەیکات، بناغە و ڕیشەی لە ناو بۆچوون و فەتواکاندا هەبووە و هەیە، بەر لە ڕووبەڕووبوونەوەی داعش لە ڕووی کرداریەوە، ئەوا پێویستە لە ڕووی هزریەوە سەرچاوەکانیان وشك بکرێن یان هۆشداریان لەبارەیەوە بدرێ.

ئەم کتێبەی بەردەستمان کە لە زمانی عەرەبیەوە وەرمگێڕاوە بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی، پێم وایە یارمەتیدەرێکی باشە بۆ ئاشنابوون بەو سەرچاوە و ڕاو بۆچوون و فەتوایانەی ڕەگ و ڕیشە و ژێرخانی ڕەوتی توندڕەوین لە سەردەمی ئەمڕۆدا.

هیوای تەمەن درێژی و سەرکەوتن بۆ نووسەری بەڕێز دەخوازم، ئومێدم وایە توانیبێتم واتا و مەبەستەکان وەك خۆیان بگوازمەوە و کەڵك بە خوێنەری ئازیز بگەیەنم.

لە کۆتاییدا دەمەوێ سوپاسی ڕێزدار: "سەرهەنگد عبدولواحید" بکەم کە ئەرکی پێداچوونەوە و هەڵەچنینی گرتەئەستۆ[1].

سەرکەوتن تەنها لە خواوەیە، هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو لایەك.

**زێبار عەزیزخان مهاجیر**

---

(١) بۆ ڕاڤەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز سوودم بینیوە لە: تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، نووسینی بورهان محمد أمین.

## پێشه‌كی نووسه‌ر

### به‌ناوی خوای به‌خشنده‌ی میهره‌بان

سوپاس بۆ ئه‌و خوایه‌ی فه‌رموویه‌تی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾ النساء: ١٣٥. واته: (ئه‌ی ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕتان هێناوه هه‌میشه ڕاگری دادوه‌ری بن‌و شایه‌تیی بۆ خوا بده‌ن ، با شایه‌تیه‌كه‌شتان زیانی بۆ خۆتان و دایك و باوكتان یان خزمانیش هه‌بێت ، ئه‌گه‌ر كه‌سێك له‌وانه ده‌وڵه‌مه‌ند بێت یان هه‌ژار خوا به‌رژه‌وه‌ندی ئه‌وان چاكتر ده‌زانێت له ئێوه "واته: به ته‌ماعی ده‌وڵه‌مه‌ندی له دادپه‌روه‌ری لامه‌ده‌ن و به‌هۆی نه‌داریی و به‌زه‌یی بێ جێ له حه‌قلا مه‌ده‌ن" نه‌كه‌ن شوێن ئاره‌زووی نه‌فس بكه‌ون له دادپه‌روه‌ری لابده‌ن ، جا ئه‌گه‌ر ئێوه پێچ لێبده‌ن " زمان بگۆڕن " و شایه‌تی ناحه‌ق بده‌ن ، یان پشت هه‌ڵكه‌ن ، ئه‌وه چاك بزانن خوا ئاگاداره به‌كارو كرده‌وه‌تان) .

هه‌روه‌ها فه‌رموویه‌تی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾ المائدة: ٨. واته : ( ئه‌ی ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕتان هێناوه ، زۆر به چاكی هه‌ستن به ئه‌نجامدانی شایه‌تی دادپه‌روه‌رانه له‌به‌ر خوا ، ڕق و دوژمنایه‌تی هیچ كه‌س و هیچ لایه‌ك هه‌ڵتان نه‌نێت كه له دادپه‌روه‌ریی لابده‌ن ، دادپه‌روه‌ربن ، ئه‌وه نزیكتره له ته قواو خواناسیه‌وه ، ده‌ی كه‌واته له خواترس و پارێزكاربن ، چونكه به‌ڕاستی خوا ئاگاداره به‌و كارو كرده‌وه‌یه‌ی كه ده‌یكه‌ن ) .

درود و سڵاو لەسەر سەروەرمان محەممەدی کوڕی عەبدوڵا، کە بەڵێنی لە ئوممەتەکەی وەرگرتووە لەسەر ئەوەی هەروەك لە سەحیحی بوخاریدا[1] هاتووە: ((ڕاستی بەرپا بکەن – ڕاستی بڵێن – لە هەر کوێیەك بین، لە پێناوی خوا لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك نەترسین)). لە سەحیحی موسلیمیشدا[2] بەم شێوە دەربڕینە هاتووە: ((لەسەر ئەوەی ڕاستی بڵێین لە هەر کوێیەك بین، لە پێناوی خواش لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك نەترسین)).

درود و سڵاو لەسەر خانەوادە پاك و چاکەکەی، ڕەزامەندی خوا لە هاوەڵە کۆچبەر و پشتیوانەکان و ئەوانەی بەچاکە شوێنیان دەکەون تا ڕۆژی دوایی، پاشان:

من بۆ ماوەی بیست ساڵە لە شانشینی عەرەبی سعودیدا سەرقاڵی کاری نووسین و ئامۆژگاری و وتاردانم، بەو هیوایەی خوای مەزن هۆزەکەم ڕێنوێنی بکات بەرەو دادپەروەری و ویژدان و زانست و لەخواترسان.

بەڵام دوای ئەوەی بینیم خەڵك کڕین و فرۆشتن بە ئاینی خواوە دەکەن، واپێم باش بوو ئەم هاوارە بکەم، جا نازانم ئەو سپاردە زانستیەی لە ئەستۆمدایە لایدەبات یان نا.

با هەمووان لێم ببورن، چونکە من نامەوێ لە دونیادا پایەدار و لە لای خوای مەزنیش نەفرەت لێکراو بم، نامەوێ لەوانە بم کە خوای مەزن لەبارەی ئەوانەوە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴾البقرة: ١٥٩. واتە : ( بەڕاستی ئەوانەی کە بەرنامەو ڕێنموویيەکانی ئاشکرای ڕەوانەکراوی ئێمە دەشارنەوە کە

(١) بەپێی ئەو ژمارەیەی لە (فتح الباری)دا بۆی دانراوە ٩/ ٩٦.

(٢) سەحیحی موسلیم ٦/ ١٦.

ناردوومانە ، دوای ئەوەی بۆ خەڵکیمان روون کردۆتەوە لە کتێبەکاندا ، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێدەکات و نەفرینکارانیش نەفرەتیان لێدەکەن ) .

بەڵکو ئومێدم وایە خوای گەورە بم گەیەنێ بە کاروانی ئەوانەی لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾البقرة: ١٦٠.واتە: (جگە لەوانەی کە تەوبەیان کردووەو چاکسازیان ئەنجامداوەو ئەو حەقیقەت و ڕاستیان روونکردۆتەوە کە جاران شاردبوویانەوە ، ئا ئەوانە گەڕانەوەکەیان لێ وەردەگرم و تەنها منیشم زۆر تەوبە وەرگرو دلۆفان و میهرەبانم).

خوایەگیان؛ من ماستاوچێتی و زمانلوسی و بێدەنگیم نواندووە لەهەمبەر زۆر شتی پڕ و پوچ و ستەم و درۆ بە ناوی خوا و پێغەمبەرەکەی، ترسم لە گیان و ڕزق و ڕۆزی و منداڵەکانم هەبووە، تەنها کەمێکم ڕوونکردۆتەوە لەوەی دەیزانم، خوایەگیان لێم ببوورە بە کەمێك ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستیەی ئەنجام دەدەین، چاوپۆشی بکە لەو هەموو بێدەنگیەی پیادەی دەکەین، دوو زمانەکانم لێ دوور بخەرەوە، ئەگەر تووشیتاقیکردنەوەیەکت کردم، ئارامگریم پێ ببەخشە لەسەری، منداڵ و خانەوادە و نەوەکانم بپارێزە ئەی پەروەردگاری جیهانیان.

ئینجا دەڵێم :

ئەم بێدەنگییە دوور و درێژە لەهەمبەر زیادەڕۆچویی زۆرێك لە زانایان لە شانشینی عەرەبی سعودیدا، بەو هیوایە بووە ڕێگەی ڕاست بگرن، بەڵام بێ کەڵك بوو، سزای خوا بۆ ئەوانەی زیادەڕۆچوون لە نکۆڵی کردندا بریتییە لە بێ بەشکردن لە ڕێنوێنی: ﴿ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۚ وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِ وَحۡدَهُۥ وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورٗا ﴾ الإسراء : ٤٦. واتە : ( " چونکە مەبەستیان نییە

تێبگەن" ئێمەش پەردە دەهێنین بەسەر دڵیاندا تا هەر تێی نەگەن ، گوێشیان سەنگین دەکەین تا نەیبیستن ، جا کاتێك لە قورئاندا تەنها ناوی پەروەردگارت دەبەیت" باسی بت و بەرنامەیان ناکەیت" ، ئەوە پشت هەڵدەکەن ورووەردەگێرن وبێزاریدەردەبرن ودەڕۆن).

وە فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴾الكهف: ٥٧. واتە: (کێ لەوە ستەمکارترە کە یاداوەری کرابێت بە ئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاری ، کەچی رووی لێ وەرگێراون و لووتی بەرز گرتووەو ئەوەشی لە یادکردووە کە چ دەستپێشخەریەکی کردو وە لە گوناه و تاوان ، ئێمە بەڕاستی پەردەمان هێناوە بەسەر دڵیاندا تا لە ئایەتەکانی ئێمە تێنەگەن و قورسی و کەڕیشمان کردۆتە گوێیانەوە ، خۆ ئەگەر بانگیان بکەیت بۆ ڕێبازی هیدایەت و دینداری ، ئەوە هەرگیز ئەوانە ئەو هیدایەتە وەر ناگرن ) .

خۆبەزانازانەکان؛ ئەوانەی کە زانای دەسەڵاتدارەکانن و بەندەی مەزهەبەکان و هیوای مشتومڕ هەڵگریان هەیە دێن، دەڵێن: ئەمە لە بارەی هاوبەشدانەرانەوە دابەزیووە، تۆ تەکفیر دەکەیت و بەخۆشت دەکەویە ناوی. دەڵێین: بەڕاستی بە خستنەڕووی ئەم شتانەدا ماندوو بووین، ئێمە تەنانەت ئەوانەش کافر ناکەین کە ئێوە بە بێ بڕوا و کافر دایدەنێن لە جولەکە و نەسڕانی و سابیئەکان. ئەمە لە دونیادا، سەبارەت بە دواڕۆژ ئەوا خوای مەزن حوکم دەکات و ئەوە یەکلا دەکاتەوە کە کێ بەڵگەی پێگەیشتووە و کێ پێی نەگەیشتووە، کێ لە بەڵگەکە تێگەیشتووە، ئینجا لوتبەرزی نواندووە، ئەوەش لە بەڵگەکە تێنەگەیشتووە و باوەڕە پێشووەکەی

نەلـەقاوە. بـەپێی ئـەوەی دەیـزانم لەمـەدا جیـاوازم لەگـەڵ گشـت بۆچـوون و مەزهەبەکان.

بەم پێیـە ئەگـەر ئایـەتێك بهێنمـەوە ئـەوا بـەهۆی ئەوەیـە وەسـفەکەی تێدایـە، نەوەك وەك حوکمێك لەسەر کەسێك دابیەزێنم. با موسڵمانیش وریا بێ، چونکە هیچ ڕەچـەڵەکێك لـە نێـوان ئـەو و خـوادا نییـە: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾النساء: ١٢٣. واتـە: ( "پاداشـت و ڕێـزو نـرخ" نـە بـە ئـارەزووی ئێوەیـە ، نـە بـە ئـارەزووی خاوەنانی کتێبە ، ئەوەی خراپە و گوناهێك بکات ، ئەوە بە هۆیـەوە سـزا دەدرێت و هیچ کەس و هیچ هێزێکی تـری دەست ناکـەوێت جگـە لـە خـوا پشـتگیریی بکـات و یارمەتی بدات ) .

ڕۆژ دوای ڕۆژ بـۆ خـەڵك ڕوون دەبێتـەوە کـە مـن شـوێن هـیچ مەزهـەبێك نەکەوتووم، مەزهەبی من ئەوەیە کە لە ئاینی خوا تێدەگەم، تەنانەت وتەی (مقبلی) ڕەحمەتی خوای لێبێ کە دەڵێ: ((خوایەگیان؛ هـیچ مەزهـەبێکم نییـە جگەلـە ئـاینی ئیسلام نەبێ))، بە ڕەهایی نییە، بەڵکو ئەوەی ئێمە لە ئاینی ئیسلام دەیـزانین، ئـەوا ئەوە مەزهەبمانە، لەوانەیـە هەنـدێك ڕاو بۆچـوونی تایبـەت هـەڵگرین بـۆ خۆمـان و بەکەسی ڕانەگەیەنین، چونکە دەبێ برێك لە ئاینی تایبەت بمێنێ لە نێـوان بەنـدە و پەروەردگاری، نابێ گشت ئایین ڕاگەیەندراو و ئاشکرابێ.

**زۆر درێژەی پێنادەم.**

ئەمە توێژینەوەیەکە پـێش چەند سـاڵێك ئامـادەم کـردوووە لـەبارەی زانایـانی شانشـینی عـەرەبی سـعودی، هیـوام وایـە کاریگـەری هـەبێ، بـەڵام وا دەردەکـەوێ کـە هەمووان دەیانەوێ لە ئاینی خوا وەربگرن و نەبەخشن. بۆیـە پێویسـتە لێـرەدا بڵاو

بکرێتەوە، ئەمە توێژینەوەیەکی هێمنە، هێرشی سەر هیچ کەسێك ناکات، بەڵکو بیرۆکە و فەتوا و هەڵسوکەوتەکان دەگوازێتەوە، ئینجا هەوڵ دەدات بپرسێت و ڕەخنە بگرێت.

ئەوەی زیاتر وایکرد سووربم لەسەر دەرکردنی ئەم توێژینەوەیە و بڵاوکردنەوەی، ئەوە بوو بینیم ئەم کۆنگرانە هیچ شتێکی بەرهەست بەرهەم ناهێنن، چونکە هەمووان دەترسن لە سەرپێچی کردنی شانشین، من وەك خودی خۆم نازانم حکومەتەکەم هاوبێنەی ئەم توێژینەوەیەی پێ خۆشە یان نا، ئایا لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکات لەسەری یان بە ڕایەکی دەزانێ کە مافی خۆمە بیخەمەڕوو، ئایا لە زیادەڕۆچوون یان لە هاوسەنگیەوەیە، ئایا حکومەتەکەم دەیەوێ لەسەر زیادەڕۆچوون بمێنێتەوە، هەر کاتێك پێویستی پێ هەبێ، یان بەهۆی هۆشیار و وریاییە کەمەکەیەوەیە، لە کاتێکدا زیادەڕۆچوون خەریکی خواردنی لاشە و دڵەکانە، بە ئافرەت و گەنجەکانەوە، یاخود دەبێ پەلە بکرێ لە ڕزگارکردنی بەرکەوتووانی شاڵاوی زیادەڕۆچوون؟.

بە ڕاشکاوی... چیتر لەلام گرنگ نییە لەوەی حکومەتەکەم لەسەر ئەم توێژینەوەیە ڕازی دەبێ یان نا.

لەبەر ئەوەی نازانم تەواو هەڵوێستەکەی چییە.

بەتایبەت لە دوای ئەم دواکەوتنە دوور و درێژە لە هەموارکردنی پەیڕەوەکانی خوێندن و فراوانکردنی بازنەی بەشداریکردنی زانستخوازان، سوود بینین لە توێژەران و شەرعناسانی مەزهەبەکان لە دارشتنی پەیڕەو و مەزهەبێکی هەرە نزیك لە ئایینی خوا.

کورت هەڵهێنان لەسەر مەزهەبی وەهابیدا زۆری خایاند، لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەم کە مەزهەبی ناوبراو مەزهەبێکی دابڕاوە، خاوەنی بیرۆکەی تایبەت و جیاوازە

لە چوار مەزهەبەکان، زۆر زیاتر لەوەی چوار مەزهەبەکە لە یەکتر جیاوازن، ئەوا ماڵی مەزهەبی وەهابی و ماڵی ئێمە و ماڵی زانینیشە بە مەزهەب ناوببرێت، ئەگەر شوێنکەوتووانیشی نەیانەوێ بە مەزهەب ناوببرێ، ماڵی ئەوەیان نییە پێش لە زانین بگرن، کە دەزانێ ئەوان مەزهەبێکن جیاواز لە گشت مەزهەبە سونیەکانی تر، ئەوەی دەیەوێ با بەڕاستی دابنێ، ئەوەش نایەوێ با بەدرۆی بزانێ، ئێمە لێرەدا ڕووی گوتارمان ناکەینە خەڵکی سادە و کاربەدەست و یەك لە دەی زانایان و زانستخوازان، بەڵکو ڕووی گوتار دەکەینە ئەوەی دواندن دەزانێ، دەزانێ مەزهەبێك بەچی لە مەزهەبێکی تر جیا دەبێتەوە، کەی دەکرێ مەزهەبەکان ئاوێتە بکرێن، کەی لە یەکتر جیا دەکرێنەوە، لێرەدا چەند پێوەرێکی زانستی هەن کە ملکەچی سیاسەت و زمانلوسی نین.

بە هەر حاڵ، گەنج و لاوی سعودی ماڵی ئەوەی هەیە شارەزای مەزهەبی وڵاتەکەی بێ، لە ناو خودی سعودیەدا، هەمووشمان هەڵوەستە بکەین لەسەر فێڵ و خۆگێل کردنەکەی، ئەم توێژینەوەیە تەنها ئاڕاستەی گەنجان دەکات بۆ ئەوەی لێی تێبگەن و ڕاستییەکان بزانن.

بەڵێ کەسانێك دەبینن لەبارەی منەوە دەڵێن: عەلمانیە... لیبڕاڵییە... شیعەیە... زەیدییە... نەزانە... نەخۆشە... شێتە... تا دوایین ڕستەی تۆمەتەکانی وەهابیەت.

چیتر ئەمە کارمان تێناکات، چونکە بەزەیمان بەو کەسانەدا دێتەوە کە هاووێنەی ئەم نازناوانە لە کەسەکان دەنێن.

بەخوا ئێمە زیاتر بەزەیمان بەواندا دێتەوە زیاتر لەوەی خۆیان بەزەیان بەخۆیاندا دێتەوە، هیوای ڕێنوێنیان بۆ دەخوازین، بەڵام ئەوەی دەرگای بەهرەکانی خوا دابخات، ڕێگە نەبێ بۆ ڕووناکی بچێتە ژوورەوە لە ڕێگەی چاو و گوێچکە و ژیری و دڵەکاندا، ئەوا ئێمە چی بۆ بکەین؟

خوایەگیان؛ ئێمە گەواهی خۆمان دەدەین، تۆش دەزانی کە تاوانی زیاترمان تێدایە لەوەی گومان دەبەن، تۆش زانای بەوەی ئەم تۆمەتانەمان بۆ هەڵدەبەستن بە هۆیزانستەوەیە یان بۆ ئەوەیە خەڵك لە حەقْ و ڕاستی بگێڕنەوە.

سەبارەت بە نەزان، ئەوا ئازادە... خوای مەزن لە دونیا و دوارۆژدا لێی خۆشبووە.

ئەوەش کە ئەم تۆمەتانە دەبەخشێتەوە و دەزانێ بێ بنەمان، بەڵکو بۆ ڕێگرتنە لە گەنجان لەوەی بگەن بە ڕاستی، خوایەگیان؛ تۆ بڕیاردەری دادگەری... لە کتێبەکەتدا بەم فەرمایشتەی خۆت وریات کردوونەتەوە: ﴿ وَلَا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِهِ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا... ﴾الأعراف: ٨٦. واتە: (هەروەها لەسەر هیچ ڕێگەیەك دامەنیشن هەڕەشە لە خەڵکی بکەن و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە بە خوا قەدەغەیان بکەن لەگرتنی ڕێبازی خواو بتانەوێت ڕێبازی خوا بەلاری و لەوێری پیشان بدرێت و پیادە بکەن...). تۆش دەزانێ کێ مەبەستی ڕێگرتنە لە ڕێگەی خوا، لە پێناو پاراستنی ڕێگە پەرتەوازەکان، دەزانی کامەش ڕێگەی گرتووە لە ڕێبازی خوا، بەوەی گومانی وایە ئەوەی دەیکات ڕێنوێنیە.

تۆ شارەزی بە بەندەکانت... نەك ئێمە.

ئەمەیان پوختەیەکە لە چەمکی زانایان، جێبەجێکراوە لەسەر زانایانی شانشینەکە، (لەوەی ئایا پێناسەی زانا و شەرعناسیان لەسەر جێبەجێ دەبێ یان نا؟)، دواتر چەند نموونەیەك لە فەتوا و ڕاو بۆچوونەکانیان دەخەینەڕوو لەگەڵ ڕەخنەگرتن لێیان لەوەی دەزانین کە ڕاستە.

# چەمكی زانایان

زانـا (العـالِم) – بـە لـەژێر (کەسـرەی) پیتـی لام – وشـەیەکی کـورتبڕی گشـتی مەزنە، لەوانەیە مەبەسـت لێی زانـا بـێ بـە ڕەهـایی لـە گشت زانستەکاندا، ئەمـەش شتێکی ئەستەمە چ لە ڕابردوو و چ لە ئێستادا، ئـەوەش کـە بانگەشـەی ئـەوە دەکات زانایە بەڕەهایی لە گشت لقەکانی زانستدا، ئەوا هەر لە بنەڕەتدا نەزان و نەشارەزایە لە مانای (زانست)دا.

لەوانەیە مەبەست لە وشەی زانا ئەو زانایـەبێ کـە شـارەزایە لـە کاروبـار و شـتە شەرعییە دینیەکاندا – بەم مانایە زیاتر بەکار دێ – (لـە فیقـە، فـەرموودە، ڕاڤـەی قورئان، بیروباوەڕ، ڕێزمانەکەی، ئەو شتانەش کە پێویستن بۆ ئەو زانستانەی پێشوو، وەك: زانسـتی زمـان و مێـژوو... تـاد)، بەهـەمان شـێوە ئەمـە لەسـەر هـیچ کەسـێك نایەتەجێ و جێبەجێ نـابێ نـە لـە ڕابـردوو و نـە لـە ئێسـتادا، - بـەپێی ئـەوەی مـن دەیزانم – هیچ کەسێك بە تەواوی شـارەزا نـەبووە لـەم زانسـتانەدا بەیەکـەوە، هـەتا ئەگەر بانگەشەی ئەوەش بکرێ و یان شتێکی لەو جۆرەش بوترێ. زۆر کات دەبینین لە کتێبەکانی ژیاننامەدا دانـراوە بەم ڕاستییەدا، دەوترێ: فڵان کـەس شەرعناسـە و فەرموودەناس نییە، فڵان کەسە فەرموودەناسە و لە فیقهدا شارەزا نییە... تاد.

دواتـر ئەگـەر بچینە سـەر ئاسـتی دیـاریکردنی یـەك لایـەنیش، وەك: (زانسـتی فـەرمووده)، دەبیـنین (فەرموودەناسـان) یـان ئەوانـەی پێیـان دەوترێـت: (زانایـانی فەرمووده) زانا نین لە گشت بوارەکانی زانستی فەرموودەدا، کە دەیان لقی هەیە... لە واقیعدا و لە کتێبەکانی ژیاننامەکاندا بەهەمان شێوە دەبیـنین: فڵان فـەرموودەناس زانـاترە لـە هۆیەکانـدا، فڵان شـارەزاترە لـە فـەرموودەدا، فیسـارە زیـاتر دەقـەکانی فەرموودەی هێناوە، فڵانە لەهەمووان لەبەرکارترە، فڵانە زاناترە بـە گێڕەڕەوەکـان... بەم شێوەیە.

دواتر ئەگەر بڕۆینە سەر ئاستی لەبەرکردنی فەرموودە، کە لقێکە لە لقەکانی فەرموودە، بەهەمان شێوە لە واقیع و لە کتێبەکانی ژیاننامەشدا هاتووە، کە فڵان زۆر بە هێزە لە لەبەرکردنی دەقەکانی فەرموودەدا، فڵانیش زیاتر زنجیرەی گێڕەرەوەکانی فەرموودەی لەبەرە... تاد.

ئەگەر بەردەوام بین لە بارەی (لەبەرکردنی زنجیرەی گێڕەرەوەکان)، ئەوا بۆ نموونە دەبینین: فڵان زۆرترین زنجیرەی گێڕەرەوەکانی خەڵکی شارەکەی لەبەر کردووە، فڵان کەس زۆر بە ڕێك و پێکی شێوەکانی گێڕانەوەی لەبەرە: (گوێبیست بووین، بۆمانی گێڕایەوە، هەواڵی پێداین، لە فڵان و فڵانەوە، من بیستومە... تاد).

مەبەستمان لە زانایە[1] هاوچەرخەکان لە شانشینی سعودیەدا لە ڕووی پێناسەکردنەوە ئەوانەن (کە لەلای دەوڵەت بە زانا دانراون، ئینجا لەلای زۆربەی گەلی سعودی، ئەم دانپێدانانەی گەلیش بەلاساییکردنەوەی بڕیاری دانانی فەرمی ئەم زانایانەیە)، کۆمەڵگەی موسڵمان لە سەدەکانی سەرەتادا لەسەر ئەمە ڕۆیشتوون، مەگەر لە دۆخی دەگمەندا نەبێ، بەکارهێنانی نازناوی (زانایان) ملکەچی پێوەرە زانستییەکان نەکراوە، نە سەدەکانی ڕابردوو و نە لە ئێستاشدا، فەرامۆشکردنی پێوەرەکان هەڵەیەکی کۆنە، تەنها دەوڵەتان و گەلان ئەم هەڵەیە لە ئەستۆ ناگرن، بەڵکو ئەمە دەستکورتی و کرج و کاڵییەکە لە شارستانیەتی ئیسلامیدا هەیە، لەسەر ئاستی سیاسی و جەماوەری زانستیدا.

(١) تێبینیەك: لێرەدا مەبەستمان لە وشەی (زانایان) ئەوانەن کە (دەوڵەت) دەستنیشانی کردوون، مەرج نییە پێوەرەکانی (زانا) لەسەر هیچ یەکێکیان جێبەجێ ببێ، ئەمەش کەم کردنەوە نییە لە شان و باڵی هیچ کەسێك، نە ئەوەی کە زاناکەی هەڵبژاردووە، نە ئەوەش کە هەڵبژێردراوە وەك زانا، بەڵام کاتێك بابەتەکە پەیوەست دەبێت بە (زانستەوە)، ئەوا دەبێ بەگوێرەی ئەوەی لە توانامانداا بێ ڕا و بۆچوونی هەر نزیك لە زانست و بابەتی بوون بخەینەڕوو.

لێرەدا ئەم پرسیارە دەکرێ:

## أ- ئایا (زانایانی شانشینەکە[1]) لە کوێی پێناسەی پێوەری زانستیدان؟

سەبارەت بەوەی پەیوەستە بە بابەتەکەمانەوە (زانایانی شانشینەکە)، ئەوا درک کردنی زانستخوازان و بەرپرسان و تێکڕای گەل بە دەستکەوتە زانستییەکانی (زانایان) لە لقە زانستییە شەرعیەکاندا، کە پێشتر باسیان لێوەکرا، لە یەك ئاستدا نییە، بەڵکو لەسەر چەندین ئاستی جیاوازدایە. مەبەستم لەوەیە هەندێك درك بەوە دەکەن کە ئەوانە زانان لە هەندێك شتدا جیا لە شتەکانی تردا، هەندێك شت دەزانن و هەندێك شتیش نازانن، بەویژدانن و دەمارگیریش دەبن، لاسایی دەکەنەوە و بەرگریشی لێدەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی کات و سەردەم گۆڕاون و پێویستیان بە وردبینی و ڕێك و پێککردنی وشە و دەربڕینەکان هەیە، دەمەوێ باسی دە کۆت و بەند بکەم، دەبێ بەکاربهێندرێن لە گوزارشتی (زانایانی شانشینەکەدا)، نەوەك فەرامۆش بکرێن.

لە سەرەتاوە بە تێڕوانینی جەماوەری و فەرمی و گشتی، تا لە هەر کۆت و بەندێکدا لە گشتاندن و ڕەهاییەوە دادەبەزێت بۆ تایبەتکردن و کۆت و بەندکردن، ئەمەش لە چوارچێوەی ویژدان و خودناسی و کارلێك لەگەڵ نوێسازی زانستی پێشکەوتوو لەسەر کۆمەڵگە، بمانەوێ یان نا، ئەمە وادەکات دووبارە چاو بخشێنینەوە بە زۆرێك لەو دەربڕینە ڕەهایانەی بەکاریان دەهێنین، پێداچوونەوە بکەین بۆ زۆرێك لەو (دڵنیاییانە)ی لە ڕابردوودا لەسەری بووین، چ پێویستی یان نیمچە

(١) مەبەست لە شانشینەکە: شانشینی عەرەبی سعودییە. (وەرگێڕ).

پێویستی وایخواستبێ، بەڵام ئەمڕۆ پاساو لەگەڵ پێشکەوتنی زانست و زانیاری کەم دەبێتەوە. هەر بۆیە لێرەدا دە کۆت و بەند هەن، دەبێ ئاگاداریان بین:

## کۆت و بەندی یەکەم : ( زانای شارەزا تەنها لە زانستە شەرعییەکاندا )

ئەگەرچی – هەروەك دەخرێتەڕوو – ئەم کۆت و بەندە بەس نییە، بەڵام هێشتا باشترە لە گوزارشتی (زانایان = بەڕەهایی)، ئەم کۆت و بەندە (لە زانستە شەرعییەکاندا) سەلمێنراوە لەلایەن دەسەڵاتە فەرمییەکان و تێکڕای گەلەوە، ئەوەی لە کاتی بەکارهێنانی وشەی (زانایان) خۆی بە گوێچکەدا دەکێشێ ئەوەیە کە ئەوان (زانایانی شارەزان تەنها لە زانستە شەرعییەکاندا)، لەوانەیە واباوبێ ئەم مانایە خۆی بەگوێچکەدا بکێشێ.

ئەمە بەکارهێنانی فراوانە سەرباری بوونی ئەم کۆت و بەندە، پێشتر بەڵگە خرانەڕوو لەسەر لاوازی بەکارهێننانی ئەم چەمك و وشانە بەڕەهایی. بەڵام چەند بابەتێکیان بەدەستەوە ماوە کە شارەزاییان تێدا نییە، بۆ نموونە: ئەو شتانەی تایبەتن بە بینینی نوێبوونەوەی مانگ، پرسی دیموکراسی، هەڵبژاردن و هاوشێوەکانی، گفتوگۆی نێوان مەزهەبەکان...، لەساڵانی دواییدا دەرکەوت کە ئەوان زۆر لە خوار خەڵکی سادەوەن لە زانینی گرنگی ئەم شتانە، جا بۆچی کەسێك کە شارەزایە لەم شتانە پرسیاریان لەبارەوە لە کەسێك دەکات کە نرخ و بەهای ئەم شتانە نازانێ؟! جا بۆ نموونە: گەل لەو زانایانەشارەزاترە لە بایەخی گەردوون و ڕووانگەکان... ئەی بۆچی ئەوەی شارەزاترە هەر بە لاساییکەرەوەی ئەو کەسە دەمێنێتەوە کە کەم شارەزایە لەم پرسەدا؟... جا پێوانە لەسەر ئەمە بکە. داوای ڕوونکردنەوە کردن لەو کاتەدا دەبێ کە مرۆڤ شارەزا نەبێ لە شتەکەدا، نەوەك لەو

کتەی زانیاری لەسەر هەبێ؟ دەبێ لەم شتانەدا لە کۆنەوە بۆ ئەو زانایانە نەگەڕابانەوە...

خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئەگەر هەر بڕواناکەن و نایزانن دەئێوە لە شارەزایان بپرسن ؟ ) ... نەیفەرمووە : ئەگەر دەیزانن). تەنانەت نەوەك پرسیاریان لێ بکەن لە کاتێکدا ئەوان زیاتر لە ئێوە نەزان و نەشارەزا بن.

ئەگەر دابنێین بەوەی مەبەست لە (أهل الذکر) زانایە لاساییکەرەوەکانە.

## کۆت و بەندی دووەم : ( زانایانی شارەزا تەنها لە فیقه و بیروباوەڕدا )

بەم کۆت و بەندە زانایانمان دابەزاندە پلەیەکی تر، کە دەبوایە بۆی دابەزیبووبان، ئەم کۆت و بەندە هەر چەندە زوو خۆی بە گوێچکەی زۆرێك لە زانستخوازاندا دەکێشێت، ئەوانەی بەشێکی باشیان هەیە لە زانست وەرگرتندا، بەڵام ئەم کۆت و بەندە ڕاناگەیەنن، هەر چەندە زۆر گرنگە، داوای ڕوونکردنەوەی لە زانستە شەرعییەکانی تردا وەك: فەرموودە و ڕاڤەی قورئان لەو زانایانە ناکەن... زۆرێك لە زانستخوازان – لەگەڵ خۆدوورگرتنیان لەم بەکارهێنانە – ئەوا دەزانن زانایانی شانشینی عەرەبی سعودی تەنها (زانایانی شارەزان لە فیقه و بیروباوەڕدا)

بەدەر لە زانستەکانی تری ئایین، لە زانستی فەرموودەدا وەك ئەلبانی نین، لە ڕاڤەی قورئاندا وەك ئیبن عاشور نین، لە شارەزایی لە جۆرەکانی خوێندنەوەی قورئاندا وەك عەبدلعەزیز عەبدلفەتاح نین، سەرباری زانستە پێویستەکانی تر کە پێویستە بۆ زانستە ناوبراوەکان، وەك: مێژوو، زمان، ژیربێژی، کەواتە زانستخوازان دەزانن زانایانی شانشینەکە بایەخیان تەنها کورت بووەتەوە لەسەر بیروباوەڕ و فیقه، زۆر بەرهەمیان لەم دوو زانستەدا (بیروباوەڕ و فیقه)دا هەیە، جگەلە زانستەکانی تر.

ئەم کۆت و بەندە کە خۆی کێشاوە بە گوێچکەکاندا، ڕووی لە زیادبوون کردووە لەلای زانستخوازان. بەڵام زۆرێك لەو زانستخوازانە و جگەلەوانیش هێشتا پرسیار لەو زانایانە دەکەن لەبارەی چەند شتێکی پەیوەست بە زانستە شەرعییەکان، کە ئەو زانایانە نازانن چاك مەلەی تێدا بکەن، هەر بۆیە وەڵامی ئەم زانایانە لەم بوارە شەرعیانە دێ دوور لە سروشتی ئەم زانستانە و کرداری خاوەن وەڵامەکان... وا باشتر بووە داوای فەتوا و ڕوونکردنەوەیان لێنەکرابوایە لەم زانستانەدا، بەڵکو لەسەر ئەو زانایانە پێویست بوو بڵێن: لەبارەی ئەم شتانە پرسیار لەو کەسانە بکەن، کە لە ئێمە شارەزاترن تیایاندا.

سەرباری ئەم کۆت و بەندە نوێیە: (زانایانی شارەزا تەنها لە فیقە و بیروباوەڕدا)، بەڵام وردبینی و بابەتی بوون پێویستیان بە کۆت و بەند زیادکردنە، جا دەربڕینی (زانایانی شارەزا تەنها لە فیقە و بیروباوەڕدا) فراوانە – لە کاتی لێکۆڵینەوەدا – دەردەکەوێ کە لەسەر زانایانی شانشینەکە جێبەجێ نابێ، بەڵکو بە تەواوی لەسەریان جێبەجێ نابێ، بەهیمنیەکی دڵنیابەخشەوە ئەمە ڕوون دەکرێتەوە.

دەی با (زانایانی شارەزا لەفیقهدا) وەربگرین و بە کورتی شرۆڤەی بکەین. ئینجا (زانایانی شارەزا لە بیروباوەڕدا) وەربگرین و بە پوختی شرۆڤەی بکەین، دواتر بە دەرەنجامێکی زانستی ڕازیکەر دەردەچین... بەکارهێنانی ئەم چەمکانە بەرەهایی بۆ زانایانمان لە ڕووی زانستیەوە دروست نییە...

## یەکەم: مانا ( زانایانی شارەزا لە فیقهدا ) و ڕەخنە لێگرتنی:

كاتێك وشەی (فیقـه) وەردەگـرین، دەبیـنین گوزارشـتی: (فڵان كـەس زانایـه لـه فیقهدا) وشەیەكی گشتییه، وادەخوازێ كه كەسەكه شارەزابێ له گشت مەزهەبـەكانی فیقهیدا (وەك: مالیكی، شـافیعی، حەنـەفی، حەنبـەلی، زاهیری، فیقهی فەرمووودەناسـان، فیقهـی مەزهەبـه لەناوچـووەكانی وەك حەسـەنی بەسـری و سـەوری و نەخـەعی و ئەوزاعی و داودی و تەبەری... تاد)، ئەمه ئەو مەزهەبانـەن كـه سـەر بـه پـەیڕەوانی (ئەهلی) سوننەوەن!...

ئەمه جێبەجێ نابێ لەسـەر ئـەو زانایانـەی لـەم توێژینەوەیـەدا مەبەسـتن (كـه زانایـانی شانشـینەكەن)؛ ئـەی چـی ئەگـەر مەزهەبـه ئیسـلامییەكانی دیكـەش زیـاد بكـەین، وەك: جەعفـەری، زەیـدی، ئیبـازی... تـاد، سـەرباری شـارەزایی لـه زانسـتی بنەماكانی فیقهدا، كه هەر مەزهەبێك زانستی بنەماكانی فیقهی خۆی هەیـه. گومـان لەوەدا نییه شتەكه زیاتر ئاڵۆز دەبێ، ئەی چۆن بانگەشەی ئەوە دەكەین كه (زانایانی شانیشنەكه یان میسر یاخود شام) به ڕەهایی شەرعناسن، بێ كۆت و بەنـد... دەبێ كۆت و بەندی زانستی زیاد بكەین، یەكەم جار له چوارچێوەی زانسـتیەوە، دواتـر لـه خانەی خۆبەكەمزانیەوە.

لەوانەیه لێرەدا یەكێك بڵێت: ئەو زانایانه (فیقه و تێگەیشتنەكەیان وەرگرتووە له قورئان و سوننەت و ئەوەی بەڵگه پشتی دەگرێ، پێویسـت ناكـات بـۆ شـارەزابوون لەم مەزهەبانه بگەڕێنەوە). ئێمه دەڵێین: ئەمه پڕوپاگەندەیەكه گشت مەزهەبـەكان دەیكەن، هەر مەزهەبێك پێی وایه (ئەو شـوێن قورئـان و سـوننەت كـەوتووە). بـەڵام هیـچ یـەكێكیان بانگەشـەی ئـەوە ناكـەن كـه ڕاسـتەوخۆ لێكۆڵینـەوەیان لـه قورئـان و سوننەتدا كردووە، حوكمیان لێ هەڵهێنجاوە و فـەتوایان دەركـردووە، هـەموویان دان بەوەدا دەنێن لـه سـەرەتادا، چـەند كورتكراوێكیـان لـه فیقهـی مەزهـەبی تایبـەت بـه مەزهەبەكـەیان لەبـەركردووە، ئینجا ڕۆیشـتوونەته نـاو كتێبـه فراوانـەكانی هـەمان

مەزهەب، دواتر چاویان کەوتووە بە هەندێك کۆشش (إجتهاد) و پەسەندکردن و یەکلاکردنەوە لە ناو هەمان مەزهەبدا، پاشان لەوانەیە – کەمینەیەکی زۆر کەم – هەڵبستن بە بەراوردکاری لە شتێکدا لە نێوان هەندێك کتێبی مەزهەبەکانی تردا. زۆر دەگمەن یەکێکیان ڕاستەوخۆ بچێت بۆ گەڕان بەدوای حوکمی شەرعی لە قورئان و سوننەتدا، چونکە ئەمە ڕێگەیەکی زۆر ئەرکدار و ماندووکەرە. کتێبەکانی فیقە شەرعناسان تێیاندا ڕاجیان.

ئەو شەرعناسە فڵان فەرموودە بە ڕاست دادەنێ، شەرعناسێکی تر هەمان فەرموودە بە لاواز دادەنێ، فڵان شەرعناسە پشتگیری ڕاڤەیەك دەکات، شەرعناسێکی تر هەمان ڕاڤە ڕەتدەکاتەوە. پرسەکە بەو ئاسانیە نییە کە هەندێك ئەندێشەی دەکەن. بۆیە شەرعناسانی شانشینەکە و جگەلەوانیش ئەم ڕێچکەیەیان نەگرتۆتەبەر، ئەمە ڕێچکەی هەندێك لە فەرموودەناسان بوو، لە سەدەی سێیەمدا، (مەزهەبی زاهیری)یش لقێکە لەم ڕێچکەیە، تا ئێستاش جێگای مشتومڕ و ڕاجیاییە، سەبارەت بەوەی ئایا: نرخ بۆ ڕاجیابوونی زاهیرییەکان دادەنرێ یان نا؟. دەبینین موفتی پێشوو (محەممەدی کوڕی ئیبراهیم) فەرمانی دەکرد بە دەرکردنی شەرعناسە زاهیرییەکان لە شانشینەکەدا، ئەی چۆن ئەوان زاهیری دەبن؟! هەروەك هیچ ڕۆژێکیش نەیانوت: ئێمە حەنبەلی نین، بەڵکو ئێمە (شەرعناسانی قورئان و سوننەتین). چونکە ئەمە بانگەشەیەکی گەورەترە لەوەی بوترێ ئەوان (زانایانی شارەزان لە فیقهدا).

کەواتە (زانایانی شانشینەکە) کەشارەزان لە فیقهدا، ئەوا تەنها (مەزهەبی حەنبەلی) فێربوونە. لەگەڵ ئەوەی دەکرێ کەمێك ئاگادار بن لە (هەندێك ڕا و بۆچوونی مەزهەبە فیقهییەکانی تردا)... لە میانەی بەدواداگەڕاندا ئەوا نابینرێ ئەم ئاگاداریەیان هیچ شوێنەوارێکی هەبێ لە فەتوا و دانراو و بۆچوونەکانیاندا. لەوانەیە

ئەم ئاگادارییە – ئەگەر هەشبێ – ئەوا لە سەرچاوە نا ڕەسەنەکانیەوە (مەبەستم ئەوەیە لەو سەرچاوە حەنبلیانەیان وەرگرتووە کە زانیاریەکەیان گواستۆتەوە). گواستنەوەش هەمیشە وردبینی تێدا نییە. هەروەها لەبەر ئەوەی هەر مەزهەبێك چەمك و بەڵگەی فراوان خۆی هەیە، زانایانی شانشینەکە بانگەشەی ئەوەیان نەکردووە چەمك و بەڵگەکانی مەزهەبەکانی تریان خوێندۆتەوە بە شێوەیەکی ورد و بەرهەمدار و بەویژدانانە.

کەواتە هیچ زانستخوازێك یان (هیچ زانایەك لەم زانا بەڕێزانە) بانگەشەی ئەوە ناکات، کە ئەو شارەزایە (لە گشت مەزهەبە فیقهییە ئیسلامییەکاندا)، فەتواش بەوە نادات کە لەلای ئەو پەسەندە و بەڵگەکەی بەهێزە و نزیکترە لە مەبەستی خوا؟ نا ئەتی واناکات، بەڵکو لە ژیاننامەکانیاندا دانیانناوە بەوەی هەندێك کتێبی مەزهەبی حەنبەلیان خوێندۆتەوە بەدەر لەوانی تر. کەواتە:

## کۆت و بەندی سێیەم : ( زانایانی مەزهەبی حەنبەلی لە فیقهدا ) و ڕەخنە لێگرتنی

زیادکردنی کۆت و بەندی (حەنبەلی) لەوانەیە بابەتی تر و خاکی تر بێ، ئەگەر بەشیش نەبێ. ئەم پێناسەیە کۆت و بەندکراوە لەوانەیە تێیاندا بێتەجێ، لەوانەشە بە تەواوی نەیەتەجێ، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: زۆربەیان مەزهەبی فیقهی حەنبەلیان لە خودی قسەکانی پێشەوا ئەحمەدەوە نەناسیوە، جا ئەم وتانە لە کتێبەکانی پێشەوا ئەحمەد یان لە کتێبی قوتابیەکانیدا بن – سەرباری خۆپارێزی لە پرسی ئەوەی ئەحمەد مەزهەبێکی هەبێ لە فیقهدا –، بەڵکو مەزهەبی فیقهی حەنبەلیان لە کتێبە کورتەکانی زانا پێشینەکانەوە ناسیوە وەك: (المقنع، زاد المستنقع) یان ئەوەی ئیبن تەیمییە لە حەنبەلییەکانەوە گواستوویەتیەوە، زۆربەی زانایانی سەدەی سێیەم و چوارەمی

کۆچی پێشەوا ئەحمەدیان لە ڕیزی (شەڕعناس و فیقهناسەکان)دا هەژمار نەدەکرد، بە شەڕعناس (فەقیه) دایان نەدەنا، بەڵکو بە زانای (فەرمووده و سوننەت) هەژماریان دەکرد، لێرەدا سوننەت بە مانای بیروباوەڕ دێ.

هەر بۆیە کتێبە کۆنەکان لەبارەی ڕاجیایی شەڕعناسانەوە، وەك: کتێبی تەبەڕی (٣١٠ك مردووە) وتەی پێشەوا ئەحمەد و فەتواکانی ئەویان نەهێناوە، لەگەڵ ئەوەی فەتوای شەڕعناسانی تریان هێناوەتەوە کە ناوبانگیان کەمتر بووە لە ئەحمەد، وەك: داودی زاهری و سەوری و ئەوزاعی و ئەبو یوسف و شەیبانی و جگەلەوانیش...، هەر چەندە ئەحمەد کتێب نووسینی لە فیقهدا بە ناپەسەند داناوە، ڕێگریشی لێکردووە، شەڕعناس و فیقهناسەکانی بە بیدعەچی داناوە، هاوەڵانی ئەحمەدیش زۆر ڕاجیاییان هەبووە لە نووسینی ڕاو بۆچوونەکانی، کەم پرسی فیقهی هەن کە حەنبەلییەکان زیاد لە ڕایەکیان دراوەتە پاڵ ئەحمەد. لە زۆربەی پرسەکاندا ئەحمەد دوو یان سێ بۆچوونی هەیە، لەوانەیە لەهەندێك پرسیشیدا بۆچوونەکانی ئەحمەد بگەنە پێنج و شەش و حەوت ڕاو بۆچوون، ئەم شڵەژانە مەزنە لە نێو حەنبەلییەکاندا لە بارەی زانینی ڕای ئەحمەد بە وردی، یەکێکە لە گەورەترین ئەو هۆکارانەی وایکردووە پێشینان واز لە (فیقهی ئەحمەد) بهێنن.

هەر بۆیە کاتێك پرسیار لە تەبەڕی کرا لەبارەی واز هێنانی لە بۆچوونەکانی ئەحمەد – هەر چەندە لە ڕووی کاتەوە لێی نزیك بوو – وەڵامی دایەوە بەوەی: (هیچ هاوەڵێکی وای ئەوم بەدی نەکرد، کە پشتی پێببەسترێت). ئەمە لە بواری فیقهدا، پێشتر لە دەروازەیەکی پێشووتردا توێژینەوە لە ڕایەکانی کراوە لە بیروباوەڕدا.

خودی ئیبن تەیمییە خاڵی ڕاجیایی و ناکۆکییە لە ناو حەنبەلییەکاندا، لە هەڵسەنگاندنی وردبینیەکەی لە گواستنەوەی مەزهەبی حەنبەلی –سەرباری ئەوەی

...تۆ فیقهەی ئیبن تەیمیەیان وەرگرتووە کە تیایدا ڕای جیاوازە لە ڕای ئەحمەد —، چەند شتێکی گرنگیان لە فیقهی ئیبن تەیمیە وەرگرتووە، کە دەڵێ: نوێژی بەکۆمەڵ ...رجێکە لە مەرجەکانی نوێژ بەرپاکردن[1]، دەبێ ئەو نوێژکەرە بکوژرێ کە نیەتی ...وێژ بە دەنگ دەهێنێ[2]، پرسی تەڵاقدان[3]، جگەلەمانەش. ئیبن تەیمیە چەند

---

...شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم موفتی پێشووتر، ئەم بۆچوونەی ئیبن تەیمییەی وەرگرتووە، هەروەك ...ێندەدا دەخرێتەڕوو. لە لقەکانی بۆچوونەکەی ئەوەیە کە نوێژی بە کۆمەڵ بە یەکدەنگی پێویست و ...جبە! لەکاتێکدا نوێژی بە کۆمەڵ لای زۆربەی زانایان سوننەتە! تەنانەت ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بە ...ونەتی دەزانێ، لەو گێڕانەوە دروستەی لەوەوە هاتووە... وتنی ئەوەی نوێژی بەکۆمەڵ پێویست و واجبە — سەرباری ئەوەی بە مەرجیان داناوە — زانایانی شانشینەکە لە ئیبن تەیمییەیان وەرگرتووە، نەوەك لە ...حەمەدی کوڕی حەنبەلەوە.

- موفتی پێشووتر محەممەد ئیبراهیم دەستی بەم بۆچوونەوە گرت، هەروەك دەخرێتەڕوو، ئەمەیان ...تۆیەکە هیچ پەیوەندییەکی نییە بە ئەحمەدەوە و مەزهەبی حەنبەلیەوە، بەڵکو یەکێکە لە فەتواکانی ...ن تەیمییەوە، کە دەڵێت: ((بەدەنگ دەربڕینی نیەت لەلای هیچ یەکێك لە زانایانی موسڵمانان ڕەوا و ...ووست نییە، پێغەمبەری خوا درود و سڵاوی خوای لێبێ و هیچ یەکێك لە جێنشینەکان و هاوەڵان و ...ێنیان و پێشەوایانی ئوممەت نییەتیان بە دەنگ نەوتوە، هەر کەسێکیش بانگەشەی ئەوە بکات کە نیەت ...دەنگ وتن بەشێکە لە ئاینی خوا، ئەوا پێویستە شەریعەتی بۆ پێناسە بکرێتەوە، تۆبەی پێبکرێ لە ...تنی ئەم کارەی، ئەگەر سوریش بوو لەسەر ئەمە ئەوا دەبێ بکوژرێ)). (كتب ورسائل وفتاوى شيخ الإسلام ...ن تيمية، نشر مكتبة ابن تيمية، الطبعة الثانية، تحقيق عبدالرحمن بن محمد بن قاسم العاصمي النجدي، — ٢٣).

- تەڵاقی سێ بە سێ هەر بەیەك تەڵاق دەکەوێ، ئیبن باز ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووە، لە کاتێکدا ...مە نە بۆچوونی ئەحمەد، نە هی هیچ یەکێك لە چوار پێشەواکە، بەڵکو فەتوایەکی ئیبن تەیمییەیە، ...ۆنەیە ئیبن تەیمیە لەم بۆچوونەدا ڕاستتر پێکابێتی، بەڵام لێرەدا پرسەکە بریتی نییە لە پەسەند ...کردنی ئەوەی ڕاستە، بەڵکو مەبەست ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە (زانایانی شانشینەکە) زۆرێك لەو ...تۆیانەی ئیبن تەیمییەیان وەرگرتووە کە تیایدا ڕای لەگەڵ ئەحمەد جیاوازە. زۆرتر لاسایی و شوێن پێی ...ن تەیمییە هەڵدەگرن لە فقیە و بیروباوەڕدا، بەتایبەت پاشینەکانیان زۆر لاساییکەرەوەی ئەون. ئیبن ... بەهۆی فەتوادانی بە پەسەندکردنی ئەم بۆچوونەوە تووشی سەرزەنشت و سەرکۆنەکردن بووەوە ...لایەن موفتی پێشووتر (محەممەدی کوڕی ئیبراهیم).

کۆشش و بۆچوونێکی تایبەتی هەن کە پێشەوا ئەحمەد لەسەر نەبووە، هەندێکیان چوار پێشەواکەش لەسەری نین، ئێرە ئەوەندە فراوان نییە بۆ باسکردنی ڕاجیاییە فیقهییەکانی نێوان ئیبن تەیمییە و ئەحمەدا. ئیبن تەیمییە مافی ئەوەی هەیە ڕای پێچەوانەی ئەحمەد بێت، هەروەك هاوڵاتیانی پەیڕەوکارانی مەزهەبەکانی تریش بۆیان هەیە لەسەر مەزهەبێکی پێچەوانەی مەزهەبی ئەحمەد و مەزهەب ئیبنتەیمییە بن.

کەواتە دەکرێ بسەلمێنرێ و ئەوەیان لەسەر جێبەجێ ببێ (کە شەرعناسان لە مەزهەبی حەنبەلیدا)لەوانەشە جێبەجێ نەبێ.

## دووەم: زانایانی شارەزا لە ( بیروباوەڕدا ) ڕەخنە لێگرتنی:

سەبارەت بە بیروباوەڕ، کە بەهەمان شێوە وشەیەکی گشتی و مەزن و ڕەهای فراوانە، بۆ زانیاری زانایانی شانشینەکە لە فەتواکانیاندا ڕۆیشتوونەتە سەر وەڵامدانەوەی زۆر پرسی پەیوەست بە ئایین و مەزهەب و فەیلەسوف و ڕەوتە هزرییەکان، حوکمی گشتیان زیاتر لەم بارەوە دەردەکرد کە خەسڵەتی تێکەڵ و پێکەڵ کردن و نەبوونی زانیاری تەواو تێیدا چڕ بووەوە..

تەنانەت ئەگەر بیروباوەڕی ئەوانەی ناموسڵمانن هەڵاوێرین و جیا بکەینەوە، ڕەوتەکان و مەزهەبە ماددەگەرا و فەلسەفی و زانستییەکان جیا بکەینەوە... لێرەدا بڵێین: دروستە شت لەو کەسانە وەربگرن کە ئەم زانستانەیان خوێندووە و شارەزان تیایاندا، ئەگەر ملکەچی ئەمە بین، ئەوا بیروباوەڕ و مەزهەبە هزرییەکانی موسڵمانان دەمێننەوە...

ئایا زانایانی شانشینه‌که زانای شاره‌زان له بیروباوه‌ڕی موسڵماناندا؟!... تا فه‌توا بۆ خه‌ڵك بده‌ن له‌باره‌ی ئه‌و فه‌توا و ڕا و بۆچوونانه‌ی ئه‌وان له‌سه‌رینه نزیکتره له قورئان و سوننه‌ته‌وه؟!

ده‌ی با بڕوانینه ئه‌م کۆت و به‌نده‌ی خواره‌وه:

## کۆت و به‌ندی چواره‌م : زانایانی شاره‌زا له ( بیروباوه‌ڕی موسڵمانان ) ڕه‌خنه‌لێگرتنی:

موسڵمانان، وشه‌یه‌کی گشتییه، هه‌موو ئه‌و که‌سانه ده‌گرێته‌وه که په‌یڕه‌وی ڕووگه و قیبله‌ن، بیروباوه‌ڕی موسڵمانان گه‌لێك زۆرن له نێوان په‌یڕه‌وانی سوننه (ئه‌هلی سوننه) و موعته‌زیله و ئیمامییه‌کان و زه‌یدی و مورجیئه و جه‌هه‌می و ئیبازی و خه‌واریج و قه‌ده‌ری و ناسیبه‌کان... تاد. ئه‌مانه بیروباوه‌ڕی موسڵمانانن، گه‌لێك زۆرن و (زانایانی شانشینه‌که) بانگه‌شه‌ی ئه‌وه‌یان نه‌کردووه ته‌واو ده‌وریان داوه و خوێندوویانه‌ته‌وه له سه‌رچاوه‌کانیان. ئا ئه‌مه ژیاننامه‌کانیانه ته‌نها باسی ئه‌وه‌ی تیایاندا کراوه که شاره‌زان ته‌نها له بیروباوه‌ڕی مه‌زهه‌بیدا (مه‌زهه‌بی وه‌هابیه‌ت یان ئیبن ته‌یمییه یاخود حه‌نبه‌لیدا).

ئه‌گه‌ر بانگه‌شه‌ی ئه‌وه‌ش بکه‌ن، که ئه‌وان ته‌واو شاره‌زان له به‌ڵگه‌ی مه‌زهه‌به‌کانی موسڵمانان و کتێب و بیروباوه‌ڕه‌کانیان له خودی سه‌رچاوه‌کانیان، ئه‌وا هیچ توێژه‌رێکی به‌ویژدان بڕوایان پێ ناکات، به‌ڵکو ڕاسته‌که ئه‌وه‌یه که بیروباوه‌ڕی مه‌زهه‌به‌کانی تر ده‌خوێننه‌وه – به شێواندنه‌وه – له کتێبه‌کانی ڕێباز و مه‌زهه‌به‌کان و ڕه‌تدانه‌وه‌یان که (ئه‌هلی سوننه) له سه‌له‌فی و ئه‌شعه‌ری و زاهیرییه‌کان نووسیویانه. ناکۆکی و دژایه‌تی له نێوان ئه‌م مه‌زهه‌بانه‌دا بوونی هه‌یه، که‌سی دوژمنیش ئه‌وه‌ی لێ چاوه‌ڕوان ده‌کرێ که شتی بچوك گه‌وره یان شتی گه‌وره

بچوك بكات، یاخود زیاد بەسەر شتەكانەوە بنێت یان گشتاندنیان بۆ بكات یاخود وردبینی نەكات یان لەوانەیە بگاتە ئاستی شت هەڵبستن.

كەواتە شتەكە پێویستی بە كۆت و بەندی پێنجەم... شەشەم... حەوتەمە.... تاد.

## كۆت و بەندی پێنجەم : زانای شارەزا لە ( بیروباوەڕی ئـەهلی سـوننەدا ) ڕەخنـە لێگرتنی:

بەهەمان شێوە گوزارشتی ((ئـەهلی سوننە)): سـەلەفی و ئەشـعەرییەكان و سـۆفی میانڕەو و زاهیرییەكان دەگرێتەوە. زانایانی شانشینەكە بانگەشـەی ئـەوە ناكـەن كـە كتێبەكانی مەزهەبە ناوبراوەكانیان خوێندۆتـەوە، جگەلـە كتێبـەكانی سـەلەفییەكان نەبێ. مەگەر ئەوەی پێشتر خوێندنەوەی بۆ بیروباوەڕی مەزهەبەكانی تـر هـەبێ لـە ڕێـی ئـەو كتێبانـەی دژی ئـەو مەزهەبانـە، هـەر چـەندە ئـەو كتێبانـە هەڵسـابن بـە شـێواندن و زیـاد پێوەنـان و گشـتاندن و دزێـو نیشـاندان و تەنانـەت هەنـدێك جـار هەڵبەستنی شت بۆ بیروباوەڕی ئەم مەزهەبانە.

بەهەر حاڵ: دوو مەزهەب بەسەر (نازناوی ئەهلی سوننەدا) زاڵ بوون:

بەپاكگرەكان (ئەشعەرییەكان و ماتوریدییەكان)، لە زاناكانیان: نـەوەوی و ئـیبن حەجەر...

چەسپێنەرەکان (حەنبەلی و کەڕامییەکان)[1]: لە زاناکانیان: دارمی و ئەبو یەعلا و ئیبن تەیمییە...

نازناوی ئەشعەرییەکان زیاتر بەسەر (بەپاکگرەکان)دا زاڵ بوو، هەروەك نازناوی (حەنبەلییەکان) بەسەر چەسپێنەرەکاندا زاڵبوو.

هەر بۆیە تەنها باسی نازناوی ئەشعەرییەکان لە (بەپاکگرەکان)، حەنبەلییەکان لە (چەسپێنەرەکان) دەکەم.

ئەشعەرییەکان بەسەر نازناوی (ئەهلی سوننەدا) زاڵ بوون لە دوای سەدەی چوارەم، ئەمەش لە دەرەوەی شانشینی عەرەبی سعودی. ئەگەر لە شام یان میسر یاخود مەغریب وترا (سوننی)، ئەوا بە مانا تایبەتەکەی لای ئەوان واتە: (ئەشعەریە).

هەروەك حەنبەلییەکان زاڵبوون بەسەر ئەم نازناوە لە ناو شانشینەکەدا و لە هەندێك نووسینی حەنبەلییەکاندا لە سەدەی هەشتەمدا، هەروەك لە: نووسینەکانی

---

(1) بەپاکگرەکان: دراوەتە پاڵ ئەوانەی خوا بەپاك دەگرن لە سیفەتی بەدیهێنراوان، سیفەتەکان لێکدانەوە (تأویل)ی بۆ دەکەن، یان گێڕانەوەکان یان فەرموودەکانی سیفەتەکان بەلاواز دادەنێن... ئەشعەرییەکان: دراونەتە پاڵ ئەبو حەسەنی ئەشعەری، ئەشعەرییەکان زۆربەیان لە بەپاکگرەکانن. ماتوریدییەکان: دراونەتە پاڵ ئەبو حەسەنی ماتوریدی، کەمینەن، چەسپێنەرەکان: بۆیە ئەم ناوەیان لێنراوە، چونکە ئەو سیفەتانە دەچەسپێنن، کە پێیان وایە سیفەتی خوان، وەك: دوو دەست و چاوەکان، ڕووخسار و قاچ و لاق و باڵ و سینە و دانیشتن و نیشتنەوە و بەرزی و جوڵە، چونکە پێیان وایە ئەم سیفەتانە دەقیان لەسەر هاتووە، لەکاتێکدا بەپاکگرەکان پێیان وایە دروست نییە ئەم جۆرە سیفەتانە بدرێنە پاڵ خوا، چونکە چواندنیەتی بە بەدیهێنراوان، ئەو دەقانەی کە بە گێڕانەوەیەکی دروستی ئەم سیفەتانەیان تیادا هاتووە لە شێوەی (دەست) ئەوا بە مانای (توانا) یان بەخشندەیی دێت بەپێی چوارچێوە قورئانیەکە، ئەوەش کە بە گێڕانەوەیەکی دروست نەهاتوون، کە زۆربەی ڕێژەکە پێکدێنن: وەك: سینە، باڵەکان و دانیشتن و جوڵە و جێگۆڕکێ و گەنجی بێ موو و وێنەی ئادەم، ئەوا دەبێ نکۆڵی لێبکرێ و خوای مەزن لەم شتانە بەپاك بگیرێ.

ئیبن تەیمییە و ئیبن قەییمدا وا هاتووە. ئەگەر لە ناو شانشینی عەرەبی سعودی وترا (سوننی)، ئەوا لە مانای تایبەتدا بە (حەنبەلی) دێت.

کەواتە بەشی زۆری ئەهلی سوننە (کە ئەشعەرییەکانن)، پێیان وایە ئەوان ئەهلی سوننەی ڕاستەقینەن و شوێنکەوتووی (پێشینە چاکەکانن)، حەنبەلییەکانیش لە چوارچێوەی ئەوانەدا هەژمار دەکەن (کە خوا بە بەدیهێنراوان دەچوێنن و جەستەی بۆ بڕیار دەدەن).

ئەشعەرییەکان: نازناوێکی بیروباوەڕی شوێنکەوتووانی سێ مەزهەبی فیقهییە (شافیعییەکان و مالیکییەکان و حەنەفییەکان) بەگشتی.

ئەمڕۆ ئەشعەرییەکان بە (ئەهلی سوننە) ناودەبرێن، زۆر بەشێوەیەکی کەم نازناوی (ئەشعەرییەکان) بەکاردەهێنن.

سەبارەت بە بەشی کەمینەی ئەهلی سوننە (کە حەنبەلییەکانن)، پێیان وایە ئەوان ئەهلی سوننەن، شوێنکەوتووانی پێشینە چاکەکانن، ئەشعەرییەکان لە ڕیزی (جەهەمییەکان و سیفەت پەکخەرەکان) هەژمار دەکەن.

حەنبەلییەکان نازناوێکی بیروباوەڕی و فیقهیی (شوێنکەوتووانی مەزهەبی حەنبەلییە) بەگشتی.

ئەمڕۆ حەنبەلییەکان بە (سەلەفیەکان) ناودەبرێن، نازناوە کۆنەکە (کە حەنبەلییەکانن)[1] فەرامۆشیان کردووە، لەگەڵ ئەوەی نازناوی (ئەهلی سوننە)یان

---

(١) سەرهەڵدانی مەزهەبی حەنبەلی، بریتییە لە سەرهەڵدانێکی تەواو بیروباوەڕ و عەقیدەیی، هەروەها نازناو دانان بۆ شوێنکەوتووانی لە ڕابردوودا نە بە ناوی (سەلەفییەت) و نە بە (ئەهلی سوننە) بووە، بەڵکو بە (حەنبەلییەکان) ناوزەد دەکران. ئەم نازناوەش وردترە، لە سەردەمی تەبەڕیدا (٣١٠ك مردووە) بەکارهاتووە، مێژوونووسە حەنبەلییەکان و جگەلەوانیش بەکاریان هێناوە، وەك خەتیبی بەغدادی (سەرەتا حەنبەلی بوو، دواتر بووە شافیعی) لە کتێبەکەیدا (تاریخ بغداد)، ناوبراو ئەم کتێبەی لە ڕۆژانەدا

کەم بەکارهێناوە، لەبەر زاڵبوونی ئەشعەرییەکان بەسەر ئەم نازناوەدا بەتایبەت لە دەرەوەی شانشینەکەدا.

ئەگەر سەیری ناو شانشینەکە بکەین، دەبینین مەزهەبگەراکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە (شوێنکەوتووی پێشنە چاکەکانن) و دەدرێنە پاڵ سوننە، کە حەنبەلی و ئەشعەرییەکانن.

لە ناو شانشینەکە حەنبەلییەکان زاڵبوونە بەسەر نازناوی (سوننە)، تەنانەت لەوانەیە لە ناوە و دەرەوەی شانشینەکەشدا زاڵ بىن بەسەریدا، بەتایبەت لەگەڵ پاڵپشتی دەوڵەتی سعودیە بە لە چاپدانی کتێبەکانی ئیبن تەیمییە و دارمی و محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب، دابەشکردنی ئەم کتێبانەبەسەر ژمارەیەکی زۆر لە ناوەند و قوتابخانە و زانکۆکان.

ئایا – دوای زاڵبوونی ئەشعەرییەکان بەسەر نازناوی ئەهلی سوننەدا بەتایبەت لە دەرەوەی شانشینەکە – زانایانی ناو شانشینەکە تەنها شارەزان لە بیروباوەڕی سەلەفیەتدا؟!

---

نووسی کە حەنبەلی بوو، هەروەك ئیبن جەوزی حەنبەلی لە کتێبەکەیدا (المنتظم)، ئیبن ئەسیری مێژوونووس لە کتێبەکەیدا (الکامل فی التاریخ) بەکاریانهێناوە، زەهەبیش (کە لە بنەماکانی ئایندا حەنبەلی و لە لقەکانی ئاینیشدا شافیعی بوو) لە کتێبەکەیدا (تاریخ الاسلام)، ئیبن کەسیر (کە لە بنەماکانی ئایندا حەنبەلی بوو) لە کتێبەکەیدا (البدایة والنهایة) بەکاریان هێناوە، تەنانەت دەبینین هەندێك جار ئیبن تەیمییەش ئەم نازناوە بیروباوەڕییە لە (مجموع الفتاوی)دا بەکاردەهێنێ، جا حەنبەلییەکان لە بەرامبەر ئەشعەرییەکان دادەنێ، نازناوی کۆن و هەر بەناوبانگی بیروباوەڕی سەلەفییەت بریتییە لە (حەنبەلییەت و حەنبەلییەکان) نەوەك (سەلەفییەکان).

## کۆت و بەندی شەشەم : زانایانی شارەزا لە ( بیروباوەڕی سەلەفییەت )دا و ڕەخنەلێگرتنی :

پێویستە بێزار نەبین، ئەگەر ویستمان وردبینی لە پرسێکی زانستیدا بکەین، سەلەفییەت نازناوێکی گشتییە، ئەگەر وردتر بێ لە نازناوی (ئەهلی سوننە). ئەگەر چی ئەشعەرییەکان و حەنبەلییەکان بانگەشەی ئەم نازناوی (سەلەفییەت) بکەن، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا حەنبەلییەکان بەسەریدا زاڵبووینە، کاتێك گوێبیستی سەلەفیەتی جیهادی یان سەلەفیەتی بانگخواز و شەڕکەر دەبین، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ئەوان دەرەنجامی کتێبەکانی ئیبن تەیمییە و وەهابیەتن، نەوەك کتێبەکانی ئیبن حەجەر و نەوەوی.

بەڵام ناوەڕۆکی بەڵگەی (پێشینە چاکەکان) لەلایەن مەزهەبەکانی تر دانپێدانراو نییە، کە نادرێنە پاڵ ئەم نازناوە، بەڵگەی سەلەفییەکان ئەوەیە کە ئەوان: (شوێنکەوتووی پێشینە چاکەکانن) و لەسەر (ڕێبازی پێشینە چاکەکانن) لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان لەو سەدانەی ناوی دەنێ بە (سەدە چاکەکان).

ئەم بەڵگە خاڵی بەیەکگەیشتنی بانگەشەی گشت مەزهەبەکانە، چ ئەوانەی بە سەلەف ناودەبرێن و چ ئەوانەی نادرێنە پاڵ ئەم نازناوە، ڕاڤەی ئەم گوزارشتە و ناوەڕۆکەکەی جێگای ناکۆکیە، ناکۆکی لە نازناوەکەدا نییە، ئەم ناکۆکییە لە ڕاڤە یان ناوەڕۆکی بانگەشەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك:

یەکەم: مەزهەبەکانی تریش بەهەمان شێوە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێشینەکان بریتین لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان.

هەر توێژەرێك كتێبەكانی موعتەزیلەكان بخوێنێتەوە، ئەوا دەبینێ كە ناوی زۆرێك لە هاوەڵان دێنن لە ناو (پێشینە چاكەكانیاندا، وەك: جێنشینە سەرڕاستەكان و ئیبن عومەر و ئیبن عەبباس و ئیبن مەسعود...، لە شوێنكەوتووانیش: حەسەن و قەتادە و ئیبن سیرین... تاد).

زانایانی شانشینەكە داندەنێن بەوەی گشت ئەم هاوەڵ و شوێنكەوتووانە لە ((پێشینە چاكەكانن))، بەڵام ئەوە بەڕاست دانانێن كە پێشینەی موعتەزیلەكان بن یان بیروباوەڕی موعتەزیلایەتی هەبێ. هەروەك موعتەزیلەكان پێیان وانییە ناوبراوان سەلەفیین یان بیروباوەڕەكانیان وەك بیروباوەڕی سەلەفییە هاوچەرخەكانە.

بەهەمان شێوە شیعە دەڵێن: ئەوان شوێنكەوتووی ئالوبەیتن لە هاوەڵان و شوێنكەوتووان، وەك: پێشەوا عەلی، حەسەن، حوسەین، ئەمانە لە هاوەڵانن، هەروەها شوێنكەوتووی شوێنكەوتووانیان لە شوێنكەوتووان و پێشینە چاكەكان.

زانایانی شانشینەكە داندەنێن بەوەی پێشەوا عەلی و عەممار و حەسەن و حوسەین و باقر و سادق لە (پێشینە چاكەكانن)، ناكۆكیان لەگەڵ شیعەدا هەیە لە چەسپانی بیروباوەڕی شیعە لەلایەن ئەوانەوە.

هەمان شت لەلای خەواریجەكانیش هەیە، ناوی پێشینە چاكەكانیان دەهێنن لە هاوەڵان و شوێنكەوتووان، وەك: (زولخوەیسڕە، ئیبن عەبباس، عەبدوڵای كوڕی وەهەبی ڕاسبی)، ئینجا لە شوێنكەوتووان ناوی (جابری كوڕی یەزید، عەبدوڵای كوڕی ئیباز، عیكرەمە، نەجدە، نافیعی كوڕی ئەزرەق) دێنن. ئەوانە لای خەواریجەكان بریتین لە پێشینانی خەواریج، زانایانی شانشینەكەناكۆكیان لەگەڵ خەواریجەكاندا نییە لەوەی زۆربەی ناوبراوان لە پێشینە چاكەكانن، وەك: (ئیبن عەبباس، جابری كوڕی زەید...)، بەڵام (زولخوەیسڕە) لای ئەوان یەكێكە لەوانەی گۆڕاوە و

پاشگەزبووەتەوە. ناكۆكیان لەسەر ئەوەش نییە كە عیكرەمە و عەبدوڵای كوڕی ئیباز لە شوێنكەوتوانن، بەڵام هەڵەیان لە بواری بیروباوەڕدا هەیە... ئا بەم شێوەیە.

ئەم پرسە بۆ زانستی گێڕانەوە (ڕوایە) دەگەڕێتەوە: واتە هەر تاقم و كۆمەڵێك چەند گێڕانەوەیەك دەگێڕێتەوە و پەسەندی دەكات و زنجیرەی كەسە گێڕەڕەوەكانی بە تەواو و متمانەدار دادەنێت، لە هەمان كاتدا گێڕانەوە و كەسە گێڕەڕەوەكانی مەزهەبەكانی تر ڕەتدەكاتەوە.

لەبەر ئەوەی ئەو دەوڵەتانەی پێشتر هەبوون (ئەمەوی و عەبباسی، ئینجا عوسمانیەكان) لە زۆربەی جاراندا دەدرانە پاڵ (سوننە) مەگەر لە چەند كاتێكی تایبەت و سنووورداردا نەبێ. ئەمە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی پەیڕەوان و ئەهلی سوننە لە ئەشعەرییەكان و حەنبەلییەكان، كەم بوونەوەی مەزهەبەكانی تر، فەرامۆشكرانی كەلەپورەكەیان، تەنانەت داننەنان بەبوونی لە هەندێك جاردا. بەڵام لەگەڵ دەركەوتنی وڵاتانی هەرێمی لە سەردەمی هاوچەرخدا، ئەوا (ئەهلی سوننە لە حەنبەلییەكان و ئەشعەرییەكان) بۆیان دەركەوت كە هەندێك دەوڵەتی تەواو هەن، نادرێنە پاڵ سوننە، وەك: ئیمامییەكان لە ئێران، زەیدییەكان لە یەمەن، ئیبازییەكان لە عوممان. بەمەش ئەهلی سوننە لە نێو دووریاندا مایەوە، یەكێكیان بریتی بوو لە بەڕاستدانانی ئەوەی پێشینانیان نووسیبوویان لە بارەی ئەم تاقم و مەزهەبانە، ئەوی تریان شوێنی ئەو نووسینە شێوێنراوانە كەوتن كە لەوانەوە جێماون. هەمان حاڵ لەلای ئەو مەزهەبانە هەیە، كە لە ناخی شوێنكەوتووانیاندا یادگاری چەوسانەوەیان ماوە لەلای دەوڵەتە سوننیەكان، لە هەمان كاتدا (فەتوای سوننی) پشتی ئەم چەوساندنەوەی ئەوانی دەگرت و هانی دەسەڵاتەكانی دەدا بۆ ئەم كارە. ئەمەش وێنەیەكی شێوێنراو و گشتێندراو لەبارەی (ئەهلی سوننەوە) بەجێدێڵێت.

## لەبارەی پرسی زانایانی شانشینەکە

ئەگەر زانایانی شانشینەکە بیانتوانیبا مەزهەبەکانی تر ڕازی بکەن بەوەی لە ناو هاوەڵان و شوێنکەوتوواندا موعتەزیلە و شیعە و خەواریج بوونیان نەبووە — هەر چەندە سەلماندنی ئەمە سەختە[1]—، ئەوا سەختیەکی زۆرتر دەبینین لە چەسپاندنی ئەوەی هاوەڵان و شوێنکەوتووان خاوەنی بیروباوەڕی سەلەفیەتن وەك ئەو بیروباوەڕە سەلەفییە هاوچەرخە بڵاوانەی هەن لە کتێبەکانی سەلەفییەکاندا، جا چ لە پرسی سیفەتەکان یان بەدیهێنراوی قورئان یاخود پرسی هەڵاواردن لە ئیمان یان پلەبەندی نێوان هاوەڵان یاخود تەبەڕوك... تاد. زۆربەی ئەو شتانەی کە زانا سەلەفییە هاوچەرخەکانی شانشینەکە زیادەڕەوی تێدا دەکەن و بەهۆیەوە موسڵمانان کافر و گومڕا دەکەن، ئەوا بریتین لە پرسی مەزهەبی پەیدابوو، کە لەگەڵ سەرهەڵدانی مەزهەبەکان پەیدابوونە، هاوەڵان و شوێنکەوتووان تیایاندا ناکۆك بوون.

کەواتە ئەوە ماوەتەوە بڵێین: ئایا زانایانی شانشینەکە حەنبەلین؟!

(١) بەتایبەت لە شیعە و خەوارجەکان، لە ناو هاوەڵە تایبەت و پایەدارەکانی عەلیدا زۆر هاوەڵ و شوێنکەوتوو هەبوون، لە ناو خەوارجەکانیشدا کەمێك لە هاوەڵان و زۆرێك لە شوێنکەوتووان هەبوون، زۆرێك لە شوێنکەوتووان لە ناو موعتەزیلەکاندا بوون، بەڵام شیعە میانڕەوەکان، نەوەك وەك وردەکارییەکانی ئیمامییە پاشینەکان لە: پارێزراوی و مەهدیبوون و کافرکردنی هەندێك هاوەڵی مەزن... تاد، سەبارەت بە خەواریج و موعتەزیلەکان ئەوا بنەما و ڕەگ و ڕیشەی مەزهەبەکانیان لە سەدەکانی یەکەم و دووەمدا دروست بوون، هاوەڵان و شوێنکەوتووانیشیان تێدابوون، هەروەك هیچ هاوەڵێك نابینین بەشێوەیەکی ورد قسە بکات لەبارەی بەدیهێنراوی (خەلق)ی قورئان و سیفەتەکان وەك چۆن کتێبە سەلەفییەکان چەسپاندوویانە...

## کۆت و بەندی حەوتەم : زانایانی شارەزا تەنها لە (بیروباوەڕی حەنبەلی) دا

ئەم کۆت و بەندە پێویست و زانستی تربوو لە کۆت و بەندەکانی پێشووتر، ئەم کۆت و بەندانە کاتێك سوود و کەڵکیان گەڵاڵە دەبێ، کە دەبینین یەکێکە لە گەورەترین هۆکارەکانی یەکێتی و بەهێزترین پاڵنەرەکانی خۆبەکەمزانی و هێمنی و زانستی بوون.

پێشتر خرایەڕوو کە نازناوی (ئەهلی سوننە) ئەشعەرییەکان و حەنبەلییەکان بەسەریدا زاڵبوونە. زانایانی شانشینەکەش نکوڵی لێ ناکەن، هەروەك نازناوی سەلەفییەت جێگای ناکۆکییە لە ڕاڤەکردندا نەوەك لە ناودا.

زانایانی شانشینەکە بانگەشەی ئەوە ناکەن ئەوان لە بیروباوەڕدا ئەشعەرین، بەڵکو سەرزەنشتی ئەشعەرییێتی دەکەن، بە بیدعەچی دایاندەنێن، لە تاقمە تیاچووەکانی ڕۆژی دوایی هەژماریان دەکەن، ناشتوانن ئەوە بسەلمێنن ئەم وردەکارییانە پێشینانیش لە هاوەڵان و گەورە شوێنکەوتووان بڕوایان پێ هەبووە، کەواتە تەنها ئەوە ماوەتەوە کە ئەوان حەنبەلی بن... لێرەدا ناکۆکی دروست دەبێ... دژەکانیان کەبەشێکی ترن لە ئەهلی سوننە دانیان بەوەدا ناوە... دەتوان ئەو شتانە بدەنە پاڵ ئیبن حەنبەل کە نەیانتوانیوە بیدەنە پاڵ پێشینان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان.

کەواتە لە بنەڕەتدا حەنبەلین، هەر چەندە دراونەتە پاڵ چەند نازناوێك، کە ناکۆکیان لەسەرە وەك: ئەهلی سسوننە و سەلەفییەت.

بەڵام ئێمە دەبینین ئەوان حەنبەلی نین، تەنها لە لایەنی فیقهیەوە نەبێ!

لە ڕووی بیروباوەڕەوە ئەوا بە نازناوی زۆر فراوانتر ناودەبرێن، وەك: (ئەهلی سوننە و سەلەفییەکان)، لەوانەیە بۆ ئەوە بێ کە بسەلمێنن ئەوان (ئەهلی سوننەن) و جگەلەوانیش (بیدعەچین) ئەگەر بدرێنە پاڵ (سوننە)ش... هەر (ئەوان شوێنکەوتوانی پێشینە چاکەکانن لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان)، ئەگەرچی جگەلەوانیش بدرێنە پاڵ پێشینە چاکەکان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان...

لەبەر ئەوەی ئەوان پێیان وایە پێشەوا ئەحمەد پێشەوای ئەهلی سوننەیە... بیروباوەڕ و قوتابخانەکەی سوننی سەلەفین، ئەوا ئەوانیش (حەنبەلین) لە بیروباوەڕدا.. مادەم حەنبەلیەکان سوننە و سەلەفین... ئەوا کێشە نییە لەوەی لە ڕووی بیروباوەڕ و فیقهیەوە بدرێنە پاڵ ئەحمەد... بەهۆی کەمی ئەوانەی ناکۆکیان لەگەڵ دەکەن لەسەر ئەم نازناوە، زۆری ئەوانەی ناکۆکیان لەگەڵ دەکەن لەسەر نازناوی تری گشتی.

ئایا ئەوان لە بیروباوەڕدا حەنبەلین؟

ئایا حەنبەلییەکان لە بیروباوەڕدا تەنها یەك یان چەند مەزهەبێکە؟

پرسیارێك تەنها کەسێك دەیزانێ کە کاروانی حەنبەلیێتی بە وردی خوێندبێتەوە.

ئەو کاتە دەزانێ حەنبەلییەکان چەندین مەزهەب و ڕەوتیان هەیە.

جا قوتابخانەی حەنبەلی، کە زانایانی شانشینەکە دەدرێنە پاڵی لە کام لەم ڕەوتانەوە هاتووە؟

دەدرێنە پاڵ قوتابخانەی ئیبن تەیمە... کەواتە ئەو کۆت و بەندەی پێویستە زیاد بکرێت، ئەوا دەبێ بەم شێوەیەی خوارەوە بێ:

## کۆت و بەندی هەشتەم : زانایانی شارەزا تەنها لە ( بیروباوەڕی حەنبەلی تەیمییەدا )

لەبەر ئەمە ئەوەمان وت، چونکە دوو تاقم لە بارەی (بیروباوەڕی حەنبەلی) ناکۆکیان تێکەوت، لە فیقهدا کۆك و لە بیروباوەڕدا ڕاجیا بوون.

ئینجا تاقمی سێیەم (کە تاقمی ئیبن تەیمییەیە)، ئەم تاقمە ڕاجیا بوو لەگەڵ هەر دوو تاقمەکەی تر لە شتێکدا کە بە (کرۆکی بیروباوەڕ) لای ئەو هەژمار دەکرێ، ئەویش ئەم پرسانە بوون: گۆڕ و پاشکۆکانی لە تەبەڕوك و تەوەسول و بەگەورەدانان و نوێژ لەلا کردنی... تاد. جا لەبەر ئەوەی پرسی (تەوەسول و پیاوچاکان و تەبەڕوك...) بریتین لە کرۆکی بیروباوەڕ لەلای ئیبن تەیمییە، ئەوا دەبێ ئەمە بەس بن بۆ ئەوەی (تەیمییە) ببێتە تاقمێکی سەربەخۆ، سەرباری ئەوە ئیبن تەیمییە هاوڕایە لەگەڵ حەنبەلییەکاندا لە زۆربەی پرسەکانی بیروباوەڕدا، وەك: سیفەتەکان، بینی خوا، هاوەڵان، قەدەر... تاد.

سەبارەت بەو دوو تاقمە کۆنە ناکۆکەی حەنبەلییەکان:

یەکەم: تاقمێکی حەنبەلین، زیاتر لە ئەشعەریەتەوە نزیکن، وەك: ئیبن جەوزی، کە بە یەکدەنگی لە ڕووی فیقهەوە حەنبەلیە، لە ڕووی بیروباوەڕیشەوە لە (بەپاکگرەکان: مونەزهەکان)ە، لەبەر ئەوەی لە ڕووی بیروباوەڕەوە لە بەپاکگرەکانە، ئەوا هەندێك لە حەنبەلییەکان نکۆڵیان کردووە لەوەی ئیبن جەوزی حەنبەلی بێ لە ڕووی بیروباوەڕەوە، ئەگەر دان بە حەنبەلی بوونیشیدا بنرێ لە فیقهدا، بە هەر حاڵ، ڕاجیایی هەیە لەسەر ئەوەی ئیبن جەوزی کەسێکی ئەشعەرییە و دەدرێتە پاڵ ئەحمەد یان کەسێکی حەنبەلییە دەدرێتە پاڵ ئەحمەد؟

ئیبن جەوزی دەدرێتە پاڵ ئەحمەد و لەبارەی خۆیەوە دەڵێت (حەنبەلییە)، شت لەبارەی (پلەوپایەی ئەحمەد) دەنووسێ، کتێب لە فیقهی حەنبەلیدا دادەنێ، هەروەها

دەشڵێت: ئەحمەد (وەك ئەو بەپاکگر بووە)، بە یەکدەنگی ئیبن جەوزی یەکێك بووە لەوانەی (خوایان بەپاکگرتووە و سیفەتەکانیان لێکداوەتەوە و تەئویل کردووە)، جا ئەم لێکدانەوەیە مەزهەبی ئەحمەد یان مەزهەبی ئەشعەری بێ.

هەر کەسێك کتێبی (دفع شبه التشبیه) خوێندبێتەوە، بە ڕوونی دەبینێ ئیبن جەوزی ڕێگەی لێکدانەوە (تأویل)ی لە بیروباوەڕدا گرتۆتەبەر. ئەم شێخە حەنبەلییە بە پاکگرە لە سەدەی شەشەمدا کاریگەرییەکی زۆری هەبووە، دواتر کەم کەمە تاوایەوە، تا ئەو کاتەی ئیبن تەیمییە بە تەواوی لە سەدەی هەشتەمدا بەسەریدا زاڵ بوو.

دووەم: ئەم تاقمەی دووەمی حەنبەلییەکان زیاتر لە کەڕامییەکانەوە نزیکن، وەك: حەنبەلییە پێشینەکان لە قوتابییەکانی ئەحمەد، وەك: عەبدوڵای کوڕی ئەحمەد و مەروزی و دارمی (وتراوە پێش ٣٠٠ك)، ئینجا قوتابییەکانی ناوبراوان هاووێنەی خەلاف و بەربەهاری (دوای ٣٠٠ك)، دواتر قوتابییەکانی ناوبراوان وەك: ئیبن بەتتە (پێش ٤٠٠ك)، ئیبجا قوتابییەکان ناوبراو وەك: ئیبن حامد (لە سەری ساڵی ٤٠٠ك)، دواتر قوتابییەکانی ناوبراو وەك: ئەبی یوعلا (٤٥٨ك)، ئەمانە زۆرینەی حەنبەلییە پێشین و کۆنەکانن. هەر کەسێك کتێبەکانیان لە بیروباوەڕدا بخوێنێتەوە دەبینێ ئەوان (وێکچوێنەر: مشبیهەن). ئەمە لە توێژینەوەکانی پێشوودا خرایەڕوو. ئیبن تەیمییە ئەم حەنبەلیەتەی دووەمی سەرخست تەنها لە پرسی گۆڕ و پاشکۆکانی نەبێ.

لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین کەڕامییەکان دەدرێنە پاڵ عەبدوڵای کوڕی کەڕامی سەجستانی (٢٥٥ك مردووە)، ناوبراو دونیابەکەمزان و خواپەرست و جەستە بڕیاردەر بۆ خوا و سۆفی و فەرمووده هەڵبەست بوو. ئەمە سیفەتی زۆربەی حەنبەلییە کۆنەکان بووە. بەتایبەت لە پرسی تەسەوف و زۆری فەرمووده و

شوێنه‌واره لاواز و بابه‌تییه‌کان. (ئیبن به‌تته‌) فه‌رمووده‌ی هه‌ڵده‌به‌ست،به‌هه‌مان شێوه حه‌نبه‌لییه‌کانی به‌غداد که‌مێك پێش سه‌ده‌ی چواره‌م هه‌ڵبه‌ستنی فه‌رمووده‌یان به دروست داناوه.

ئه‌مه‌یان له توێژینه‌وه‌یه‌کی پێشووی تایبه‌تدا ڕوونکراوه‌ته‌وه. ئه‌حمه‌د ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێ له‌سه‌ر ئه‌مه نه‌بووه. هه‌ر بۆیه ده‌بینین ئیبن جه‌وزی ئه‌م ڕه‌وته حه‌نبه‌لییه که‌ڕامییه تۆمه‌تبار ده‌کات به‌وه‌ی درۆ به‌ده‌می ئه‌حمه‌د ده‌که‌ن، به‌هه‌مان شێوه‌ی ئیبن عه‌ره‌بی مالیکی ئه‌نده‌لوسی له کتێبی (العواصم)دا تۆمه‌تباری کردوون، پێشتریش ئه‌م ڕه‌وته پێشه‌وا ته‌به‌ڕیان تۆمه‌تبار کردووه و چیرۆکێکی دوور و درێژیان له‌گه‌ڵ یه‌کدا هه‌یه. به‌ڵام ئه‌م ڕه‌وته زۆر زیاده‌ڕۆچوونی کردووه له (وێچواندن و زۆر هێنانه‌وه‌ی فه‌رمووده هه‌ڵبه‌ستراوه‌کان، بوێره له ته‌کفیر کردن و ئالوده‌بوون به ناسیبایه‌تی و گه‌وره‌گرتنی گۆڕ و پیاوچاکان)، ئیبن ته‌یمییه ئه‌م ڕه‌وته‌ی سه‌رخست و پشتیوانی لێکرد جگه‌له پرسی (گۆڕ)دا نه‌بێ.

شوێنه‌واره‌کانی ئه‌م ڕه‌وته تا ئه‌مڕۆش هه‌ر ماون له ناو قوتابخانه‌ی ئیبن ته‌یمییه‌دا، به‌تایبه‌ت ئه‌وه‌ی په‌یوه‌سته به (ته‌کفیر و وێکچوان و ناسیبایه‌تی و فه‌رمووده‌ی هه‌ڵبه‌ستراودا)، له‌گه‌ڵ دوورخستنه‌وه‌ی پرسی گۆڕ. سه‌بارەت به (فه‌رمووده هه‌ڵبه‌ستراوه‌کان) ئه‌وا ئه‌لبانی و قوتابخانه‌که‌ی له‌م کاتانه‌ی دوایدا به‌شداربوون له که‌م کردنه‌وه‌ی ئه‌م نه‌خۆشییه به‌ربڵاوه که زاڵه به‌سه‌ر دانراوه‌کانی حه‌نبه‌لییه کۆنه‌کان له بیروباوه‌ڕدا.

# حەنبەلیەتی ئیبن تەیمییە
# بەڵام ئایا چۆن دەرکەوت؟

دەڵێین ئەو دوو جۆرە حەنبەلییەتەی پێشوو، حەنبەلیەتی ئیبن جەوزی و حەنبەلیەتی کۆنەکان — هەر چەندە لە پرسی سیفەتەکانی خوادا ڕاجیان— ئەوا لە فیقهـ و تەسەوفدا کۆکن.

سەبارەت فیقهـ ئەوا لێرەدا جێی بایەخی ئێمە نییە، چونکە پێشتر قسەی لەسەر کراوە، کێشەی مەزنی تێدا نییە نە لەلای ئیبن تەیمییە و نە لەلای زانایانی شانشینەکە.

لە بابەتی سیفەتەکان خوادا، ئەوا ئیبن تەیمییە پشتیوانی بۆچوونی حەنبەلییە کۆنەکانی کردووە.

ئەو حەنبەلیەتی ئیبن جەوزیش کە مابووەوە ئەوا لەناوی برد.

دەربارەی تەسەوف و پرسی گۆڕ، ئەوا خاڵی جیاوازی بوو لە نێوان ئیبن تەیمییە و دوو مەزهەبە حەنبەلییەکەی پێشوو.

لێرەدا (تاقمی سێیەمی حەنبەلییەت سەریهەڵدا، ئەویش تاقمی تەیمییە) بوو.

ئەم نازناوە لەلای زۆرێك لە نووسەرانی بواری بیروباوەڕ ناسراوە.

کەواتە حەنبەلییەکانیش لە بیروباوەڕدا لەسەر یەك مەزهەب نین.

لە خۆشبەختیەوەیە ئەمڕۆ بە دڵنیاییەوە دەتوانین ئەمە بڵێین، چونکە کتێبەکانی ئەم سێ تاقمانە لە چاپدراون، لەبەردەستدان و جیاواز لە بیروباوەڕدا، هەندێکیان وەڵامی هەندێکی تریان دەدەنەوە، هەندێکیان هەندێکی تریان بە گومڕا و بیدعەچی دادەنێن... کەواتە ئارەزوومان نییە ئەوەی دابەشکراوە دابەشی

بکهینهوه.... بهڵام ئهم دابهشبوونه ڕاستییه. خودی حهنبهلییهکان له بیروباوهڕدا ڕاجیان... ڕاجیاییهکه له سهردهمی ئیبن جهوزیدا له به بیدعهچی دانانهوه گۆڕا بۆ حوکمی به هاوبهشدانانی کردهوهکه له سهردهمی ئیبن تهیمییهدا، ههروهها سهریکێشا بۆ ئاڵوگۆڕی تهکفیری ڕاشکاو له نێوان زانایانی حهنبهلیدا له سهردهمی شێخ محهممهدی کوڕی عهبدولوههاب و قوتابخانهکهیدا.

ههر کهسێك کتێبی پلهوپایهکانی ئهحمهد، دانراوی ئیبن جهوزی حهنبهلی (که سیفهتهکان لێکدهداتهوه (تأویل) دهکات و بهپاکگره)، دهبینێ گۆڕ و پاشکۆکانی زۆر به گهوره دادهنێ...

ههر کهسێکیش بۆچوونی حهنبهلییه پێشینهکان (وێکچوێنهر و چهسپێنهرهکان) له کتێبهکانی ژیاننامهکاندا بخوێنێتهوه، دهبینێ ئهوانیش گۆڕ و پاشکۆکانی به گهوره دهگرن، بهڵکو ههندێکیان ئهوهنده ئاڵودهی تهسهوف بووینه تا ئاستی دانان به یهکێتی بوون (وحدة الوجود)، وهك هروی حهنبهلی.

کهسێکیش کتێبهکانی ئیبن تهیمیه بخوێنێتهوه دهبینێ نکۆڵی له پرسی گۆڕ و پاشکۆکانی دهکات.

بهمهش لهم پرسهدا ئیبن تهیمییه تهواو بۆچوونی جیاوازه لهگهڵ مهزههبی حهنبهلیدا.

بهو مانایهی گشت حهنبهلیهکان لهسهر ئهمه بوونه و دانیان پێداناوه، بۆیه بۆ زانایانی شانشینهکه نییه بڵێن (ئێمه لهم بابهتهدا حهنبهلین، له کاتێکدا ئهمه لای ئهوان له ههڵوهشێنهرهوهکانی ئیسلامه)!

کتێب و ژیاننامه و فهتواکانی حهنبهلییهکان پڕن لهو پرس و بابهتانه، که زانایانی شانشینهکه پێیان وایه له ههڵوهشێنهرهوهکانی ئیسلامن...!!

باسی چەند گەواهی و بەڵگەیەکم کردووە لە توێژینەوەکانی ڕابردوودا؛ کە پێویست بە دووبارە کردنەوەیان ناکات لێرەدا، لەسەر ئەوەی حەنبەلییە کۆنەکان ئەم (هەڵوەشێنەرەوانەیان) لە باوەش گرتووە.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئیبن تەیمییە یان وەهابیەت لەم پرسەدا ڕاست یان هەڵەیان پێکاوە، یاخود ڕێژەیەك لە ڕاستیان پێکاوە و ڕێژەیەکیشیان لە هەڵە پێکاوە، ئەمە هەڵسەنگاندێکە لە شوێنی خۆیدا نییە.

بەڵام لێرەدا ئەوە دەڵێین کە ئیبن تەیمییە لەم پرسەدا لەگەڵ حەنبەلییەکان جیاوازە، زۆر بە توونـدی نکـۆڵی لێکـردووە، حـوکمی هاوبەشدانانیبەسەردا داوە، بکەرەکەی بە بێ باوەڕ داناوە... تاد، وەهابیەکانیش کە زانایانی شانشینەکە بەشێکن لێیان لەمەدا شوێنی کەوتن، ئەم بابەتە بە تێروتەسەلی لە شوێنی خۆیدا دەخرێتەڕوو.

ئیبن تەیمییە تەنها لە فیقهدا لەگەڵ حەنبەلیەتی ئیبن جەوزیدا کۆك بوو، لەگەڵ حەنبەلیەتی کۆنەکان لە فیقه و سیفەتدا هاودەنگ بوو، بەڵام لەگەڵ هەر دوو جۆرە حەنبەلیەتەکە لە بابەتی گۆڕ و تەبەڕوك و تەوەسولدا ڕاجیا بوو.

لێرەوە دەڵێین ئیبن تەیمییە مەزهەبێکی هەیە لە بیروباوەڕدا، جیاوازە لەگەڵ گشت حەنبەلییەکان لەم پرسەدا. ئایا وەهابیەت شوێنی ئیبن تەیمییە کەوت لە حوکمدان لەسەر ئەوانەی گۆڕ بەگەورە دەگرن و تەبەڕوك و تەوەسول بە پیاوچاکان دەکەن بە بیدعەچی و گومڕایی و تەنانەت هاوبەشدانان، یان فراوانکاریان کردووە لە شتانێکدا کە ئەوەی ئیبن تەیمییە بۆی چووە زیادی کردووە؟!جا ئەگەر ئەمەیان کرد بێ، ئایا زانایانی شانشینەکە تەنها بەوە دەستیان هەڵگرتووە کە وەسفی کردەوەکە بکەن وەك چۆن ئیبن تەیمییە – زۆربەی جاران –وای کردووە، یان فراوانکاریان تێدا

کردووه و لق و پۆپیان بۆ داتاشیوه و شتیان بۆ زیاد کردووه، وەك: شێخ محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب و قوتابخانەکەی کردیان؟

ڕاستەکە ئەوەیە؛ زانایانی شانشینەکە شوێن شێخ محەممەد و قوتابخانەکەی کەوتن لەم لق و پۆپ داتاشین و فراوانکارییەدا، تا وایلێهات هەندێك شتیان خزاندە ناویەوە کە هیچ پەیوەندیەکیان بە هەڵەوە نییە چ جای هاوبەشدانان.

کەواتە ڕاستەکە ئەوەیە کە کۆت و بەندێکی تر زیاد بکرێ بەم شێوەیە:

## کۆت و بەندی نۆیەم : زانایانی شارەزا تەنها لە ( بیروباوەڕی حەنبەلیەتی تەیمییەی وەهابیەت ) دا

دەکرێ ئەم کۆت و بەندە کورت بکرێتەوە بەم شێوەیە (زانایان لە بیروباوەڕی وەهابیەتدا)، ئەمە پوختەکەیەتی، چونکە شێخ محەممەد لە (بیروباوەڕی ئیبن تەیمییەی) هەندێك شتی هەڵبژاردووه و شتی تری بۆ زیاد کردووه، ئیبن تەیمییەش لە (بیروباوەڕی حەنبەلیەت)دا هەندێکی هەڵبژاردووه و بۆی زیاد کردووه، ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش لە بیروباوەڕی (ئەهلی سوننە) شتی پاڵفتە کردووه و بۆی زیاد کردووه، ئەهلی سوننەتش پوختەیەکیان لە بیروباوەڕی (موسڵمانان) پاڵفتە کردووه و بۆیان زیاد کردووه...

لێرەدا لە نێهنی ئەوە تێدەگەین بۆچی شێخ محەممەدی کوڕی عەبدلوەهاب قوتابخانەی ئیبن تەیمییەی هەڵبژاردووه لە ناو قوتابخانەکانی بیروباوەڕی حەنبەلیدا، سەرباری قوتابخانە سونییەکان.

قوتابخانەی ئیبن تەیمییەی هەڵبژارد و هێنایە نەجد، تەنها لە پێناوی ئەوەی ئەم بیروباوەڕە (دژی ئەوانەیە کە لایەنگرانی گۆڕ وتەوەسول و تەبەڕوك و تەسەوفن).

ئەو ئیبن تەیمییەی لە پێناو فیقھ نەهێنا.

تەنانەت لە پێناو سەرزەنشتکردنی (جەهەمیەت و موعەتەزیلە و شیعە)ش نەیهێنا.

هەروەها لە پێناو پرسی (بەدیهێنراوی قورئانیش) نەیهێنا.

لە پێناو پرسی بینینی خوا، تەرازوو، پرد، تکاکاری، شێوازی ناز و بەهرەکانی بەهەشت و سزای دۆزەخیش نەیهێنا... .

لەبەر ئەم شتە (فیقهی و بیروباوەڕیانە) لە بنەڕەتدا لەلای حەنبەلییەکانی نەجد هەبوون، تەنانەت ئەم شتانەن ڕەگ و ڕیشەیان هەیە لە ناو هەر سێ ڕەوت و ئاراستە حەنبەلییەکەدا، کتێبەکانی ئیبن تەیمییە لە بواری فیقھ نەوەك لە بیروباوەڕدا جێی بایەخی حەنبەلییەکانی نەجد بوون.

بەهۆی ئەوەی کتێبە فیقهییەکانی ئیبن تەیمییە لەلای حەنبەلییەکانی نەجد ناسراوو بوون، ئەوا وەك ئەوەیە شێخ محەممەدی کوڕی عەبدلوەهاب بڵێت: ئەوە شێخە حەنبەلییەکەتانە، شێخی ئیسلام، کە خاوەنی چەند هەڵبژاردنێکە و دونیا پڕ دەکات و خەڵکی سەرقاڵ دەکات، لەم هەڵبژاردنەیدا دان بەوەدا دەنێ کە ئەوەی ئێوە لەسەری دەڕۆن (هاوبەشدانانی مەزنە)! کە کوشتن و تێکۆشان پێویست دەکات.

دوو شت یارمەتی شێخ محەممەدیاندا:

یەکەم: بێ دەنگی حەنبەلییەکان لە ئاست ڕای ئیبن تەیمییە، کە پێچەوانەی ڕای حەنبەلییەکان بوون لەم بیروباوەڕەدا (بە پوختی لە تەسەوفدا)، چونکە ئیبن

تەیمیيە لە ناو حەنبەلییەکاندا تەنها ناوی بەوە دەرکرد کە زانایەکی حەنبەلی پایەدار و شەڕعناس و پیاوچاك و بەندەیەکی باشە... لەسەر نەریتی مەزهەبگەراکان لە ستایشکردنی زانایانی مەزهەبەکەیان و بێ دەنگ بوون لەو بۆچوونانەیان کە لە دەرەوەی مەزهەبەکەیانە...

دووەم: بوێری ئیبن تەیمیيە لە دوو شتدا، بە هاوبەشدانان و پڕوپاگەندەی بوونی یەکدەنگی...

ئیبن تەیمیيە بوێر بوو لە (بە هاوبەشدانان و کوفر و هەڵگەڕانەوە)، ئینجا فەتوادان بە پێویستی کوشتنی هەر کەسێك ئەم دۆخەی هەبێ دوای ڕوونکردنەوە بۆدان و داوای تۆبە لێکردنی، بانگەشەی ئەوەشی دەکرد ئەمە یەکدەنگی لەسەرە! ئەمە یارمەتی شێخ محەممەدی دا و بوێریەکی دیکەی خستە پاڵ بوێریەکەی ئەو.

لەبەر ئەمە گشت ئەو شتانەی ئیبن تەیمیيە ڕای تایبەتی تیایاندا هەیە، لە (بە هاوبەشدانان) یان (پرسی بوونی یەکدەنگی) نا دروستن یان بەلایەنی کەمەوە (جێگای تێڕامان و ڕاجیایین).

دووبارەی دەکەمەوە: ئەو شتانەی ئیبن تەیمیيە ڕای تایبەتی تیایاندا هەیە.

ئەم لقەی (حەنبەلی تەیمیی) لە نەجد لە (ڕووی بیروباوەڕەوە) زاڵ بوو، دوای سەرهەڵدانی وەهابیەت و لەگەڵ مانەوەی (دوو ڕێبازە فیقهییەکەی تری حەنبەلی). ئەم مەزهەبەی (تەیمیيە) لەگەڵ حەنبەلییەکان کۆکە لە بیروباوەڕدا، جگە لە پرسی (تەسەوف یان تەبەڕوك و تەوەسولکردن نەبێ بە شوێنەواری پیاوچاکانەوە... تاد).

کەواتە زانایانی شانشینەکە، بریتین لە زانای شارەزا لە مەزهەبی حەنبەلی تەیمیی وەهابی.

سەبارەت بە حەنبەلی: ئەوا پێشتر شرۆڤەکرا.

دەربارەی تەیمیی: زانایانی شانشینەکە بە زۆری لاساییکەرەوەی ئیبن تەیمیەن، خەریکە بە دەگمەن نەبێ بۆ کەسی تر نەگەڕێنەوە، ئەگەر بگەڕێنەوەش ئەوا تەنها بۆ ئەو کتێبانەی پێشووی حەنبەلی دەگەڕێنەوە، کە بینیمان چ کەم و کورتی و زیادەڕۆچوونێکی زۆر لە تەکفیردا تێیاندایە.

سەربارەت بە وەهابیی: بەهۆی ئەوەیە کە وەهابییەکان دەستیان گرتووە بە چەند زیادە و خستنەپاڵ و فراوانکارییەك کە شێخ محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب ئەنجامی دابوو، کاتێك ناوبراو زیادەڕۆچوونی (ئیبن تەیمییە)ی بینی لە پرسی گۆڕدا...

دەربارەی ئەو شتانەی وەهابییەت زیادی کردووە: ناودارترینیان حوکمدانە لەسەر وڵاتانی موسڵمانان (کە گۆڕەکان بە گەورە دەگیرێن و تەبەڕوك و تەوەسول بە پیاوچاکانەوە دەکرێ) بەوەی وڵاتی هاوبەشدانانن و وڵاتی ئیسلام نین.

حوکمدان لەسەر دانیشتوانی ئەم وڵاتانە یان ئەو زانایانەی لێکدانەوە (تأويل) دەکەن بەوەی بێ باوەڕن.

بە ڕاشکاوی تەکفیر کردنی ئەو زانا وەهابیانەی پشتگیری کارە ناوبراوەکان دەکەن، چ جای زانایانی دیکە.

دابەزاندنی ئەو ئایەتانەی لە بارەی هاوبەشدانەران دابەزیون بەسەر موسڵماناندا.

دابەشکردنی وڵاتانی ئیسلام بۆ وڵاتی ئیسلامی سەر بە وەهابییەت و وڵاتی کوفری سەر بە دژەڕاکانیان.

زیادکردنی چەند مەرجێك بۆ (لا إله إلا الله).

زیـــادکردنی هەلۆوەشـــێنەرەوە بـــۆ (لا إلـــە إلا الله)، جێبـــەجێکردنی ئـــەم هەلۆوەشێنەرەوانەی لەسەر ئەو موسلمانانەی دژی وەهابییەتن.

ئەگەر یەکێك لە هەلۆوەشێنەرەوەکانی ئیسلام کە ئیبن تەیمییە باسی کردووە، بریتی بێ لە (پشتگیری کردنی هاوبەشدانەران لە دژی موسلمانان)، ئەوا وەهابییەت ئەمەی کرد: (لە پشتگیری کردنی هاوبەشدانەرانی عویینە دژی موسلمانان لە خەلکی درعییـــە)).. مەبەســـتم ئەوەیـــە دژەکانیـــان دابەزاندۆتـــە ئاســـتی هاوبەشـــدانەرە رەسەنەکان، تەنها خۆشیان بە موسلمان داناوە، کە جگە لەوان موسلمانی تر لەسەر زەوی بوونی نییە.

ئەم پرسانە و هاوشێوەکانیان ئیبن تەیمییە لەسەری نەبووە.

جا لێرەوە دەکرێ بلێین:

زانایانی شانشینەکە لە رووی بیروباوەڕەوە بە پلەی یەکەم زانان لە مەزهەبی وەهابیـدا، بایەخدانـە رەسـەنەکەیان لەســەر ئەمـە کۆبووەتـەوە، ئەمــەش شـتێکی سروشتییە، تایبەت ئەوەی پەیوەستە بە پرسی گۆڕەوە، چونکە مەزهەبی وەهابی لە هەمووان زیاتر فراوانکاری تێداکردووە و دژی تێکۆشاوە بـە زمـان و شمشێر... کار گەیشتە ئەوەی ئەو ولاتانەیان بە کافر دانا، کە لەم پرسـەدا شوێن بۆچوونەکانیان ناکەون.

بـە پلـەی دووەم ئـەوان زانـان لـە مەزهـەبی تەیمییـدا، بەتایبـەت لـە پرسـی سیفەتەکانی خوادا، تەنانەت کتێبێکیان دەرکرد، تیایدا دانیاننا بەوەی (خوای گەورە ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروست کرد)!

بە پلەی سێیەم ئەوان بە پلەیەکی کەمتر زانان لە مەزهەبی حەنبەلیدا، بەتایبەت لەوەی پەیوەستە بە پرسی (بەدیهێنراوی قورئان)، تەنانەت حوکمی جەهەمی بوونیان بەسەر گشت موسڵمانانی تردادا.

بە پلەی چوارەم ئەوان زانان لە مەزهەبی سەلەفیدا، بەتایبەت لە حوکمدان لەسەر ئەشعەرییەکان لە پرسی لێکدانەوە (تأويل)دا.

بە پلەی پێنجەم زانای شارەزان لە مەزهەبی سوننیدا، بەتایبەت لە حوکمدان لەسەر دەستە و تاقمە ئیسلامییەکاندا، بەتایبەت شیعە.

زانایانی شانشینەکە هەندێك شتیان سوك کردووە، بەهۆی فشاری سیاسیەوە، چەندین شتیشیان زیاد کردووە لە دەرەنجامی چەندین شتی سیاسی و کەلەپوری و حزبی و سەردەمی.

ئەوەی نامۆیی ئەوان – بە زۆری – دەست بە هاوسەنگی ئەهلی سوننەوە ناگرن لە تەبەڕوکدا.

هاوسەنگی حەنبەلییەکان لە تەوەسلدا وەرناگرن.

هاوسەنگی ئیبن تەیمییە لە حوکمدان لەسەر خودی کەسەکان وەرناگرن.

دەستناگرن بە هاوسەنگی محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە فیقهدا.

بەڵکو زیادەڕۆچوون لە گشت چینێکەوە وەردەگرن و هاوسەنگیەکەی فەرامۆش دەکەن.

تا توانراوە بوترێ: ڕۆیشتنە ناو ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەردا (درود و سڵاوی خوای لێبێ) چەند ئاسان بووە، لێ چوونە دەرەوەشی چەند سەخت بووە، هاتنە ناو ئیسلام لەلای وەهابییەکان چەند سەختە و لێڕۆیشتنە دەرەوەشی چەند ئاسانە.

لەسەردەمی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) هاتنە ناو ئیسلام دروست بوو، ئەگەر لە جەنگ و ژێر سێبەری شمشێرەکانیش بووبا، ئەوەندە بەس بوو کە کەسە بێ باوەڕەکە شایەتمان بهێنێ تا خوێن و سامان و ماڵی پارێزراو بێ؛ لە کاتێکدا موسڵمان لەسەردەمی پێغەمبەردا لە ئیسلام دەرنەدەچوو، ئەگەر نامەی بۆ هاوبەشدانەران نووسیبووبا و دووڕووی ئەنجامدابووبا و هاواری کردبا ((ئەوەی باڵادەستە ژێردەستەکە لە شار دەردەکات)). لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کەسەکە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا بە موسڵمانی دەمایەوە ئەگەر لە ڕووکەشیشدا بووبا، هەمان مافی گەورە هاوەڵانیشی دەبوو لە میراتگرتن و هاوسەرگیری و هەڵسوکەوتدا، لێپرسینەوەشی لای خوایە.

لە سەردەمی وەهابییەتدا؛ ئەواوەهابییەکان باوەڕیان وایە کە تەنها شایەتمان و بنەماکانی ئیسلام بەس نین بۆ هاتنە ناو ئیسلام. هەر بۆیە وتمان ئای هاتنە ناو ئیسلام چەندە سەختە لای وەهابییەکان.

بەڵام لە هەمان کاتدا ڕۆیشتنە دەرەوە لە ئیسلام چەند ئاسانە، ئەگەر بەوتنی ئەوەش بێ: ((کە ئەم هەوایە سروشتییە))! یان بە نووسینی توێژینەوەیەکی کۆشش (إجتهاد)ی لەبارەی شوێنەواری پێشینان یان موسڵمانێتی ئەبو تالیب، هەروەك لە نموونەکاندا دەیبینین.

ئینجا کۆت و بەندی کۆتایی دێت:

## کۆت و بەندی دەیەم : زانایانی شارەزا لە مەزهەبی حەنبەلی تەیمیی وەهابی ( سعودی ) !

نەمویست ناوی کۆت و بەندی دەیەم بهێنم بەر لەوەی شرۆڤەی بکەم، بۆ دوورکەوتنەوە لە وروژاندن... بەڵام هیچ کێشەیەك نییە، زانایان لە کۆتایی سەردەمی ئیبن باز (بەتایبەتی لە دوای جەنگی دووەمی خەلیج، واتە دوای ساڵی ١٤١٠ك) قوناغێکی تازە دەرکەوت، کە سیمای مەزهەبێ نوێی تێدابوو لە بیروباوەڕدا.

ئەم مەزهەبە بە ئاوێتەکردنی دوو شت دامەزراوە:

یەکەم: بیروباوەڕی وەهابیەت و تەیمییە لە ڕووی پابەندبوون بە سەرچاوەکانیان و توندگیری لە هەمبەر ئەوانەی ڕەخنەی لێدەگرن.

دووەم: لێبوردەیی و هاوسەنگی تەنها لە پرسە سیاسییەکاندا!. وەك خۆگرتنەوە لە تەکفیر کردنی وڵاتانی موسڵمان، تەکفیر کردنی ئەو کاربەدەستەی حوکم بە یاسا دەستکردەکان دەکات، دروستی ئاشتەوایی کردن لەگەڵ جولەکە، خۆدزینەوە لە پشتگیری کردنی بزوتنەوە ئیسلامییە ناوخۆییەکان بەتایبەت کە بەرجەستەکەری بیروباوەڕی وەهابیەتن. ئەم هاوسەنگی و لێبوردەییە سیاسیە بە گشتی کارێکی ستایشکراوە، ئەگەر چەند کەم و کورتییەکیشی تێدا بێ، یەکەمیان: زۆر دواکەوت، دووەمیان: ئەو هاوسەنگییە تەنها لە لایەنە سیاسییەکاندا بووە و بە یەك جار دابەزێنراون. ئەم دوو کەم و کورتییە وایان کرد لێبوردەییەکە سەنگی خۆی لەدەست بدات، بەتایبەت لەلای ڕەوتە توندڕەوە ناوخۆییەکان، کە بینیان ڕێنماییەکانی وەهابیەت و تەیمییەت بەهۆی زمانلوسی و ترسان لە حوکمڕانان وەك پوشی بەربایان لێهات.

وا باشتر بوو زانایان و دەوڵەت کاریان کردبا لەسەر بڵاوکردنەوەی لێبوردەیی لە خوارەوە بۆ سەرەوەی هەرەمەکە، مەبەست ئەوەی کاریان کردبا لەسەر لێبوردە بوون لەگەڵ هەمووان لە موسڵمانان، ئینجا لەگەڵ زانایانی موسڵمانان و مەزهەبە ئیسلامییەکان تا دەگاتە لێبوردەیی لەگەڵ دەسەڵاتەکان، لەگەڵ جەخت کردنەوە لەسەر بەهاکانی لێبوردەیی و هاوسەنگی و برایەتی ئیسلامی، پێداگیری کردن لەسەر بەستەر و پەیوەندییە مەزنە ئیمانیە هاوبەشەکان لە نێوان موسڵماناندا، وەك: باوەڕ بوون بە خوا و بە پێغەمبەرەکانی و بە ڕۆژی دوایی و بنەماکانی ئیسلام و بنچینەکانی ئیمان، موسڵمان کافر ناکرێ مادەم نەزانە یان لێکدانەوە (تأويل)کارە.

هەر بە برای موسڵمان دەمێنێتەوە کە تەواوی مافەکانی هەیە، ئەوەی مەزهەبەکان بەجێیان هێشتووە لە ئاڵوگۆڕ کردنی گومڕاکردن و تەکفیر کردنی یەکتر، ئەوا ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە شەرعەوە نییە، بەڵکو بریتییە لە دوژمنکاری مەزهەبی، کە پێویست نییە موسڵمان پێیەوە پابەند بێ، دروست نییە موسڵمان ڕقی لە برا موسڵمانەکەی ببێتەوە یان تەکفیری بکات وەك شوێن پێ هەڵگرتنی ئەم دوژمنکاریانە و ڕۆیشتن لەگەڵی بێ هۆشیاری و ڕێنوێنی و وکتێبوسەرچاوەیەکیڕوونوئاشکرا؛ لەگەڵ چڕ کردنەوەی وتار و وانە و ئامۆژگارییەکان لەبارەی پێویستی کاراکردنی (پەرچەکانی تەکفیر و بەبیدعەچی دانان) و ڕەخنەگرتن لە ڕاو بۆچوونی مەزهەبی دوژمنکارانە، کە زاڵە بەسەر زۆربەی لاساییکەرەوەکانی مەزهەبەکان.

کاتی ئەوە هاتووە یەکێتی و برایەتی لە نێو موسڵماناندا دروست بکەین، پەیی بەو ناکۆکی و پەرتەوازەیی و دژایەتیکارییە بهێنین کە پێشینان لە نێو ئێمەدا چاندوویانە، ئێمە ڕۆڵەی ئەمڕۆین، کتێبی پەروەردگارمان لەبەر دەستە، فەرمان و

ڕێگرییەکان ناسراون، ئەوەش کە ڕاجیایی تێدا ڕوویداوە بەهۆی بەڵگە و مەبەست پاکیەوە، ئەوا لێبوردەیی و پاساو بۆ هێنانەوە تیایدا پەیڕەو دەکرێ... تاد.

ئەگەر لێبوردەیی و هاوسەنگی بەپێی ئەم شێوازە ڕۆیشت، ئەوا شتێکی ئاسان و قبوڵ کراو دەبوو لێبوردەیی و هاوسەنگی لە پرسە سیاسییەکانیشدا پەیڕەو کرابا.

بەڵام هزری وەهابی و حیزبی بە یەك جار بەم کۆمەڵە فەتوایە سیاسییە مەزنەدا بکێشرێ، ئەمە ئەو شتەیە کە گوشاری ناوخۆیی بەرگەی نەگرت. هەر بۆیە شتێکی سروشتی بوو چەند نووسینێك دەربکەون کە زانایانی شانشینەکە بە کافر بوون تۆمەتبار بکەن، لەم نووسینانە وتە و بیرۆکە وەهابیی و تەیمیی و حەنبەلییە دوور و درێژەکان دووبارە دەکرانەوە، چونکە سەرچاوە و ژێدەرەکانی وەهابیی و تەیمیی و سەلەفی و حەنبەلییەکان یەکێکە لەو سەرچاوانەی زۆرترین تەکفیری زانایانی کردووە، هێشتا زانایانی شانشینەکە هەر هانی دەستگرتن دەدەن بەم سەرچاوانە بێ ڕەخنە و پێداچوونەوە بۆ کردن و پاڵفتەکردن و سەرنج لەسەردان و نوێکاری، سەرباری نەبوونی هۆشیاری سیاسی لە ڕووی مافەکانەوە (مافەکانی گەل)، هەر لە مافە سیاسییەکان و ئابوورییەکان و بە پەلە چاکسازی کردنی لە سیستەمی دادگایی و خوێندن و جگە لەوانەش، لە پێداویستییە ناوخۆییەکانی کۆمەڵگە، کە واگونجاو بوو زانایان ئەم ئەرکە لە ئەستۆ بگرن ئەگەر شایستە بووبان.

ئەم کۆت و بەندەی دەیەم کە دەکرێ ناوی بنێم مەزهەبی ڕێکخستن و هەڵبستن، یەکێك بوو لەهۆکارەکانی زیادەڕەوی ناوخۆیی ئاینی، بۆ زانیاری هەڵبەستن کۆنە و بە یەك کەڕەت نەهاتووە، هەروەك لە ساڵی ١٤١٠ك و دواتر هات.

## ئەم پێشەکییە دوور و درێژە بۆچی؟

هۆکاری نووسینی ئەم پێشەکییە دوور و درێژە، ئەوەیە کە ئێمە ڕۆیشتووینەتە ناو قۆناغێکی سەختەوە، بەدووری نازانم خوێنەرێك ئەم توێژینەوەیە بخوێنێتەوە و بە پەلە وشەی گشتی و ڕەها بەکاربهێنێ و بڵێ: ئەمە چۆن بوێری ئەوە دەکات ڕەخنە لە (زانایان) بگرێت، بۆیە وەك دووربینیەك بۆ خۆم وام پێ باشتر بوو، ئەوە ڕون بکەمەوە کە ئەم بەکارهێنانە بەڕەهایی هەر لە سەرەتاوە هەڵەیە، ڕەخنەگرتن و هەڵەگرتن پاڵپشت بە زانیاری و زانست و ئارامی و ڕێزگرتن لەوانی ترەوە سەغڵەتی تێدا نییە.

دواتر ویستم – بەیەکەوە – مەشق بکەین لەسەر ملنەنواندن بۆ وشەی گشتی ڕەها، هەوڵ بدەین تا پێمان دەکرێت لە ئاستی پێویستدا بین لە وردبینی لە بەکارهێنانی نازناو و ناو و حوکمەکان، ئەوەی زانا بێ لەلای حوکمڕان و کاربەدەستمەرج نییە لە ڕاستییدا زانا بێ.

لێرەدا چەند پێوەر و ڕێککارێکی زانستی هەن دەبێ دووبارە ڕەچاو بکرێن و سەنگیان بۆ بگێڕدرێتەوە، کاری پێ بکەینەوە، ئەگەر کەمتەرخەمیان کرد لە وردبینیدا ئەوا چەندین کێشەی زانستیمان بۆ دێنێ و دەمانخاتە سەر چەند ئاڕاستەیەك، وای لێدێ نازانین چۆن لێیان دەرچین، بەتایبەت ئەگەر وشەکە فراوان و ڕەها و گشتی بوو. بەتایبەتیش کە ئێمە لە سەردەمێکداین دەستی کردووە بە لابردنی تەپ و تۆزی لاساییکردنەوە و دووبارە کردنەوە لە خۆی، ئێمە پێویستمان بە وردبینی زیاترە، چونکە زۆربەی ئەو دەردە کەلەپوریەی تووشمان بووە لە ڕابردوودا، بەهۆی پەسەندکردنی (ئەم وشە ڕەهایانە بووە بەبێ پێداچوونەوە و پرسیارکردن)، بەمەش ئەوەمان بەسەردا هات کە دەیبینین لە هەڵوەشانەوە و شەڕ و تەکفیر و ناکۆکی نێوان موسڵمانان.

پوختەکە ئەوەیە کە ئەوەی پێیان دەوترێ (زانایان) لە وڵاتەکەماندا – لەگەڵ ڕێزمان بۆ ئەوان –تەنها زانان لە یەك مەزهەبدا (نالێین شارەزان لە لقێکی مەزهەبێکی سەر بە مەزهەبێك)، ئەمە ئەوپەڕی زمان خۆشییە کە بتوانین بینوێنین. سەبارەت بەوەی ئەوان لە (زانایانی ئیسلام) بن، ئەوا ئەمە نە لەسەر ئەوان و نە لەسەر جگە لەوانیش لە پێشینان و پاشینان جێبەجێ دەبێ.

گوزارشتی (زانایانی ئیسلام) گوزارشتێکی سەنگینە، دەبێ تەنها کەسێك هەڵی بگرێ کە شایستەیەتی، لەوانە تاکێك شایستەی ئەمە نەبێ، بەڵکو دامەزراوەی کامڵ لە ڕووی زانستەکانەوە شایستەی ئەم ناوەیە، یەکەم جار بایەخ بدات بە زانین، عاشقی زانیاری بێ، گشت بیرۆکەیەك بخاتە ژێرچەکوژی توێژینەوەی زانستی بە مەرجەکانیەوە. لەم دامەزراوەیەدا تەنها شارەزابوون لە زانستە شەرعییەکاندا بەس نییە، بەڵکو پێویستە گشت ئەو زانستانە لەم دامەزراوەیەدا ئاوێتە بکرێن کە گەیشتوون بە زانین و زانیاری لە قەبارەی پوختی خۆیاندا، دوور لە پاشکۆیەتی مەزهەبێك یان سیاسەت یاخود بیرۆکەیەك، تەنها شوێن زانیاری دەکەوێ بۆ زانین.

لێرەدا دەتوانین بڵێین دەرەنجامەکانی ئەم دامەزراوەیە – ئەگەر بوونی هەبوو – یارمەتی موسڵمانان و جگە لەوانیش دەدات بۆ نزیك بوونەوە لە نزیکترین خاڵ لە ناسینی خوا و مەبەست و ئایین و پێغەمبەرەکەی و مێژووی موسڵمانان، ڕێژەی ڕاست و هەڵە پێکانی هەر بیرۆکەیەك... تاد.

لەوە کەم ناکەمەوە کە ئەم دامەزراوانە پشت ببەستن بە زانستە مرۆیی و سروشتییەکان، تا زانین زۆرتر نزیك بێ لە ڕاستییەوە، ئەم زانینەش تێکەڵەیەك بێ لەوەی خوا بە مرۆڤی بەخشیوە لە زانستەکانی سروش و گەردوون و دەروون و ژیری...، بۆ زانیاری تاکە ئایەت کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە و باسی زانایانی کردووە، کە ئەم ئایەتەیە: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾فاطر : ٢٨ . واتە : (

بەڕاستی هەر زاناکان پەی بەو نهێنیانە دەبەن و لەناو بەندەکانی خوادا هەر ئەوان لە خوا دەترسن ) . ئەمە لە چوارچێوەی زانستی سروشتیدا هاتووە، نەوەك زانستی شەرعی.

## ماوەی کاتەکە : ( ١٣٥٢ – ١٤٢٧ك )

ماوەی کاتی زانایە هاوچەرخەکانی شانشینەکەیە هەر لە دامەزراندنی شانشینی عەرەبی سعودیەوە لە ساڵی ١٣٥٢ك درێژ دەبێتەوە تا ئەمڕۆ، گومان لەوەدا نییە ئەم ماوەیە دوور و درێژە، دەیان کەسی تێدایە کە بە فەرمی و جەماوەری بە (زانایان) ناونراون، سەختە بە تەواوی دەوری ڕا و فەتواکانیان بدرێ، چ جای خستنەڕوویان، هەر بۆیە لێرەدا هەوڵ دەدەین تیشك بخەینەسەر دیارترین زانا کاریگەرەکانیان.

## بواری توێژینەوەکە

ناتوانیت گشت بەرهەمەکانی زانایانی شانشینەکە بتوێژیتەوە، بەڵام بەلایەنی کەمەوە دەکرێ توێژینەوەی چەند نموونەیەك ئەنجام بدرێ، ڕۆشنایی دەخرێتەسەر ئەمانەی خوارەوە لە فەتوای موفتییە فەرمییەکان، ئینجا لیژنەی هەمیشەیی، پاشان کاریگەرەکان لە گۆڕەپانی ناوخۆدا، بەم فەتوا و ڕا و بۆچوونانەی خوارەوە دەستپێدەکەین:

فەتوا و ڕا و بۆچوونی موفتی پێشووتر محەممەدی کوڕی ئیبراهیم.

فەتوا و ڕا و بۆچوونی موفتی پێشوو عەبدلعەزیزی کوڕی باز.

فەتوا و ڕا و بۆچوونی لیژنەی هەمیشەیی فەتوادان.

فەتوا و ڕا و بۆچوونی شێخ محەممەدی کوڕی ساڵحی کوڕی عوسەیمین.

فەتوا و ڕا و بۆچوونی شێخ ساڵی کوڕی فەوزانی ئەلفەوزان

فەتوا و ڕا و بۆچوونی شێخ عەبدوڵای کوڕی جبرین

فەتوا و ڕا و بۆچوونی کەسانێکی کاریگەر لە کۆمەڵگەدا

موفتی ئێستا کە شێخ عەبدولعەزیزی ئالی شێخە فەرامۆش کراوە، چونکە هیچ شوێنەوارێکی نووسراوی نییە و ناوبانگی کەمە و جێگای ڕەزامەندی نییە لە ناو پێکهاتەی زانستی لە شانشینەکەدا، هێشتا ڕا و بۆچوونەکانی لە ناو کۆمەڵگەدا ناسراون، زانستخوازانیش[1] فەتواکانی ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین و دواتر شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم بە گەواهی دێننەوە.

لەوانەیە ئەم سێیانەیە (ئیبن باز، ئیبن عوسەیمین، محەممەدی کوڕی ئیبراهیم) ناودارترین و کاریگەرتر بووبن لە ناو دەوڵەتی سێیەمی سعودیدا. هەر بۆیە لەوانەوە دەستپێدەکەین، ئینجا بە لیژنەی هەمیشەیی فەتوادان.

پرسیار ئەوەیە: ئایا فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانیان زیادەڕۆچوون و توندگیریان تێدایە یان نا؟

ئەگەر ئەمەی باسکرا تیایاندابوو، ئایا زیادەڕۆچوون یان هاوسەنگی بەسەر ئەم فەتوایانەدا زاڵە؟!

لێکۆڵینەوە لە هەموو ئەوانە دەکەین، توێژینەوەش بە ناڕاستەوخۆ دەکەین لە ڕەگ و ڕیشەی زیادەڕۆچوون لە فەتوا و ڕا و بۆچوونە ناوخۆییەکان.

---

(1) دەربڕینی (زانستخوازان)یش بە ڕەهایی نییە، لێرەدا چەند کۆت و بەندێك هەن، کە لە خودی دەربڕینەکەدا هەڵقوڵاون (خواست) و (زانست)... زۆربەی ئەوانەی گوزارشتی (زانستخواز)یان بۆ بەکاردێ، خوازی (زانست) خواز نین، لەو ڕووەی زانست و زانین و زانراوە... بەڵکو زانست دەخوازن وەك لاساییکردنەوەی مەزهەب و ڕا و بۆچوونێك کە فڵان و فڵان وتویانە... ڕاستگۆیی لە داواکردن و خواستندا (نیاز پاکی) لە داواکردنی (زانراو)دا لەلای (زانستخوازان) بوونی نییە، بەڵکو بە زۆری زانراو و زانیار دڵەڕاوکێ و ترس و دەرسبوونی لای ئەوان دروست کردووە... .

# فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی موفتی پێشووتر

## ( محەممەدی کوڕی ئیبراهیمی ئالی شێخ )

محەممەدی کوڕی ئیبراهیمی ئالی شێخ، موفتی پێشووتری شانشینی عەرەبی سعودی (١٣١١ – ١٣٨٩ك)، یەکەم موفتی فەرمی شانشینەکە بووە، کۆمەڵێك لایەن لە کرۆکی دەسەڵاتی کرداریدا لە ژێر سەرۆکایەتی ئەودا کۆبوونەوە، سەرباری ئەوەی سەرپەرشتی کاری بانگەواز و فەتوادانیشی دەکرد.

لە یەك کاتدا ناوبراو فەتوای فەرمی و تیاهەڵچوونەوەی بەدەست بوو، هەروەها یەکلاکردنەوەی ئەوەی ڕاجیایی تێکەوتووە لە نێوان دەستەی تیاهەڵچوونەوە و دادوەر، سەرۆکایەتی ئەم دامەزراوانەی کردووە: پەیمانگەی زانستی، کۆلیژەکانی زانستە ئیسلامییەکان، قوتابخانەکانی کچان، ئەنجومەنی دادگای باڵا (دادگا لەسەر دەستی ناوبراو لە ساڵی ١٣٧٦ك یەکی گرت)، دەستەی فەرمانکردن بە چاکە، زانکۆی ئیسلامی (بە پێشنیازی ئەو کرایەوە و خۆشی سەرۆکایەتی کردووە)، ڕابیتەی جیهانی ئیسلامی، دەستەی گەورە زانایان، نووسینگەکانی بانگەواز لە دەرەوەی وڵات، هەماهەنگی هەیە لەگەڵ ڕابیتەی ئیسلامیدا!، تا شێخ بەسام بە وتەیەکی پێگەی شێخی پوختە کردۆتەوە و وتویەتی: ((بە پوختی ئەو کەسەیە کە دەوڵەت ڕازی بوو قسەکەی یەکلاکەرەوە بێ لە کاروباری ئاینەکەیدا))[1].

نەوەیەکی لە قوتابییە کاریگەرەکانی خۆی بە جێهێشت لەسەر گۆڕەپانی ناوخۆدا، لەوانە: ئیبن باز، ئیبن حەمید، حەمود عقلاء، زەید فەیاز، ئیبن غەصون، صالح لحیدان، مەسعەری (عەبدوڵای باوك)، ئیبن جبرین، ئیبن منیع، قرعاوی، یوسف وابل، ئیبن دهیش، ئالی قاسم (عەبدولڕەحمان و محەممەدی کوڕی) فالحی کوڕی

(١) ابن بسام: ١/ ٢٣٥.

مەهدی دوسەری، محەممەدی کوڕی عودە...، ئەوانە ڕاییکردنی کاروبارە ئاینیەکانیان بەدەست بوو لە وڵاتدا[1]، باوکی وەزیری دادی ئێستایە (عەبدوڵای کوڕی محەممەدی ئالی شێخ).

کۆی فەتوا و نامە و پەیامەکانی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم، موفتی پێشووتر لە ١٣ بەشدا لە چاپدران، محەممەدی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی قاسم هەڵساوە بە کۆکردنەوە.و ڕێکخستنی، بەڵام لە دوای سڕینەوە و شاردنەوەی هەندێکی – وەك زانراوە و ناوی دەرکردووە لە ناو زانستخوازاندا – لەسەر ئەرکی دەوڵەت و بە فەرمانی شا فەیصەڵ (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لە چاپدرا[2]، دەقی فەرمانی شاهانەییەکە هەیە، کە لە سەرەتای شەوالی ١٣٩٠ك دەرچووە[3]، واتە: دوای ساڵێك لە کۆچی دوایی کردنی.

گشت فەتواکانم خوێندۆتەوە، زۆر شتی چاك و بە کەڵك و سوودی تێدایە، سەرباری ئەو ئارامی و دینداریە نەگۆڕەی هەیبووە، بەڵام زیادەڕۆچوون و دەمارگیری – نەك تەنها ئەوەی مەزهەبی، بەڵکو ئەوەی تیرەیی و ناوچەییش – زاڵە بەسەر زۆرێك لە فەتوا و ڕا و بۆچوونەکاندا. ئەو زیادەڕۆچوون – بەتایبەت هی مەزهەبیەکەی – وایلێهاتووە بووەتە یەکێك لە پاشخان و سەرچاوەکانی هزری توندڕەوی بەبێ گومان و دوودڵی. لەوانەیە کتێبەکانی باوکی محەممەد عسامی مەقدسی گەواهیدەر بن لەسەر ئەمە، لە کتێبەکەیدا: (الكواشف الجلية في كفر الدولة

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ژیاننامەکەی لای ئیبن بەسام لە (علماء نجد: ١/ ٢٤٢ - ٢٦٣)، هەروەها ژیاننامەکەی لە (مجموع فتاوى محمد بن إبراهيم) بە پێنووسی قوتابییەکەی محەممەدی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی قاسم (جامع الفتاوى: ١/ ٩ – ٢٣).

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن قاسم للفتاوى: ١/ ٤.

(٣) ئیبن قاسم باسی ئەوەی کردووە کە فەرمانەکەی شا فەیصەڵ جێبەجێکراوە لە سەردەمی شا خالیدا (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، شێخ ئیبن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێ) پشتیوانی لە پڕۆژەکە کردووە.

سعودية) و کتێبی (ملة إبراهيم) زۆرێك لە ڕا و بۆچوون و فەتواکانی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیمی هێناوە.

هەروەك توندگیریشێخ هێشتا لە یادی گشتی هزری توندڕەوی ناوخۆییدا ماوە، ئەگەر ئەوە بخەینەڕوو کە چەندە گەواهی بە بۆچوون و فەتواکانی شێخ دەهێنرێتەوە و ستایشی دەکرێ لەسەر توندڕەویەکەی لەو شتانەی تیایدا ڕاستی پێکاوە، ئەوا بابەتەکە درێژە دەبێتەوە.

وەك نەریت ڕا و بۆچوون و فەتوا هاوسەنگەکان ناخەمەڕوو، بەهۆی بوونی بنچینەکەیان پێش شێخ، هەروەها لەبەر ئەوەی ئامانج لەم توێژینەوەیە ڕامانە ئەوەی ئایا لێرەدا ڕەگ و ڕیشەی ناوخۆیی بۆ هزری توندڕەوی هەیە یان توندڕەوی لە دەرەوە هاوردە کراوە یاخود تێکەڵەیەکە لە نێو هەر دووکیاندا؟ نموونەی ئەم توێژینەوانە خەیاڵیان بەشی یەکەمە لە پرسیارەکە: ئەویش ئەوەیە: ئایا هیچ ڕەگ و ڕیشەیەکی ناوخۆیی بۆ هزری توندڕەو بوونی هەیە؟ توێژینەوەکە بەشی دووەمی پرسیارەکە ڕەت ناکاتەوە، بەڵام ئەم بەشەی دووەمە بابەتی توێژینەوەکە نییە.

## بەڵگەکانی زیادەڕۆچوون لە فەتواکانی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیمدا

زیادەڕۆچوونی شێخمان لە چەندین شتدا بەدی کرد، چ لە تەکفیر کردنی موسڵمانان یان دروست نەبوونی سەربڕاوەکانیان، یاخود بە چاکتر دانانی زانستی ئەبو جەهل لە زانستی مێژەر بەسەرەکان لە زانایانی موسڵمانانی سەردەمی خۆی... تاد، لەگەڵ زیادەڕۆچوون لە دەمارگیری تیرەیی و ناوچەیی و تاقمگەرایی... تاد، ئەمە بە زیاد پێوەنان ناڵێم، بەڵگەکان لەم بارەوە دەخرێنەڕوو، سەرباری ئەوەی چەند

نموونەیەك لەو خاڵە ئەرێنیانە تۆمار دەکەین، کە بەشی زۆریان دەچێتە ناو لایەنی تێکگیران یان پاشگەزبوونەوە لە یەك لە دوو بۆچوونەکانی.

لە میانەی خوێندنەوەی فەتوا و پەیامەکانی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم، وامبینی چەند خەسڵەتێکی گشتی هەن، کە ڕا و بۆچوون و فەتوا و کەسایەتیەکەی پێیی تایبەتمەندە، لە دیارترینیان:

## زیادەڕۆچوون لە بیروباوەڕدا

بابەتی (بیروباوەڕ) بابەتێکی دوور و درێژ و سەرسوڕهێنە، شێخ محەممەد خەریکە گشت بابەتێك بە بیروباوەڕەوە ببەستێتەوە، ئەمە لە ڕا و بۆچوون و فەتواکانیدا، ئەگەر چی ئەوەی فەتواکانی کۆکردۆتەوە هەوڵیداوە ئەمە سوك بکات، بەوەی بیروباوەڕی کورت کردۆتەوە لەو شتانەی کە زۆربەیان دەچنە ناو بازنەی بیروباوەڕەوە، ئەگەرچی هەندێك شتی هەر تێدا ماوە کە پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە نییە مەگەر بە زۆرملێ نەبێ، وەك: ڕیش و وێنەگرتن...

### یەکەم: تەکفیر و پاشکۆکانی

فەتواکانی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم، بەتایبەت لە بیروباوەڕدا تایبەتمەندە بە تەکفیر کردنی موسڵمانان، گومڕاکردنیان و بە گەوجدانانیان، بە حەرام دانانی نوێژ کردن لە دوایان و خواردنی سەربڕاوەکانیان و دەرکردنیان لە وڵاتدا... تاد.

١- **زۆربه‌ی موسلمانان بێ بڕوا و کافرن!**: پێی وایه زۆربه‌ی موسلمانان ته‌نها به ناو موسلمانن، له ڕاستی و حه‌قیقه‌تدا بێ بڕوا و کافرن، ده‌ڵێت: ((موسلمانێتی زۆربه‌ی موسلمانان، ته‌نها به‌ناوه، زۆربه‌ی ئه‌وانه‌ی ده‌درێنه پاڵ ئیسلام به ناو پێیان ده‌وترێ: موسلمانان دژی جوله‌که و نه‌سرانیه‌کان... موسلمانێتیه‌که به‌ناوه، نه‌وه‌ك به خۆشویستن و ڕق لێبوونه‌وه))! [١/ ٧٧].

٢- **ولاتانی موسلمان، ولاتی کوفرن**: پرسیار له شێخ کرا ده‌رباره‌ی کۆچ کردن له‌و ولاتانه‌ی موسلمانان که حوکمیان تێدا به یاسا ده‌کرێ؟... وه‌لامی دایه‌وه: (ئه‌و ولاته‌ی به یاسا حوکمی تێدا ده‌کرێ ولاتێکی موسلمان نییه)! [٦/ ١٨٨].

ده‌ڵێم: ئه‌مه خراپتره له ته‌کفیر کردنی حکومه‌ته عه‌ره‌بییه ئیسلامییه‌کان، چونکه شێخ ته‌نها حکومه‌ته به کافر ناونابات، وه‌ك چۆن ئه‌مرۆ ڕێکخراوی قاعیده ئه‌مه په‌یڕه‌و ده‌کات،به‌ڵکو خودی ولاته‌که به ولاتی و کوفر و هاوبه‌شدانان داده‌نێت!... هه‌ر بۆیه شێخ فه‌رمانی کردووه کۆچ له‌و ولاتانه‌دا بکرێ، ئه‌مه مانای وایه له‌سه‌ر دانیشتوانی ولاتانی عه‌ره‌بی ئیسلامی پێویسته کۆچ بکه‌ن بۆ شانشینه‌که، ئه‌گه‌رنا هه‌ر که‌سێك به کوفر و هاوبه‌شدانان ڕازی بێ ئه‌وا ئه‌ویش بێ باوه‌ڕ و کافره... !... له شوێنێکی تردا شێخ ولاتی ئیسلام و ولاتی کوفری ڕوونکردۆته‌وه، وتویه‌تی: ((ئه‌گه‌ر هاوبه‌شدانان ده‌رکه‌وت و نکۆڵی لێنه‌کرا و لانه‌بردرا، ئه‌وا حوکمی کوفر و بێ بڕوایی به‌سه‌ر ئه‌و ولاته‌دا ده‌درێ، بانگه‌شه‌ی ئیسلام و موسلمان بوون سوودی نابێ، هه‌ر کاتێك هاوبه‌شدانان به ئاشکرا بینرا و له‌ناونه‌برا، ئه‌وا حوکمی کوفری به‌سه‌ردا ده‌درێ))! [٦/ ١٩٧].

ده‌ڵێم: ئه‌وه‌مان زانی مه‌به‌ستی وه‌هابییه‌ت سه‌باره‌ت هاوبه‌شدانان چییه، بۆیه له‌مه‌وه ده‌زانین میسر وعێراق و جه‌زائیر و ئێران و مه‌غریب و سودان و فه‌له‌ستین و یه‌مه‌ن و پاکستان... گشتیان ولاتی کوفرن نه‌وه‌ك ولاتی

موسڵمان، ئەمەش بەپێی مەزهەب و بۆچوونی شێخ!، هەر لەم چوارچێوەیەدا شێخ پێی وایە بێ بڕوایانیش بانگەشەی موسڵمانێتی دەکەن ((تەنها پێیان وایە ناوی ئیسلام و ڕۆژوو و شتی لەو جۆرە بەسە!)) [٦/ ١٨٨]. ئەمەش مانای شتە بچوکەکان دەگەیەنێ وەك بنەماکانی ئیسلام!، چونکە ئەوان وەهابی نین، چونکە پێیان وا نییە موسڵمانان تەنها وەهابییەکانن و وڵاتی ئیسلامیش تەنها شانشینەکەیە، دەبێ بیروباوەڕێکیان هەبێ موسڵمانانی پێ کافر بکەن، تا خۆیان دەبنە موسڵمانی ڕاستەقینە. لەلای شێخ ئەوان تەنها دەڵێن: موسڵمانین و نوێژ دەکەن و ڕۆژوو دەگرن و حەج دەکەن و جگەلەمانەش لەو شتانەی ئاماژە و بەڵگە نین لەسەر موسڵمانێتیەکەیان!!!

٣- **هەڵگەڕاوە، ئەو کەسەیە کە دەدرێتە پاڵ ئیسلام!** : کاتێك شێخ وشەی هەڵگەڕاوە - بەکاردێنێ – مەبەست لێی ئەو کەسە نییە کە وازی لە ئاینی ئیسلام هێناوە، بەڵکو مەبەستی ئەو کەسەیە کە هەر موسڵمانە و دراوەتە پاڵ ئیسلام، بەڵام لە بیروباوەڕدا وەهابی نییە، یان وەهابییەت دان بە موسڵمانێتی ئەو کەسەدا نانێ!، بڕوانە پێناسەی شێخ بۆ کەسی هەڵگەڕاوە لە کۆمەڵە فەتواکەیدا، کاتێك پرسیاری لێکرا دەربارەی هەڵگەڕاوە و کافری ڕەسەن. وەڵامێکی دایەوە کە لەلای هیچ یەکێك لە موسڵمانان بوونی نییە، تەنها لەلای وەهابییەت نەبێ، جا وتی: ((کەسی هەڵگەڕاوە ئەو کەسەیە کە دراوەتە پاڵ ئیسلام! یەکێك لەو شتانەی موسڵمان پێی کافر دەبێ بە ڕۆشنی تێیدا بەرپابووە، کوفرەکە توندترە لە کافری ڕەسەن))!! [٦/ ١٨٣]. لە کاتێکدا کتێبەکانی فیقهی حەنبەلی و جگە لەوانیش پێناسەی هەڵگەڕاوەیان کردووە بەم شێوەیە: ئەو کەسەیە واز لە ئاینی ئیسلام دێنێ، نادرێتە پاڵی، بە تەواوەتی وازی لێهێناوە، دواتر لەوانەیە ئەوەشی بۆ زیاد بکەن، کە هەر کەسێك گومان ببات بەوەی موسڵمانە و نکوڵی بکات لە

شتێکی بەپێویست زانراو لە ئایین، وەك نكۆڵی کردن لە پێویست بوونی نوێژ و حەرام بوونی زینا... ئەمانە (لە ئایندا بە پێویست زانراون).

هەر کەسێك شتێکی لەو جۆرە بکات ئەوا موسڵمانان کۆکن لەسەر هەڵگەڕانەوەی. ئەوەی لە ئایندا بە پێویست زانراوە، هەمان (ئەو شتە نییە کە لە مەزهەبدا بە پێویست زانراوە). ئەو شتەی لە ئایندا بە پێویست زانراوە واتا ئەو شتەی پێویست بە بەڵگە هێنانەوە ناکات لەسەری، کەسی سادە و زانا دەزانن ئەم شتە بەشێکە لە ئاینی ئیسلام، تەنانەت ئەگەر ئەو شتە واجبیش نەبێ وەك بەخشین و سەدەقە یان خوێندنەوەی قورئان یاخود نوێژی سوننەت، ئەمانە هەموویان سوننەتن، بەڵام هەر کەسێك نكۆڵی بکات لەوەی لە ئاینی خوا نین، ئەوا ئەو کەسە هەڵگەڕاوەیە، حوکمی هەڵگەڕانەوەی بەسەردا نادرێ، تا شتەکەی بۆ ڕوون نەکرێتەوە و داوای تۆبەی لێنەکرێ، ئەی چی سەبارەت بە واجب بوونی نوێژ و چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك و قەدەغەکردنی ستەم و درۆ، ئەمانەش لەو شتانەن کە لە ئایندا بەپێویست زانراون، هەر کەسێك نكۆڵی شتێکی لەم جۆرە بکات، ئەوا هەمووان حوکمی هەڵگەڕانەوەی لەسەر دەدەن، سەبارەت بەوەی لە مەزهەبدا بە پێویست زانراوە لەلای پەیڕەوانی مەزهەبەکە، ئەوا ئەو کەسەی نكۆڵی لێدەکات بە کافر دانانرێ، بۆ نموونە پارێزراوی (لە مەزهەبی ئیمامییەکاندا بە پێویست زانراوە.

مەبەستم لەوەیە ئیمامییەکان بڕوایان بە پارێزراوی ئیمامەکانە)، بەڵام ئەگەر کەسێکی شیعی یان سوننی نكۆڵی کرد لە پارێزراوی ئیمامەکان، ئەوا بۆ هیچ زانایەکی شیعە دروست نییە کەسێك بە کافر دابنێ کە نكۆڵی لەمە کردووە، ئەگەر کەسەکە لە تاقمی شیعەش بێ، ((چونکە ئەوەی لە مەزهەبدا بە پێویست زانراوە، مەرج نییە لە ئاینی ئیسلامیشدا بە پێویست زانراو بێ)). مەبەست لە بەپێویست زانران ئەوەیە کە دەروون ناچارە ملکەچی ببێ بەبێ

بەڵگە هێنانـەوە، وەك: واجـب بـوونی نوێـژ. هەنـدێك لـە زیادەڕۆچـووانی نـاو پەیڕەوانی مەزهەبەکان بە گشتی تێکەڵکاری دەکەن لەم لایەنەدا دەکەن.

زۆر جار کەسانێك تەکفیر دەکەن کە نکۆڵیان کردووە لە شتێك ((کە لە مەزهـەب بـە پێویسـت زانـراوە)) نـەوەك ((کـە لـە ئـاینی ئیسـلام بـە پێویسـت زانراوە)). بەڵام مەزهەبی شێخ – مەزهەبی وەهابی –تـەکفیری کەسـێك دەکـات کـە نکـۆڵی کـردووە ((لـەو شـتەی کـە لـە مەزهــەبی وەهابیـدا بەپێویسـت نـەزانراوە))!، تەنانـەت هەنـدێك جـار حـوکمی هەڵگەڕانـەوە بەسـەر کەسـێکدا دەدەن لە پرسێکدا کە ((لەلای شێخ هێشتا یـەکلا نەکراوەتـەوە))! بـەو مانایـەی ئەو شێخەی فـەتوای هەڵگەڕانـەوە لەسـەر کەسـێك دەردەکات، لەوانەیـە لەسـەر پرسێك بێ هێشتا یـەکلای نەکردبێتـەوە و زۆر لـەلای پەسـەند نـەبێ، هـەروەك ئەمە لە خودی فەتواکانی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبڕاهیمدا بەدیدەکەین.

ناوبراو لە یەك پرسدا حوکمی لەسەر دوو کەس داوە، لەسەر یەکێکیان حـوکمی هەڵگەڕانـەوە و لەسـەر ئـەوەی تریـان حـوکمی هەڵنەگەڕانـەوەی داوە. ئەمـە لـە شـتێکدا کـە بەپێویسـت نـەزانراوە نـە بـە بەڵگـە هێنانـەوە و نـە بـە یەکلاکردنەوە، تەنانەت لەلایەن خودی شـێخیش کـە سەرچـاوەی فڵان و فیسـار فەتوایەیـە...! ئەمـە ئەوپـەڕی پەلەکردنـە لـە حـوکمی هەڵگەڕانـەوەدان لەسـەر خەڵك.

٤- **هـەر کەسـێك بـاوك و دایکـی مردبـێ پـێش وەهابییـەت، ئـەوا حوکمەکـەیان هاوبەشدانانە!** : ئەگەر دایك و باوکی کەسێك مردن، لەسەر مەزهەبێکی سەر بە ئیسـلام بـوون، بـەڵام بانگـەوازی وەهابییـەتیان پێنەگەیشـتبێ، ئایـا ئـەوان موسڵمانن؟ شێخ صەنعانی باسی ئەوەی کردووە ئەوان (ڕەسەنن "واتە موسڵمانی ڕەسەنن")، شێخەکان – مەبەستی زانا وەهابییەکانە – پێچەوانەی ئەمە دەڵێن

"واتە: دەڵێن: ئەوان هاوبەشدانەرن"، شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیمیش ئەوەی هەڵبژاردووە کە ئەوان بتپەرستن!.

پرسیار و وەڵامەکەی ئاماژەیەکی نا ڕۆشنن، تەنها کەسانێکی کەم دەیزانن، هەر بۆیە بە ئارامی دەڕوات تا خاکێکی بەپیت دەبینێتەوە و دەتەقێتەوە!

٥- **هاتنە ناو ئیسلام، بریتییە لە هاتنە ناو وەهابییەتەوە!** : کەسێك بە ناوی ئیسماعیلی کوڕی یوسفی نەبهانی هاتە سەر مەزهەبی وەهابییەت، ئامادەی لای شێخ بوو، ئەم کەسە لە ناوەکەیدا دیارە موسڵمان بووە پێش ئەوەی شوێن وەهابییەت بکەوێ، شێخ دەقێکی دەرکرد و تیایدا وتی: ((ئیبراهیمی کوڕی یوسفی نەبهانی ئامادەبوو لەلامان و بە ئارەزووی خۆی ئیسلامبوونی هەڵبژارد و هاتە ناویەوە... تاد)) [١٢/ ١٩٨]. شێخ باسی ئەوەی کردووە شایەتمانی فێری نەبهانی کردووە و فەرمانی پێکردووە بە پاك و خاوێنی و نوێژ کردن... تاد!.

ئەم ڕووداوە زۆر نامۆ و سەرسوڕهێنەرە، لە میانەی خوێندنەوەی ئەم دەقە کە (لە ساڵی ١٣٧٧ك دەرچووە)، وەك ئەوەیە کەسەکە تۆمەتبار کرابێ بەوەی موسڵمان نییە، بۆیە کەسەکە ڕۆیشتووەتە لای شێخ و ڕۆیشتنە ناو وەهابییەتی ڕاگەیاندووە، داواشی کردووە تا ئەم دەقەی ڕادەست بکرێ تا بە بەڵگەی بهێنێتەوە ((لەکاتی پێویستیشدا بۆی بگەڕێتەوە))!، بەم شێوەیە لە دەقەکەدا هاتووە، وا دەردەکەوێ کە هەڕەشەی کوشتن یان دەرکردنی لەسەر بووە، چونکە باوکی ئیسماعیل کە ناوی (یوسفی نەبهانی) بوو سۆفی بوو، بۆیە ئەو پێویستی بە (دەقی بێ تاوانی) هەبوو بۆ سەلماندنی ئەوەی کە موسڵمانە!!!!!.

٦- **هەر کەسێك موسڵمان بێ، ئەوا گومان لە ئیسلامەکەی دەکرێ تا وەهابییەکان ئەوە دەزانن کە لەسەر کەسێکی وەهابی یان نا وەهابی موسڵمان بووە!** : وەزیری ناوخۆ نامەیەکی موفتی نووسی، تیایدا داوای ڕوونکردنەوەی لێکردبوو دەربارەی کەسێکی ئەمریکی کە لەسەر دەستی پێشنوێژخوێنی مزگەوتێك موسڵمان بووە، دەیەوێ حەج بکات بەبێ مەحرەم، ئایا بۆی دروستە یان نا؟. هەر چەندە پرسیاری وەزیری ناوخۆ پەیوەستە بە حوکمەوە، بەڵام شێخ ئەمەی ڕەتکردەوە و ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ گومان خستنەسەر موسڵمانێتی کەسەکە، کە موسڵمان بووە لەسەر دەستی کەسێك کە نایناسێت!، بۆیە شێخ وەڵامی دایەوە: ((ئەوە بە بەڕێزتان ڕادەگەیەنین کە بانگەشەی موسڵمانێتی بەس نییە! بەڵکو دەبێ ئەم موسڵمانێتیە بەشێوەیەکی شەرعی و لەلای دادوەرێکی شەرعی بچەسپێ، حاجی حوسێن – واتە ئەوەی ئافرەتەکەی لەسەر دەستی موسڵمان بووە – لەلای ئێمە ناسراو نییە... تاد))[٥/ ١٩٦].

ئەمەش زیادەڕۆچوونە لە دادوەری کردندا، ئایا دادوەری شەرعی لە ئەمریکا لە کوێ بوونی هەیە؟! ئەمە وەك ئەوەیە شێخ بڵێ: دەبێ لە ئەمریکا دادوەرێکی وەهابی حەنبەلی هەبێ، بیروباوەڕی ئەم ئافرەتە موسڵمانە تاقی بکاتەوە، ئینجا ئەگەر وامانزانا حاجی حوسێن سۆفی یان شیعە یاخود هەر شتێکی ترە، ئایا ڕێگری لەوە دەکرێ سۆفی و شیعە بچنە حەج؟! دەڵێم: ئەگەر فەرمان تەنها بە دەستی وەهابییەکان بووبا، ئەوا حەج کردنیان لە هەمووان قەدەغە دەکرد جگە لە وەهابییەکان نەبێ! دەبینین کە پێیان وایە تەنها سەربڕاوەکانی وەهابییەکان یان جولەکە و نەسرانیەکان دروستە!!

سەبارەت بە تێکڕای موسڵمانەکانی دیکەش جگە لە وەهابییەکان ئەوا سەربڕاوەکانیان دروست نییە... ئەمە زیادەڕۆچوونێکە لەم جۆرەیدا لە زیادەڕۆچوونی ڕێکخراوی قاعیدە توونددترە، ئەگەرچی زیادەڕۆچوونی

ڕێکخراوی قاعیدە زیانی زیاتر بێ... بەڵام بۆیە بەجۆش و خرۆش وەڵامی ڕێکخراوی قاعیدە درایەوە، چونکە شتەکە پەیوەست بوو بە حکومەتەکانەوە، ئەگەرنا ئەو زیادەڕۆچوونەی لەلایەن حکومەتەکانەوە پاڵپشتی دەکرێ ئەوا موسڵمانان بە ئاگرەکەی داغ دەبن. هەر بۆیە دەڵێین: پێویستە دژی تێکڕای زیادەڕۆچوون ببینەوە، بەرەنگاری زیادەڕۆچوون ببینەوە لە هەر کوێیەك بێت، چ لە دژی حوکمڕان یان گەل یاخود مەزهەب یان کۆمەڵیەکیاخود ئایینێك یان ڕەچەڵەکێك یاخود ناوچەیەك بێ... تاد، ئەمە چارەسەری گشتگیر و هیوابەخشە.

٧- **تێکگیران لە حوکمدان بە هەڵگەڕانەوە:** کەسێك لە حیجاز بە ناوی (سەعدی کوڕ...) هەڵسا بە تانەدان لە ئاینی کەسێکی موسڵمان، شێخ فەتوایەکی هاوسەنگ و ڕەسەنی بۆ دەستەی فەرمانکردن بە چاکەدا، ئەمەش دەقەکەیەتی: ((هیچ بەڵگەیەك بەرپا نەبووە بۆ سزا جێبەجێ کردن لەسەر سەعد، چونکە ئەو بە ڕاشکاوانە تانەی لە ئیسلام نەداوە، بەڵکو تانەی لە ئاینی کەسەکە داوە، لەوانەیە تانەکەی ئەوە بگەیەنێ کە دینداری کەسەکە بێ کەڵکە، سزا و سنوورەکانیش بە گومان لادەبرێن))[١٢/ ١٨٦]. بەڵام ئەم هاوسەنگییە نەما، کاتێك بینیمان شێخ حوکمی هەڵگەڕانەوە لەسەر کەسێك دەدات کە هەمان کاری کردبوو، کەسێك بەناوی (معویز) تانەی لە ئاینی کەسێك دابوو بە ناوی (محەممەدی مەهدی) بوو – هەر دووکیان لە ناوچەی جیزان بوون – جا شێخ چ فەتوایەکی بۆ دادوەری سامتەدا؟. ئەم فەتوایەی دا: ((پێتان ڕادەگەیەنین کە تانەدانی لە ئاینی محەممەدی مەهدی – لە دۆخێکدا محەممەدی مەهدی موسڵمانە – تانەدانە لە ئاینی ئیسلام، هەروەك لاتان شاراوە نییە تانەدان لە ئایین هەڵگەڕانەوەیە پەنا بەخوا... بەم پێیە پێویستە ناوبراو بهێنن و خۆی بشوات و شایەتمان بهێنێ!))[١٢/ ١٨٨].

دەڵێم: دەبینین دوو فەتوا لەسەر یەك ڕووداوی هاوشێوە دەردەچێ، لە یەکێکیان کەسەکە بێ تاوان دادەنێ، لە ئەوەی تریان بە هەڵگەڕاوە هەژماری دەکات! فەتوای هەڵگەڕانەوەی کەسەکە دوای چەند ساڵێك دەرچوو لە پاش ئەو فەتوایەی دابووی بە بێ تاوانی ئەو کەسەی هەمان کردەوەکەی ئەنجامدابوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شتەکە گەشەکردن نییە لە فەتوادا بەرەو باشتر، لێکدانەوە بۆ ئەو فەتوایەی بەبێ تاوان دانانەکە لەگەڵ کات ئاشکرا بوو، ئایا ئەم تێکگیرانە هیچ نهێنیەکی هەیە؟ بەڵێ پێم وایە نهێنیەکی هەیە... بەڵام لێرەدا بواری ئەوە نییە بوترێ، دەکرێ جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە بکرێتەوەی دوای وەرگرتنی ناوی تەواو هەر دوو کەسەکە، بەتایبەت (سەعد)ی بەبێ تاواندانراو لە حیجاز! (پوختەی نهێنی ئەم تێکگیرانە ئەوەیە کە هەرێمییە، هەر هەرێمێك حوکمی خۆی هەیە!). ئەگەر ئەو کەسەی فەتواکانی شێخی کۆ کردووەتەوە ناوی تەواوی کەسەکانی هێنابا ئەوا نهێنیەکەمان دەزانی، کە لە فەتوایەکی تردا هاتووە، هەروەك دەخرێتەڕوو.

٨- **فەتوادان بە دروستبوونی بە کۆیلەکردنی موسڵمانان :** شێخ لە پرسی بە کۆیلەکردندا باسی ئەوەی کردووە، کە وەهابییەکان موسڵمانە دژەڕاکانیان بە کۆیلە کردووە، واتە ژن و ئافرەتانی موسڵمانانیان بە کۆیلە گرتووە، ئەمەش کردارێکی دزێوە. جا شێخ وتویەتی: ((ئەم ڕەخنەگرتنە – واتە وەستانەوە دژی بە کۆیلە کردن – لەسەر بیروباوەڕێکی ڕزیو دامەزراوە، ئەویش بریتییە لە نەدانی حوکمی هاوبەشدانان و بتپەرستی لەسەر هاوبەشدانەران[1]، مەبەستیان لەمەدا ئەوەیە کە ئەوەی بتپەرستی زۆر لەسەر جێبەجێ بووە بتپەرستی نییە،

(١) مەبەست لە هاوبەشدانەران موسڵمانانە، هەروەك ڕوون دەکرێتەوە.

بەوەی هەر کەسێك بڵێ "لا إلە إلا الله" موسڵمانە، ئەمەش لە دووڕوویی و نەزانی مەزن و نەخۆشی دڵ لە ڕووی بیروباوەڕەوە سەرچاوەی گرتووە...)) [٦/ ٢٠٨]. دواتر شێخ ئەو دۆخەی ڕوونکردۆتەوە کە ئەو کەسەی لە ژێر شمشێری ئوسامەی کوڕی زەید موسڵمان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئوسامە ئەوی کوشت، دواتر پێغەمبەری (درود و سڵاوی خوای لێبێ) نکۆڵی لێکرد هەروەك لە بەسەرهاتە ناسراوەکەدا هاتووە، لەسەر وەهابییەکاندا جێبەجێ نابێ، جا شێخ وتویەتی:((ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر "درود و سڵاوی خوای لێبێ" کە فەرموویەتی: ئایا دوای ئەوەی وتویەتی "لا إلە إلا الله" دەیکوژی... ئەم فەرمایشتە لەبارەی کەسێکەوە بوو کە پێشتر شایەتمانی نەهێنابوو))[1]. واتە: بەڵام ئەو موسڵمانانەی وەهابییەکان بە کافریان دادەنێن ئەوا پێش شەڕ شایەتمانیان هێناوە و "لا إله إلا الله"یان وتوە!...

٩- **فەتوایەك دەربارەی دەستبەسەرداگرتنی ماڵ و سامانی موسڵمانان:** کاتێك نەوەکانی ئەوانەی دژی وەهابییەکان بوون داوای ماڵ و سامان و زەوی باوو باپیرانیان کرد لە نەجد – بەتایبەت لە حرمە و ناوچەکانی تری نەجد –،

[1]) ئەمە بەپێی دەربڕینی بوخاری لە سەحیحەکەیدا (٨/ ٣٦)، ئەم بەسەرهاتە لە دەیان سەرچاوەدا هاتووە، لەوانە لە موسنەدی ئەحمەددا هاتووە (٥/ ٢٠٧)، ئەمە وتەی ئوسامەیە: ((پێغەمبەری خوا ئێمەی ...دك پۆلە سەربازێك نارد بۆ حرقات، ئەوان بە هاتنی ئێمەیان زانی و خۆیان ئامادەکرد و هەڵیانکوتایە ...سەرمان و ڕایانکرد، کەسێکیان کەوتە بەردەستمان، کاتێك دەورماندا وتی: "لا إله إلا الله"، لێماندا تا کوشتمان، ئەمە شتێکی لە ناخی مندا دروست کرد، بۆیە بۆ پێغەمبەری خوام باسکرد، ئەویش فەرمووی: ...ە ڕۆژی دواییدا کێ لە "لا إله إلا الله" ڕزگارت بکات؟ ئوسامە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەمەی وت ...ەبەر ترسی چەك و کوشتن، فەرمووی: ئایا بۆچی سینەی ئەوت لەت نەدەکرد، تا بتزانیبا لەبەر ئەمە ...وتویەتی یان نا؟ فەرمووی: لە ڕۆژی دواییدا کێ لە "لا إله إلا الله" ڕزگارت بکات؟، هەر ئەمە دووبارە ...دەکردەوە تا وایلێهات حەزم دەکرد موسڵمان نەبووبام تا ئەو ڕۆژە نەبێ)).

کاتێك داوای ئەم مافانەیان کرد کە وەهابییەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو لە – ڕۆژانی شەڕی یەکەمەدا –، بەوەی گوایە ئەوان هاوبەشدانەرن و ماڵ و سامانیان دەستکەوتی موسڵمانانە!، داواکارییەکە گەیشتە شا و و میری ڕیاز، شا و میری ڕیاز بابەتەکەیان بە موفتی ڕاسپارد، پرسیاریان لێکرد: ((بۆ فەتوادان و ڕوونکردنەوەدان سەبارەت بەو ماڵ سامان و موڵکانەی موسڵمانان بەدەستکەوت گرتوویانە لە کاتی شەڕکردن لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا، دەستیان بەسەردا گرتووە بە حوکمی دەستکەوتی جەنگ، ئایا بۆ کاربەدەستی موسڵمانان دروستە ئەم داوایە فەرامۆش بکات یان دەست لەم موڵکانە هەڵبگرێت))!!، شێخ وەڵامی دایەوە: ((ئەوەی موسڵمانان بەدەستیان هێناوە لە کاتی شەڕکردن لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا، لە دار خورما و کێڵگە و جۆگە و چەم و هاوشێوەی ئەمانە کە بە (خانەی سامان) ناسراوە، ئەوا قەدەغەن و لە هەر وڵاتێکی تریشدا دەستیان بەسەردا بگیرێ بۆ کاربەدەستی موسڵمانان دروست نییە دەستیان لێ هەڵبگرێت، چونکە حوکمەکە وەك حوکمی ئەو شتانەیە کە تەرخانکراوە بۆ ڕزگارکەران! ئەو تێکۆشەرانەی لە دوای ئەوان دێن... )) [٦/ ٢١١]. تا ئەوەی وتی: ((پێشینە چاکەکان لەسەر ئەمە ڕۆیشتوون، پێشەوایانی بانگەواز لە کاربەدەستان و زانایانیش لەسەر ئەمە بوونە، هەر لەسەردەمی شێخ محەممەدی کوڕی عەبدولوەهابەوە تا ئەم کاتە... دواییني ئەم ئوممەتە چاك نابێ بەو شتە نەبێ کە پێشینەکەی پێ چاك بووە))!! [٦/ ٢١٦].

گومان لەوەدا نییە ئەم فەتوایە هەڵەیە، چونکە لەسەر بناغەیەکی هەڵە دانراوە، ئەویش دانانی ئەو موسڵمانانەیە بەبێ باوەڕ. شێخ ڕۆیشتووە تا بەڵگە بهێنێتەوە بە کتێبەکانی ماڵ و سامان و خەراج و کرداری عومەر ڕەزای خوای لێبێ لەگەڵ سامانی کیسرا و قەیسەر! لە کاتێکدا خەڵکی حرمە و مەجمعە هیچ پەیوەندیەکیان نییە بە ئاینی کیسرا و و قەیسەر، بەڵکو

موسڵمانن، شوێن فەتواکانی ئەو زانا حەنبەلییانە کەوتوون کە زیادەڕۆچوونیان کەمترە لە وەهابییەکان؛ واباشتر بوو ئەو پەڕی حوکمی شێخ بۆ ئەوانە ئەوە بوایە کە لە یاخیبووانی موسڵمانان، یاخیبوان سامان و ماڵیان تاڵان ناکرێ و دەستبەجێ برینداریان ناکوژرێن، بەدوای هەڵاتوویاندا ناچێ، ئافرەتانیان بە کۆیلە ناکرێ. پێشەوا عەلی ئەمەی جێبەجێ کردووە لە شەڕکردنی لەگەڵ دژەڕاکانی لە یاخیبوان و خەواریجەکان، هەر بۆیە شافیعی وتویەتی: ((لە ژیاننامەی عەلیەوە زانیمان، چۆن شەڕ لەگەڵ یاخیبواندا دەکرێ، کە ماڵ و سامانیان تاڵان ناکرێ و ... و.... تاد))، هیچ پێویست بە نووسینی دوور و درێژی ئەوە ناکات کە شێخ لە کتێبەکانی خەراج وەریگرتووە لەبارەی سامانی فارس و ڕۆم، مەجمەعە و حرمە و سەدیر لە خوراسان و ڕۆما زیاتر لە ڕیازەوە نزیکن. جا ئەگەر ئەمە حاڵی نەجد بێ؟ لە حیجاز ناوچەی خۆرهەڵات و باشوور؟. هەر خوا بتپارێزێ!

١٠- **ڕا و بۆچوونی دەربارەی ئیبازی و ئەشعەری و شافیعیەکان:** ئیبازییەکان بیدعەچین شایەتی و گەواهیان وەرناگیرێ (١/ ٢٦٧)، ئەشعەرییەکان تاوانکار و لاسارن (٢/ ٢٩٨)، لاسار و تاوانکاریش گەواهییەکەی وەرناگیرێ، شافیعییەکان بە هەمان شێوە، چونکە گۆڕ پەرستن (١/ ٢٥٦).

١١- **حەنەفییە پاشینەکان بیدعەچینە:** حەنەفییە پاشینەکان لە بیدعەدا ڕۆچوون، وەك چۆن جگەلەوانیش تیایدا ڕۆچوون...! (١/ ٢٠١).

١٢- **پێویستە نیوەی شافیعییەکان بکوژرێن:** ئەمەی بە ڕاشکاوانە نەوتوە، بەڵام دەرەنجامەکە ئەوە دەگەیەنێ، پێی وایە دەبێ ئەو کەسە بکوژرێ کە مەبەست و

نیەتی نوێژ بەدەنگ دەهێنێ، ئەمە مەزهەبی زۆرێك لە شافیعییەکانە بە دانپێدانانی خودی شێخ، کاتێك شێخ بینی ئیبن تەیمیە فەتوا دەدات بەوەی ئەوەی نیەت بە دەنگ دەهێنێ دەبێ داوای تۆبەی لێبکرێ ئەگەر تۆبەی نەکرد دەبێ بکوژرێ، شێخ پشتی ئەم فەتوایە هەڵەیەی گرت لە فەتواکانیدا [٢/ ٦٤، ١٨٤]. ئەوەشی زیاد کرد کە هەر کەسێك نیەت بەدەنگ بهێنێ بیدعەچییە.

ئا بەم شێوەیە تەواوی مەزهەبێك بە بیدعەچی دادەنێ، بەهۆی پرسێکی فیقهی سادەوە، کە تیایدا شافیعییەکان لەگەڵ حەنبەلییەکان ڕاجیان. لە میانەی فەتواکەی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم پێم وایە هێرشەکەی بۆ سەر شافیعییەکان زیادە لە قەبارەی خۆیەتی، جارێکیان گۆڕ پەستن، جارێکی تریان دەبێ داوای تۆبەیان لێبکرێ و بکوژرێن! ئایا ئەمە لەبەر ئەوەبووە کە زۆربەی خەڵکی حیجاز و توهامە و یەمەن و عەسیر شافیعی بوونە؟ سەرباری بڵاوبوونەوەی مەزهەبی شافیعی لە شام و میسر، بۆیە هەست بە کێبڕکێ دەکات. بێگومان پێویستە توێژینەوە لەسەر ئەمە بکرێ.

١٣- **شیعە بتپەرستن:** شێخ باسی ئەوەی کردووە کە ئەوان ((هەڵگەڕاوە و بتپەرستن، بەڵام ئەگەر پابەندبوون بە ئیسلام و پیادەیان کرد، وازیان لە هاوبەشدانان هێنا بە ڕووکەش، ئەوا حوکمەکەیان حوکمی دووڕووانە)) [٦/ ٢٠٢]. لە شوێنێکی تردا باسی ئەوەی کردووە کە فەتوایان بۆ شا عەبدولعەزیز داوە شیعەکان ناچار بکەن بەڵێن و بەیعەت بدەن لەسەر ئیسلام! ڕێگری بکەن لە دەرخستنی دروشمەکانی ئاینەکەیان...! [٦/ ٢٠٢]، کاتێك شیعەکان لە ئەحساء داوایان کرد مۆڵەتیان پێبدرێ بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی مزگەوتی گوندەکەیان، شێخ لەم بارەوە فەتوایدا ((بەوەی بۆ شیعە دروست نییە مزگەوت بۆ خۆیان دروست بکەن، تەنانەت ئەوەش نۆژەن بکەنەوە کە لە مزگەوتەکەیان داڕوخاوە)) [٩/ ٥٦

- ٥٧]. شێخ بەوەندەش وازی نەهێنا، بەڵکو سەرزەنشتی پرسیارکەرەکەی کرد کە بەڕێوبەری ئەوقاف بوو، پێی وت: ((لە وتەکەتاندا وا دیارە تەواو خەڵکی ئەم گوندە شیعە بێ، ئینجا پرسیار دەکەن ئایا دروستە مۆڵەتیان پێبدرێ؟!!!))

هەروەها فەتوای ئەوەشیدا کە دروست نییە دادگایان بۆ بکرێتەوە، نابێ دادوەرێك دابنرێ لەوان ئەگەر بۆ یەکلاکردنەوەی حوکمی نێوانیانیش بێ،... دروست نییە دانبنرێ بە دادگایی شیعەدا، ئەگەر لە نێو شیعەکانیشدا بێ، بەڵکو دەبێ ڕەوانە بکرێن بۆ لای شەریعەتی موسڵمانان [١٢/ ٢٧٢، ٣١٩ - ٣٢٢]، شیعە هاوڵاتیەکی ((لەئەستۆگیراوە)) [١٢/ ٣٢٠، ٣٢٢]!!، واتە: بەشێکن لەوانەی لەئەستۆگیراون!، شایەتی و گەواهیان لەسەر ئەهلی سوننە وەرناگیرێ، سەبارەت بە وەرگیرانی شایەتی شیعەکان لەسەر شیعەکان ئەوا ڕاجیایی تێدایە. دروست نییە شیعەکان وەك مامۆستا دەستنیشان بکرێن، تەنانەت ئەگەر لە بابەتە نا ئاینیەکانیشدا بێ... تاد، پلە شەرعییەکانیان بریتییە لە (سەرشۆڕی و شایەنی باس نەکردن و بیرچوونەوەیە)!!! [١٢/ ٣٢٠]. فەتوایدا بە جیاکردنەوەی پیاوی سوننی لە هاوسەرە شیعەکەی [١٠/ ١١٩]، هۆکارەکەشی بەوە داناوە کە: ((شایستەیی ئاینیان نییە، شیعە شایستە نین بۆ ئەهلی سوننە))!!!.

دەڵێم: ئەوەی شایستەیی بە مەرج داناوە ئەوا لە مێرد نەوەك لە ژندا بە مەرجی داناوە، هەر بۆیە شەریعەت بە دروستی داناوە ژنی جولەکە و نەسرانی بهێنرێن، بەڵام شێخ شایستەیی گشتاندووە لەسەر (پیاو و ژنان)!!.

کاتێك یەکێك لە وەهابییەکان پرسیاری لە شێخ کرد: ئایا ڕافیزەکان ماف (شوفعە)یان لەسەر موسڵمانان هەیە؟ دەڵێم: شوفعە هەروەك لە کتێبی (العمدة)دا هاتووە: شایستەیی مرۆڤە بۆ سەندنەوەی بەشی هاوبەشەکەی لە

دەستی کڕیارەکە[1]، شێخ وەڵامی دایەوە: ((بێ بڕوا و کافر شوفعەی لەسەر موسڵمان نییە))!... بەڵکو ئەوەی زیادکردووە ((جا ئەو بێ باوەڕە، بێ باوەڕ و کافری ڕەسەن بێ یان هەڵگەڕاوە یاخود بانگەشەکار بێ بۆ بیدعە!)).

دەڵێم: ئەمە گشت موسڵمانان دەگرێتەوە. لەلای شێخ ئەوەی لە هاوبەشدانانیش سەلامەت نەبێ، ئەوا لە بیدعە دەربازی نابێ، مەگەر وەهابیەکی تەواو بێ. لەسەر ئەمە یەکێتی نیشتمانی چۆن دەبێ؟! سەرباری ئەوەی فەتوای داوە دەبێ کابرای جەعفەری (شیعە) ناوی بگۆڕێ، ئەگەر هاتە سەر مەزهەبی ئەهلی سوننە، هەروەك چۆن هەندێك خەڵك ناوی خۆیان دەگۆڕی کاتێك دەهاتنە ناو ئیسلام...[٦/ ١٦٢]...! بەم شێوەیە.

١٤- **خەڵکی میسر لە ئایین ڕۆیشتوونەتە دەرەوە:** ئەمە باسکردووە لە (١١/ ٤٠)، چونکە ئەوان لە بواری دادوەریدا یاساکانیان لە ٢٢ وڵات وەرگرتووە، تەنانەت لە فەتوای ئیبازییەکانیش وەرگیراوە!! — وەك ئەوەی ئیبازییەکان یەکێك بن لە تاقمە هاوبەشدانەرەکان — ئەوەشی زیادکردووە کە ئەم کارە دژی ((شایەتیدانە لەسەر ئەوەی محەممەد پێغەمبەری خوایە))!، شێخ ڕەخنەی لە خەڵکی میسر گرتووە لەسەر وەرگرتنی بۆچوونی ئیبن تەیمییە لە تەڵاقدا، ئەمە هۆکاری فەتواکەی بووە، باسی ئەوەشی کردووە ئیبن تەیمییە لە هەندێك شتدا هاوشێوەی ڕافیزەکانە! خەڵکی میسر لە ئایین ڕۆیشتوونەتە دەرەوە و شایەتمانیدانیان هەڵوەشاندۆتەوە لەسەر ئەوەی محەممەد پێغەمبەری خوایە... ئەمە بۆچی؟ لەبەر ئەوەی لە حوکمەکانی دادوەریدا لە گشت مەزهەبە ئیسلامییەکانیان وەرگرتووە!!!

(١) العمدة، ١/ ٢٧٢.

١٥- **فرۆشتنی بەرگی کەعبە لە هاوبەشدانانە:** باسی کردووە کە فرۆشتنی بەرگی کەعبە ((یەکێکە لە هۆکارەکان هاوبەشدانان یان لە هاوبەشدانانە، چونکە خەڵکی لە بردنی ئەم بەرگە مەبەستیانە تەبەڕوك بکەن بە جگەلە خوا)) [١٠/ ١٠٢].

١٦- **ئەبو جەهل زاناترە لە زانایانی موسڵمانان سەبارەت بە ئیسلام:** شێخ پێی وایە ئەبو جەهل شارەزاترە لە زانایانی موسڵمانانی سەردەمی خۆی و پێش خۆیشی بە چەند سەردەمێك، جا دەڵێت: ((لەم سەردەمانە و بە چەندین ڕۆژگاریش پێش ئەم سەردەمە، کەسانێکی مێزەر زل بانگەشەی ئەوە دەکەن زانان، بانگەشەی ئەوە دەکەن پارێزەری ئاین لە ئوممەتدا، کەچی ئەبو جەهل لەوان زاناترە، ئەبو جەهل شارەزایە لە مانا "لا إله إلا الله"، کەچی ئەوان نایزانن... بەهۆی ئەوانەوە ڕێزی ئەوانە دەزانی کە ئەبو جەهل لەوان زاناترە)) [١/ ٨٤].

١٧- **تەنها کەسی ئارەزووباز دژی وەهابییەتە:** دەڵێت: ((هەر کەسێك دژی پێشەواکانی بانگەواز بوەستێتەوە، دەبێ ئارەزوو و هەوەسباز بێ، بیەوێ یان نا))! [الفتاوى ٢/ ١٩] ، ئەمە زیادەڕۆچوونە لە پێداهەڵدانی ناوخۆیی.

١٨- **دەرکردنی یەکێك لە زانا زاهیرییەکان:** لە (الفتاوى)دا: موفتی داوای لە وەزیری مەعارف کردووە یەکێك لە زانا زاهیرییەکان دەربکات (زاهیرییەکان لە ئەهلی سوننەن)، ناوی یەعقوب حوسەین معولییە، یەمانی حوسەینینە، لە قوەیعییە مامۆستا بوو، بە ڕای شێخ ناوبراو ((شوێن فەتوایەکی کار پێنەکراو و پێچەوانە کەتووە، کە دژە لەگەڵ ئەوەی فەتوای پێدراوە لە شانشینەکەدا، لەسەر مەزهەبی زاهیرییە... بەمەش بە ئەرکێکی مەترسیدار هەڵدەستێت، کە شوێنەواری خراپی هەیە لەسەر بیروباوەڕ قوتابیان و سەلامەتی سروشتیان...)) [١/ ٢٣]، ئەم داواکارییە لە یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی ١٣٨٩ك بووە.

١٩- **زەیدییەکان ئەرکی دادوەریان پێ نادرێ:** تا مەزهەبە پیسەکەیان بڵاو نەبێتەوە [١٢/ ٣٢٣]! سەبارەت بەو دادوەرە زەیدیانەی ئەرکی دادوەریان گرتۆتە ئەستۆ کە پێشتر چۆڵ کرابوون لە جیزان، ئەوا شێخ پێی وایە لەسەر کار لابدرێن، چونکە ((خەڵکی پیس و پۆخڵن))![١٢/ ٣٢٤]، سەیری یاداشتنامەکەیان ناکرێ کە بۆ "شا" بەرزیان کردۆتەوە، چونکە ((بەرگری لەخۆیان دەکەن))!!

وەك ئەوەی بەرگری لەخۆ کردن تاوان بێ ئەگەر لە بەرامبەر ستەمێك بێ کە سەرۆکی دادوەران ئەنجامی داوە، لە کاتێکدا لێی داواکراوە دادگەری بەرپا بکات.

٢٠- **گەردوونناسەکان دەبێ لە وڵات دەربکرێن:** محەممەدی کوڕی مقرنی کوڕی مشاری ئەمەی باسکردووە لە نامەیەکیدا بۆ شێخ (١/ ٩١)، کاتێك باوکی شێخ لە ژیاندابوو گەردوونناسێك پێشبینی خۆرگیرانی کرد لە ڕۆژی دووەمدا، کاتێك ئەمە ڕوویدا، باوك و مامی شێخ و زانایانی ئەو کات هەڵسان بە دەرکردنی ئەم گەردووناسە لە وڵات! دوای تۆمەتبارکردنی بەوەی ((ئەستێرەناسە)).

بەڵام شێخ نکۆڵی لەم هەواڵە کرد (١/ ١٦٩)، وەك نەریتی خۆیان لە نکۆڵی کردن لەو شتانەی دەکرێ ڕوودەن... هەروەك ئێستا نکۆڵی لەوە دەکەن بەرەنگاری خوێندنی ئافرەتان و دژی هاتنە ناوەوەی داهێنراوە هاوچەرخەکان بووبن.

٢١- **تەبەڕوك کردن هاوبەشدانانە:** باسی ئەوەی کردووە داوای بەرەکەت کردن لە جگە لە خوا هاوبەشدانانە (١/ ١٣٢)،ئەمە گشتاندنی تێدایە، زۆربەی حەنبەلییەکان سەرباری ئەوانی تر پێچەوانەی ئەم تێگەیشتنەیان هەیە، تەبەڕوك دەخوازن لە پیاوچاکان یان خاکی گۆڕەکەیان... تاد، دەبینین چۆن

دواتر شێخ لە پاساو هێنانەوە دەگلێت بۆ حەنبەلییەکان. پوختەکە ئەوەیە تەبەڕوك ڕاجیایی تێدایە لە نێو موسڵمانان و زۆربەی زانایان پێیان وایە دروستە، بەڵکو خودی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پێی وایە دروستە، هەروەك لە توێژینەوەکانی پێشوودا بەفراوانی باسمانکرد. ڕاجیایی لەسەر ئەمە بڵاوبووەوە بەتایبەت لەم کاتانەی دواییدا و لە دوای هاتنی وەهابییەت، کە دروستی تەبەڕوك کردن بنەڕەت بوو لەلای زانایانی پێشینان. لە چەند توێژینەوەیەکی ڕابردوومان‌دا باسمان کردووە کە پێشەوا ئەحمەد و زەهەبی و ئیبراهیمی حەڕەبی و فیقهی حەنبەلی بە گشتی لەسەر ئەوەن کە تەبەڕوك دروستە، بەڵکو هەندێکیان بە باشیان داناوە، کەمینەك لە زانایانی پێشوو کە هەمان ڕا و بۆچوونیان نییە و پێیان دروست نییە، ئەوا بە هاوبەشدانانیان دانەناوە، بەڵکو بە کارێکی بێ کەڵ و ناپەسەندیان داناوە، ئەگەر زیادەڕۆچوونیشی کردبێ و ناوی نابێ بیدعە، من بەلای ڕای شێخدا دەچم لەوەی دەروون تەبەڕوك پەسەند ناکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من بە بیدعەی دانانێم، چ جای ئەوەی بە هاوبەشدانان دایبنێم.

٢٢- **مانەوە لەلای گۆڕ هاوبەشدانانە:** شێخ باسی ئەوەی کردووە تەنها مانەوە لەلای گۆڕ بە پەرستش دادەنرێ، ئەگەر کەسەکە بڕوای وابوو ئەمە کارێکی چاکە یان خێرە و هۆکارێکە بۆ پەرستشێکی مەزنتر، جا – لای شێخ – ئەمەیان نزمترین پلەی گۆڕپەرستییە... کەواتە هاوبەشدانانە...

ئەمەیان پێچەوانەی یەکدەنگییە، مەبەستم لەوەیە کە هاوبەشدانان بێ، بەڵکو زۆربەیان پێیان وایە دروستە، بە حەنبەلییەکانیشەوە، هەشیانە پێی وایە ناپەسەندە، هەشیانە لەوانەیە زیادەڕەوی بکات و بە حەرام یان بە بیدعە

دایبنێ. بەڵام هیچ یەکێك لە زانایانی پێشینان ئەمەی بە هاوبەشدانان دانەناوە، جگە لە وەهابییەکان نەبێ.

بەهەمان شێوە تەبەڕوك کردن بە دەستپێدا هێنان، ئەمەش – لای شێخ – هاوبەشدانانی شاراوەیە، چونکە ئامراز و هۆکارێکە بۆ هاوبەشدانان [١٣٣/١].

دەڵێم: پێشتر وەڵامی ئەمە درایەوە، بەسەرهاتی حەنبەلییەکان لەلای گۆڕی پێشەوا ئەحمەد لە ژمار نایەن، هەر کەسێك کتێبی (مناقب أحمد)ی ئیبن جەوزی و (طبقات الحنابلة)ی ئەبو یەعلای خوێندبێتەوە، دەبینێ زۆرێك لە حەنبەلییەکان – سەرباری ئەوانی تر – دەکەونە ناو هاوبەشدانانەوە، ئەگەر دانمانـا بـە بۆچـوونی شـێخ، بەهـەمان شـێوە ئـەو زانایانـەی لـەلای گـۆڕی پێغەمبەری خوا (درود و سڵاوی خوای لێبێ) و گۆڕی هاوەڵان و پیاوچاکان وەك مەعروفی کەرخی و جگەلەویش ماونەتەوە لە ژمار نایەن؛ ئەگەر وەك شێخ زیادەڕۆیبچین ئەوا هەموو ئەم زانایانە بە هاوبەشدانان تۆمەتبار دەکەین.

٢٣- **هەڵسان بۆ کەسێك بە گەورە گرتنیەتی:** ئەمەش قەدەغەیە (١/ ١٠٩). بەپێی پێوانەکەی شێخ بەگەورەگرتنی بەدیهێنراو هاوبەشدانانە.

٢٤- **ئایا متمانە بەخۆبوون هاوبەشدانانە؟!:** پرسیار لە شێخ کرا لەبارەی وتەی ئەوەی دەڵێ: ((دەبێ متمانە بەخود بکرێ))، وەڵامی دایەوە: ((متمانە بەخۆ کردن پێویست نییە، تەنانەت دروستیش نییە))[١/ ١٧٠]. بەڵگە بە شتێکی زۆر دوور هێناوەتەوە، ئەویش ئەم فەرموودەیەیە: ((بە ئەندازەی یەك چاوتروکانیش بە دەروونی خۆمم مەسپێرە)).

پشت بە خود بەستن جیاوازە لە متمانە بەخۆبوون، ئایەتەکان زۆرن لەسەر باسکردنی خود و پشت پێبەستن و بەرپرسیارێتی پێ سپاردنی: ﴿ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ﴾آل عمران: ١٦٥. واتە: (پێیان بڵێ: ئەوبەڵایە لەلایەن خۆتانەوە توشتان هات ). ﴿ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ﴾النساء: ٨٤. واتە: (ئەو ئەرکە هەر لەسەرشانی خۆتە)... تاد. شێخ بەمە وازی نەهێنا، تا سەرکۆنەی پرسیارکەرەکەی کرد و وتی: ((دەترسم ئەمە هەڵەی تۆ بێ! گومان نابەم مرۆڤێك ژیری هەبێ شتی وابڵێ))!!...

٢٥- **نەفرین کردن بە ڕەهایی لە جولەکە و نەسرانییەکان:** ئەمەی باسکردووە لە (١/ ٦٨). ئەمەی تایبەت نەکردووە بە جەنگاوەر و نا جەنگاوەرەوە. ئەمە پاڵپشتی بەرهەڵستکارانە ئێستا لەبەرامبەر وەزارەتی کاروباری ئیسلامی، بەهۆی ئەمەوە وەزیری کاروباری ئیسلامی کە ئێستا لەسەر کارە – هەر چەندە وەهابیشە – تۆمەتبار کراوە بەوەی وازی لە سەلەفییەت و پەیڕەوی باوو باپیرانی لە پێشەوایانی بانگەواز هێناوە. وەزیری ناوبراویش بوێری ئەوە ناکات بڵێت ئەوانیش مرۆڤن، دەکرێ ڕاست یان هەڵە بپێکن و لەسەرم پێویست نییە پابەندی بۆچوونەکانیان بم... چونکە ئەمە مانای زیادکردنی تۆمەتێکە بۆی بەوەی شوێن ئارەزووەکانی کەوتووە! ئینجا هەر کەسێك ئەم شتانەی بۆ دەستەبەر ببێ مانای وانییە لەسەر هەمان شت بڕوا بەهۆی دەمارگیری یان موزایەدەوە.

٢٦- **نەهێشتنی خانووی ئەرقەم و مزگەوتی بیعە لە حودەیبییە (شوێنەوارەکان):** لە بەرپەرچدانەوەی شێخ بۆ جەمال، ئەوەمان زانی کە خانووی ئەرقەم و

مزگەوتی بەیعە لەناوبردراون لە سەردەمی شێخدا، یەکەم جار ڕادەستی دەستەی فەرمانکردن بە چاکە کراوە، ئینجا کاولکراوە و گۆڕدراوە بۆ شوێنی ڕاگرتنی ئوتومبیل و پیادە. شێخ ڕێگری کردووە لە نووسینی ((خانەی ئەرقەم)) لەسەر باڵەخانەکە (١/ ١٥١). ئەوەشی زیادکرد: ((سەرباری ئەوەی وا دانرابوو ئەم شوێنە خانووێکی ناسراوە، ئەوا تێکدرا و کرایە شوێنی ڕاگرتنی ئوتومبیل و ڕێگەی پیادە!، خوای مەزن خراپە و شەڕی تەبەڕوك و خۆپەیوەستکردنی پێوە لەناوبرد)) [جامع الفتاوی: ١/ ٥٩].

٢٧- **فەتوایەك سەبارەت بە لابردنی مەقامی ئیبراهیم (شوێنەوار):** لە (جامع الفتاوی: ١/ ٦) باسی ئەوەی کراوە کە لە نووسینگەی موفتی فەتوایەکی درێژ بەدەستخراوە بە ناونیشانی ((وەڵامی ڕوون و ڕاست لەبارەی دروستی گواستنەوەی مەقامی ئیبراهیم))!...

٢٨- **بەرگی ژووری پێغەمبەر:** یەکێك لە شتە ناخۆشەکان، ئەوەیە کە گۆڕینی بەرگی ژووری پێغەمبەر دەستاودەستی پێکرا لە نێوان دەوڵەت و زانایاندا، هەر لەسەردەمی شا عەبدولعەزیزەوە تا سەردەمی شا فەیسەڵەوە! واتە: بەدرێژایی ٢٠ ساڵ، دەوڵەت تکای لە زانایان دەکرد مۆڵەتیان پێبدەن بە گۆڕینی بەرگی ژووری پێغەمبەر، دوای ئەوەی بەرگەکە کۆن ببوو و شانشینەکە دووچاری زۆر ڕەخنە بووە، ئەمەش شانشینەکەی خستە سەغڵەتیەوە، بەتایبەت کە دەوڵەتێکی نەوتی دەوڵەمەندە، کەل و پەلەکانی ئەو کەسانەی داهاتیان مام ناوەندە خاوێنتر و نوێترە لە بەرگی ژووری پێغەمبەر، کە لەلای زانایان یەکێك بوو لە گرنگترین پرسەکان، چونکە نوێکردنەوەی بەرگ لەلای ئەوان بە مانای کردنەوەی دەرگایەکی مەزن دێت لە دەرگاکانی هاوبەشدانان! موفتی پێشووتر شێخ

محەممەدی کوڕی ئیبراهیم باسی ئەوەی کردووە شا عەبدولعەزیز داوای لە زانایان کردووە لەم بارەوە فەتوای بۆ بدەن، ئەوانیش بە حەرام بوونی ئەم کارە وەڵامیان داوەتەوە (١/ ١٥٠)،دوای ماوەیەك لە شا سعود داوای فەتوای لە شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم کرد فەتوای بۆ بدات سەبارەت بە ((دانانی بەرگ لەسەر تۆڕی ئاسنینی دەوری ژووری پێغەمبەر))

موفتی کۆبوونەوەیەکی ئەنجامدا لەگەڵ ژمارەیەك لە گەورە زانایانی مەزهەب لە مەککە و لەناویشیاندا: ئیبن باز و ئیبن حەمید و عەبدلەلیکی کوڕی ئیبراهیم و عەبدولەتیفی کوڕی ئیبراهیم و ئیبن دەهیش و عەبدلعەزیزی کوڕی ساڵح و جگە لەوانبڕیاریاندا داپۆشینی گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان و هەڵواسینی ئەم بەرگانە بیدعەیەکی دزێوە بە یەکدەنگی پێشەوایان... ئەمە لە ساڵی ١٣٨١ك بوو)) [١/ ١٤٣].وا دەردەکەوێ کە ئەم فەتوایە سەری کێشابێ بۆ ئەوەی دەوڵەت ئەو بەرگانە دابماڵێ کە بە بەر ژووری پێغەمبەردا کرابوون (١/ ١٤٥)!

بەڵام پرسیارەکە دووبارە لە سەردەمی شا فەیسەڵ هاتە ئاراوە، هەر بۆیە بینیمان موفتی فەتوایەکی نوێیدا بۆ شا فەیسەڵ (١٣٨٥ك) لە حەرامکردنی گۆڕینی بەرگە کۆنەکان بە بەرگی تازە! (١/ ١٤٥). لە فەتواکەدا وادیارە دەیەوێ بەرگەکانی سەرەتا و یەکەم بهێڵێتەوە تا کۆن دەبێ و بەمەش ئیسلام تەواو دەبێ و هاوبەشدانان لادەچی! موفتی بۆ شا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە: ((هەڵواسینی بەرگە نەخشێنراوەکان لەسەر گۆڕەکان، یەکێکە لە دیاردەکانی هاوبەشدانان و شوێنەوارەکانی نەفامی)) [١/ ١٤٥]!. وا دەرکەوت کە فەتواکەی شێخ کاریگەری خۆی هەبوو، بۆیە بەرگە کۆنەکان هێڵرانەوە تا ڕزین و کۆن بوون، شاندەکان و حاجییەکان زۆر ڕەخنەیان لە حکومەتی سعودییە گرت، ئەمەش یەکێك لە بەرپرسانی هاندا (کە ناوی لەسەر نووسراوەکە نەهاتبوو،

لەوانەیە نووسەرەکە شا فەیسەڵ بووبێ، چونکە ناوی کەسی مەزن دەشارنەوە کاتێك دژەڕای موفتی گشتی دەبێ) بۆ ئەوەی "داوا و تکا" لە موفتی گشتی بکات بە زمانێکی خەمبارەوە بۆ ئەوەی دووبارە چاوبخشێنێتەوە بە پرسی بەرگی ژوورەکەی پێغەمبەر، ئەمەش دەقی داواکارییەکەیە: ((بەهۆی دۆخی ئێستای بەرگی ژووری پێغەمبەرەوە زۆر ڕەخنەمان لێگیراوە!، گومان لەوەدا نییە مانەوەی بەم شێوە و دۆخەی ئێستا شەرمەزارکەرە! فەرامۆشکردنی بێ ئەوەی بگۆڕدرێن دەبێتە مایەی ئاژاوە و خراپە!، ئێمە هیچ پێویستمان پێی نییە!، سەرگەردانین لەمەدا لەکاتێکدا جێگرەوەی ئەم بەرگە هەیە!، بۆیە هیوا و تکامان وایە دووبارە چاوبخشێنیەوە بەمەدا بۆ ئەوەی دەرگای ڕەخنە دابخەیت و ڕێگری بکەیت لە زیانگەیاندن لە شکۆ و ناوبانگی شانشینەکە!)) [١/ ١٤٣]... بەڵام شێخ – دوای ئەم تکایەی ئەو بەرپرسە مەزنە – سوربوو لەسەر هەڵوێستی ڕابردووی و وتی: ((لەمەدا هیچمان بۆ نییە جگەلە قەدەغەبوونی ئەمە نەبێ))!!! [١/ ١٥].

دەڵێم: ئایا ئەم هێز و توانایەتان بینیوە کە ئەم ڕەوتە بەدەستی هێناوە؟ ئەم ڕەوتە زۆر بەهێزە، چونکە زیادەڕۆچوون و زیادەڕۆچووان لەلایەن دەوڵەتەوە زۆر کراونەتە ڕێبەر، بە پلەیەك کە دەوڵەت بەهێز و قەبارەیەی خۆی ناتوانێ بەرگێك بگۆڕێ و گەرماوێك دروست بکات! دواتر سەرسوڕمان دەبین لەوەی هێزی ئەم ڕەوتە لە کوێوە هاتووە؟! بۆچی هەمووان ملکەچی دەبن و لێی دەترسن؟.

٢٩- **ڕووخاندنی ئەو بینایەی لەسەر گۆڕی خەدیجە دروستکراوە (شوێنەوار):** لە سەردەمی شێخدا فەرمان دەرچوو بە ڕووخاندنی ئەو بینایەی لەسەر گۆڕی

دایکی باوەڕداران خەدیجەی کچی خوەیلید بووە، شێخیش بەدواداچوون بۆ ئەم بڕیارە دەکان بۆ دڵنیابوون لەوەی کە جێبەجێکراوە (١/ ١٣٦).

٣٠- **هاوبەشدانان لە ناو مزگەوتی پێغەمبەردا!:** زۆر جار وەهابییەت جۆش و خرۆش دەیگرێ بۆ دانی حوکمی هاوبەشدانان بەسەر خەڵکی مەککە و مەدینە و حاجیانی ماڵی خوا و سەردانکەرانی مزگەوتی پێغەمبەر و گۆڕەکەی، ئەم سوربوونە دوور و درێژە لەسەر ئەم جۆرە تۆمەتە گەورانە، هیچ ڕاڤەیەکی نییە جگە لە دەمارگیری نەبێ، ئەمەش دوای ئەوەی دەبینین چۆن پاساو دەهێننەوە بۆ حەنبەلییەکان ئەگەر شتێکیان کرد، شێخی موفتی پێشوو محەممەدی کوڕی ئیبڕاهیم چەندین فەتوای هەیە لە هەمان ڕەگەزی ئەم فەتوایانە و ئەم بۆچوونە زیادەڕۆچووانە لە زیاد لە بابەتێکدا.

یەکێك لە فەتواکانی ناوبراو ئەوە بوو کە خولانەوە بە دەوری ژووری پێغەمبەردا هاوبەشدانانی مەزنە (٦/ ١٣٥)! تێبینی ئەوە بکە کە حاجییەکان ناتوانن بخولێنەوە بەدەوری ژووری پێغەمبەردا، چ جای ئەوەی یەکێك ئەمە بکات، بەڵام ئەم فەتوایەی شێخ لە چوارچێوەی زۆر دەرکردنی فەتوایە سەبارەت بە هاوبەش بڕیاردان لەم بابەتەدا، دواتر ئەگەر خولانەوەش بەدەوری ژووری پێغەمبەردا ئەنجامدرا ئەوا ئەمە نەزانی و هەڵەیە، نەوەك هاوبەشدانان، چونکە هاوبەشدانان مانایەکی تری هەیە.

دواتر دەبینین شێخ ڕوونکردنەوە لەسەر وتەی حەنبەلییەکان لە فیقهدا دەدات: ((دەستهێنان بە ژووری پێغەمبەردا ناپەسەندە))، ئەم ڕێگرییە ڕێژەکەی زیاد دەکات و دەڵێت: ((حەڕامە))، ئینجا زیاتر ئەم قەدەغەبوونە بەرز دەکاتەوە بەوەی دەڵێت: ((ئەمە یەکێکە لە ئامرازەکانی هاوبەشدانان و بۆنی ئەوی لێدێت)) [٦/ ١٣٦]. ئا بەم شێوەیە توانای شتی ناپەسەند لای

حەنبەلییەکان بۆ حەرام و دواتر بۆ هاوبەشدانان لەلای وەهابییەکان بگوازێتەوە.

تێبینی لەسەر وتەی شەرعناسان داوە کە وتویانە: ((دەنگ بەرزکردنەوە لای ژووری پێغەمبەر ناپەسەندە)) بەم وتەیەی: ((بەڵکو ئەمە لە بیدعەوەیە، تەنانەت لە هاوبەشدانانە کە لەوێ پێی هاوار دەکرێ!)) [٦/ ١٣٦]. شێخ ئەوەی ناپەسەندە و هیچ گوناهی تێدا نییە لە مەزهەبی حەنبەلییدا دەگوازێتەوە بۆ ((هاوبەشدانانێك کە خوا لێی خۆش نابێ))، بەم پلەبەندییە خێرایە، تەنانەت لە یەك ڕستەدا!، هاوسەنگی حەنبەلی – ئەگەر هەبوو – ناچار دەکات بۆ بەرز بوونەوە بۆ تەکفیری وەهابی. بەم شێوازە هەڵبەستنە، مەزهەبی حەنبەلی و مەزهەبی وەهابی بەیەکەوە ئاوێتەکران، تا زۆرێك لە خەڵك وا هەستیان کرد یەك مەزهەبن!... لە پێشەکیدا باسمان کردن کە هەر دووکیان کۆکن لە تەکفیردا لە دوو بەشدا (سیفەتەکان) و (هاوەڵان)، بەڵام لە پرسی گۆڕدا ئەوا حەنبەلییەکان سۆفین و وەهابییەکانیش سۆفییەکان کافر دەکەن.

٣١- **پێغەمبەر داوا دەکات شوێنەوار و بۆنی هاوبەشدانان لە دوو حەرەمەکە لابرێن!:**
شێخ سەرنجێکی بۆ شا سعوددا لەسەر هەواڵێك کە ڕۆژنامەی وڵات دەریکردبوو، لەبارەی ئەوەی سێ کەس پێغەمبەریان لە خەودا بینیوە، داوایکردووە شا سعود ئەو بۆنە ناخۆشانەی لە دەوری ژوورەکەی و لەناو مزگەوتەکەیدا هەن لایان بدات. شێخ هەر چەندە زۆر بەرپەرچی ئەوانەی داوەتەوە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکرانەتەوە، بەڵام لێرەدا ئەم هەلەی قۆستۆتەوە بۆ ئەوەی ئەمە بۆ شا شرۆڤە بکات ((گومان لەوەدا نییە ئەوەی ئەم سێ کەسە بینیویانە، ئەگەر ڕاست بێ، ئەوا تەنها مەبەستی لێ بۆن و ئەو شتانەیە کە بەشێکن لە هاوبەشدانان)) [١/ ١٣٧].

دەڵێم: تەنها باسكردنی ئەم خەونە، لەوەی پێغەمبەر داوا و تكا لە شا دەكات، ئەوا بێ رێزیە بە پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ)، دواتر كە شێخ ئەم هەواڵەی قۆستۆتەوە لە وەسفكردنی ژووری پێغەمبەر و مزگەوتی پێغەمبەر بە هاوبەشدانان، جەخت لەسەر كردنەوە بەوەی ((گومانی تێدا نییە)). ئەمەیان بوێریەكی ناشرینە. واباشتر بوو بڵێت – كە دەبێ هەر وا بڵێت – : دەبێ چاودێری هەڵسوكەوتی خەڵك بكرێ لەلای ژووری پێغەمبەر و مزگەوتی پێغەمبەر، ئەگەر كەسانێك سەرپێچیان كرد دەبێ لابدرێن و رێگریان لێبكرێ، جا چ شتی پڕ و پوچ یان دزی یاخود هەڵسوكەوتی نەشیاوی پارێزەرانی گۆڕی پێغەمبەر بێ لە پۆلیس و دەستەكان لەگەڵ سەردانكەرانی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ). پێشبینی و گریمانەكان زۆرن، سەبارەت بە كورت هەڵهێنانی ئەمە لە هاوبەشدانانەدا بەپێی پێناسەی وەهابیەوە ئەوا گونجاو نییە. پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) هەروەك چۆن هاتووە بۆ تێكدانی بتپەرستی ئەوا بەهەمان شێوە هاتووە بۆ ئەوەی رەوشتە بەرزەكان تەواو بكات، لەوانەش (رێزگرتن لە مرۆڤ)، كەچی سوكایەتی كردن بە میوانەكان زاڵە لەوێدا، بۆ زانیاری لە هیچ شوێنێكی دونیادا ئەوەندە سوكایەتی بە میوانان ناكرێ ئەوەندەی سوكایەتی بە میوانەكانی پێغەمبەر دەكرێ، كە هاتوون بۆ سڵاو لێكردنی لە ناو مزگەوتەكە و لە تەنیشت گۆڕەكەی، گەواهییەكانمان بە چاوی خۆمان بینیوە نەوەك بیستبێتمان.

٣٢- **گاڵتەكردن بە دینداران دووڕوویی و كوفرە:** ئەمەیان پەیوەندی هەیە بە دەستەی فەرمانكردن بە چاكە و رێگری كردن لە خراپە كە شێخ دایمەزراند – دواتر قسەی لەسەر دەكەین –، لێرەدا مەبەست ئەوەیە شێخ تێكۆشاوە دژی ئەوەی نكۆڵی لە وەهابییەت یان ئامۆژگاریكەرەكانی یان بانگخوازەكانی یاخود

ڕابەرەکانی دەکات، چەند فەتوایەکی دەست ئەوانەی کە ئەوە دەگەیەنن گاڵتەپێکەر بێ بڕوا و دووڕووە، شێخ باسی کردووە: ((ئەوانەی دەکرێ گاڵتە بەم دیندارانە بکەن لەوانەیە سەر بکێشێ بۆ کوفر و بێ باوەڕ بوونیان)) [١/ ١٧٥].

شێخ کە وتویەتی: (بەم دیندارانە)، لەوەی دیارە مەبەستی وەهابییەتە، ئینجا زیاتر وتویەتی: ((هەر لەبەر ئەمە باوکی شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی حەسەن لە پەراوێزەکەیدا لە سەر کتێبی "التوحید" ئاماژەی بەمە داوە کە دەترسی لەوەی گاڵتەپێکەر ببێتە لە ئایین هەڵگەڕاوە))!! دواتر ئەمەشی وت: ((شتێکی ڕوونە کەسی گاڵتەپێکەر کەوتووە ناو دووڕوویەکی ڕوون و ڕۆشنەوە))!!.

دەڵێم: پاك و بێگەردی بۆ خوا! ئایا گاڵتەپێکردن خراپترە یان تەکفیر کردنی زانایانی مەزهەبەکانی تر و تۆمەتی هاوبەشدانان دانەپاڵیان؟! هەروەها ئەوەی ئەم زانایان نە میراتیان لێ دەگیرێ و نە میرات دەگرن و لێخۆشبوونیان بۆ نییە و بەخشینیان پێ نادرێ، نوێژیان لەسەر ناکرێ، لە گۆڕستانی موسڵمانان نانێژرێن، دەبێ گەواهی بێ بڕواییان لەسەر بدرێ... تاد، لە کاتێکدا ئەوەی ئەم زیادەڕۆچوونەی ڕەتکردبێتەوە یان گاڵتەی بە شێخ و هاوەڵانی کردبێ ئەوا لە نێوان دوو وتەدایە کە سێیەمیان بۆ نییە: یان هەڵگەڕاوەیە یاخود دووڕووە؟!ئایاچیتانەوچۆنبڕیاریبێبەڵگەیوادەدەن؟! ئایا چۆن گاڵتەکردن بە بانگخوازانی وەهابییەت دەبێتە دووڕوویی و هەڵگەڕانەوە و بێ بڕوایی و کوفر، لە کاتێکدا تەکفیرکاری وەهابییەت بۆ دژەڕاکانیان لە زانایانی موسڵمانان پێویستە و پاداشتی لەسەر وەردەگرنەوە، ئەوەش کە نایکات ئەوا گوناهبار دەبێ؟!..

بۆ نموونە: ئێستا کتێبێکم لەبەردەستە، لە چاپدراوە و لە ڕووی ڕاگەیەندنەوە مۆڵەت پێدراوە، لە گشت کتێبخانەکانی شانشینەکە دەفرۆشرێ، ئەمەش ناونیشانەکەیەتی: ((یەکدەنگی پەیڕەوانی سوننەتی پێغەمبەر لەسەر

کافرکردنی سیفەت پەکخەرە جەهەمییەکان))، کە سێ گەورە زانای وەهابی نووسیویانە، هەر کەسێك ناونیشانەکەی بخوێنێتەوە، ئەوا واهەست دەکات کە پرسێکی ئاسانە و تەنها بریتییە لە بابەتێکی مێژوویی مەزهەبی و لەبارەیەوە نووسراوە... نا وانییە... بەهیچ شێوەیەك وا نییە...، بەڵکو ئەم کتێبە لەبارەی کافر کردنی ((عومانییەکان و ئیماراتییەکانە و ئەوانەشە کە ئەوان کافر ناکەن))!،

ئایا دەبینین چۆن بەهۆی ناونیشانەوە هەڵخەڵەتاندن دەکرێ؟.. مەبەست لە ((پەیڕەوانی سوننەتی پێغەمبەر)) بریتی نییە لە ((ئەهلی سوننە))، بەڵکو مەبەست لێی وەهابییەکانە؛ مەبەستیش لە جەهەمییەکان و سیفەت پەکخەرەکان بریتی نییە لە (جەهەمییەکان و سیفەت پەکخەرەکان) – هەر چەندە ئەوانەش موسڵمانن – بەڵکو مەبەست لەوان عومان و ئیماراتە، کە نادرێنە پاڵ ئەم نازناوانە، تەنانەن لەلاشیان گرنگ نییە، بەڵکو زۆربەیان هەر نایزانن و نایانناسن، بەڵام – بێ گومان – ئازار دەخۆن ئەگەر ئەم کتێبە بخوێننەوە. جا پێوانە لەسەر ئەم نموونەیە بکە... زیادەڕۆچووەکانمان بە کەیفی خۆیان تۆمەتی کوفر و حوکمدان بە دووڕووی بەسەر ئەوانە دەدەن کە شتی زیادەڕۆچووان بە نامۆ دابنێ یان نکۆڵی لێ بکات یاخود بەرپەرچی بداتەوە.

٣٣- **فەتوادان بە کوشتنی ئەوەی دەڵێت ئەبو تالیب موسڵمانە:** پرسی ئەوەی ئایا ئەبو تالیب بە موسڵمانی مردووە یان بە بێ بڕوایی، ئەوا ڕاجیایی تێدایە لە نێو ئەهلی سوننە و جەماعەتدا، لەلای ئیمامییەکان و زەیدییەکان ئەبو تالیب یەکێکە لە گەورە هاوەڵان، ئەمە پرسێکی مێژووییە بواری کۆشش تێداکردنی فراوانە، بەتایبەت لە نێوان مەزهەبە سوننیەکان و نا سوننیەکانیشدا، چونکە ناکرێ بەیەکەوە ژیان فەراهەم ببێ، لە کاتێکدا هەر کۆمەڵێك پێی وابێ دەبێ بە

گشتی شەڕ لەگەڵ کۆمەڵەکەی تر بکرێ!، چونکە شیعە ئیمامی و زەیدییەکان بەگشتی پێیان وایە ئەبو تاڵیب موسڵمان بووە، هەروەها هەندێك لە ئەهلی سوننە شتیان نووسیوە لەبارەی بڕوا و ئیمانی ئەبو تاڵیب وەك شێخی مەککە سەید عەبدوڵا دەحلان.

بەهەر حاڵ: وا ڕوویدا یەکێکی شیعە بەناوی (عەبدوڵای خنیزی) لە ناوچەی خۆرهەڵات، کتێبێکی نووسی لەبارەی موسڵمانی ئەبو تاڵیب، قوتابخانەی وەهابییەت کە موفتی محەممەدی کوڕی ئیبراهیم سەرۆکایەتی دەکرد داوای کوشتنی نووسەرەکەی کرد ئەگەر تۆبە نەکات، لیژنەیەکی بۆ پێکهێنرا لە: عەبدوڵای کوڕی حەمید، عەبدولعەزیزی کوڕی ڕەشید، محەممەد عۆدە... بەڵام کابرای نووسەر لە کتێبەکە پاشگەزبووە و خۆی لێ بەری کرد لە ترسی مردنی خۆی، شا فەیسەڵ (کە ئەو کات میری جێنشین بوو) یەکێکی ڕەوانەی لای شێخ کرد و دڵنیایی کردەوە لە تۆبە کردنی ناوبراو. بەڵام شێخ ڕازی نەبوو، بەڵکو لە نامەیەکی بۆ میری جێنشین فەیسەڵ لە ساڵی ١٣٨١ك ڕایگەیاند کە واباشترە عەبدوڵای خنیزی وەك تەمبێکردن بکوژرێ، جا وتی: ((ئەوەی من دەیبینم واباشترە ئەم پیس و پۆخڵە بکوژرێ! بۆ تەمبێ کردنی)).

٣٤- **دەمارگیری تیرەیی و ناوچەیی لە فەتواکانی شێخدا:** هەر چەندە دوو دڵ بووم لە نووسینی ئەم بڕگەیە، ئەمەش وەك پێداگیری کردن لە ورژواندنی ئەم پرسە، بەڵام بەهۆی زۆری ڕێژەکەی لە فەتواکانی شێخدا وای لێکردم پێم وابێ نووسینی ئەمە ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی زیادەڕۆچوون ڕۆڵێکی مەزنی دەبێ لە لاوازکردنی پەیوەندی نێوان ناوچەکانی شانشینەکە، لەوانە ڕق و تووڕەیی لای ئەو ناوچانەی سەر بە نەجدەوە نین زیاتر بوروژێنێ، بەوەی پێیان وایە زانایان و ئەندامانی دەستە و دادوەرانی خەڵکی نەجد زۆر سنوور دەبەزێنن لە

سەرزەنشتكردنی ناوچەكانی تر و بە گەوج و سوك دانانی. ئەمە هەستێكی گشتییە ناكرێ فەرامۆش بكرێ، بەتایبەت ئەگەر بەڵگەكانی دەركەوتن. شێخ لە فەتوا و ڕا و بۆچوونەكانیدا بەشێكی لەم ناوچەگەریەی بەردەكەوێ، بەڵكو زۆربەی زانا وەهابییەكان بەشێوەیەكی گشتی دەروونیان كراوەیە لەبەردەم تۆمەتباركردنی هاوڵاتیانی ناوچەكانی تر بە هاوبەشدانان یان بیدعەچێتی جگە لە ئیبن باز نەبێ ڕەحمەتی خوای لێبێ.

جا ئەگەر خەڵكی دوو حەرەمە پیرۆزەكە بە هاوبەشدانانی مەزن تۆمەتبار بكرێن، ئەی چی سەبارەت بە خەڵكی ناوچەكانی تر (لە توێژینەوە پێشووەكانمدا چەند دەق و گەواهییەك خرانەڕوو لەسەر ستەمی وەهابییەكان بەرامبەر خەڵكی دوو حەرەمەكە، تەنانەت هەندێكیان دەڵێن: ئاینی ئیسلام و ئاینی خەڵكی مەككە! وەك ئەوەی خەڵكی مەككە ئاینێكی تریان هەبێ جگە لە ئاینی ئیسلام، گەواهی و بەڵگەكانم لە توێژینەوەكانی پێشوودان)، هەر كەسێكی خەڵكی حیجاز یان مەككە كە ئەم كتێبە دەخوێنێتەوە، ئەوا پێشبینی ئەوەی لێدەكرێ هەست بكات بەوەی زانایانی قوتابخانەی نەجدی بە ئاسایی تۆمەتی مەزن دەبەشنەوە بەسەر خەڵكی شاری ئارام (البلد الأمین)، دەبێ ئەمە بە دەوڵەت گەیشتبێ، كە كار دەكات لەسەر هەڵوەشاندنەوەی كۆمەڵگە. لەبەر ئەوەی گەواهییەكان بە شێوەیەكی گشتی لەبارەی سەرزەنشت كردنی خەڵكی دوو حەرەمەكە و حیجاز خرانەڕوو، ئەوا گەواهی تریش دێن لە دژی ناوچەكانی تر، بۆ زانیاری شێخ دژی ئەمەیە كاتێك شتەكە بە نەجدەوە پەیوەست دەبێ، جا وتویەتی: ((هیچ پابەندبوونێك لەسەر خێر و چاكە وەك پابەندبوونی خەڵكی نەجد نەبووە))! [١/ ٧٣].

دەڵێم: ئەمەیان گشتاندنێكی زۆر سەیری تێدایە، ئەم ستایشكردنەی بە كات و سەردەمێكەوە بەستۆتەوە، كە (لم) بەكارهێناوە: مانای ڕابردوو

دەگەیەنێ، بەمەش لە ڕووکەشی دەربڕینەکەدا وا دەردەکەوێ کە خەڵکی نەجد لە سەردەمی جێنشینە سەرڕاستەکان، تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەریش باشتر بووە. بەڵام ئێمە پابەند نابین بەو دەرەنجامە، هەر چەندە دەرەنجامەکانی شێخ و قوتابخانەی وەهابییەت گەلێك زۆرن.

وا لەپێشتر بوو زانایان پێشەنگ بووبان لە یەکسانی نێوان هاوڵاتیان و ناوچە و تیرە و هۆزەکاندا، بەداخەوە تەنانەت ئەمە لەسەر ئاستی تیۆری بوونی نییە، پرسیار لە محەممەدی کوڕی ئیبراهیم کرا لەبارەی ((گەورەیی بەپێی تیرە یان هۆز یاخود شار یان کار))، خۆی لە وەڵامەکە لادا و وتی: ((ئەم لێکۆڵینەوەیە زۆر سوودی تێدا نییە))! [٦/ ١٦٤]. لەگەڵ ئەوەی وەڵامەکە ئاستە و لەسەر زمانی حوکمڕانە سعودییەکان دووبارە دەبێتەوە لە جیاوازی نەکردندا، وا باشتر و لەپێشتر بوو شێخ ئەوە بڵێ کە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾ الحجرات: ١٣. واتە : ( بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خوا ترسە و فەرمانبەرداری خوایە ) ،

هەروەك پێغەمبەریش فەرموویەتی: ((عەرەب بەسەر نا عەرەب، سپی پێست بەسەر ڕەش پێستدا هیچ پلەو پایەیەکی نییە مەگەر بە لەخواترسان نەبێ))، لە مێژووی ئیسلامدا بەڵگە بهێنێتەوە بە پێگە و پلەوپایەی بیلالی حەبەشی و سەلمانی فارسی و سوهەیبی ڕۆمی بەسەر ئەبو لەهەبی هاشمی و ئەبو جەهلی مەخزومی و ئەبو سوفیانی ئەمەوی... شەرع جەختی کردەوە لەسەر تواندنەوەی جیاوازییە نەفامییەکان، بەڵام شێخ وەڵامێکی دایەوە، کە بۆنی ئەوەی لێی دەکرێ پێی وایە گەورەیی و پلەوپایەداری بە ناوچە و تیرە و ئەرك و کارە. ئەم بەچاکتر دانانە لە فەتواکانیدا دیارە، ئەمە یەکێکە لە

گـەورەترین هۆکارەکـانی لاوازی یـەکێتی نیشـتمانی، ئەگەرچـی زمانلوسـان ماستاوچێتی بکەن.

**نەجـد و خـەڵکی نەجـد:** باسی ئـەوەمان کـرد کـە شـێخ زۆر ستایشی نەجدی کردووە، ئەمەش ماڧ خۆیەتی، بەڵام پێویستە ئەمە بەبێ زیادەڕۆچوون بێ، یان بەلایەنی کەمەوە بەبێ هێرشکردنە سـەر ناوچـەکانی تـر بـێ، زیـادەڕەویش لـە بەرگری کردن لە نەجدییەکان نەکرێ، شێخ – وەك پێشتر خرایەڕوو – باسی ئەوەی کردووە هیچ یەکێك وەك نەجدییەکان پابەندی خێر و چاکە نـەبووە و ڕانەهاتووە لەسەری، پاساوی هێنایەوە بۆ تاشینی سەریان، لە سەردەمی دەوڵەتی یەکەمی سعودیەدا (٢/ ٤٤)، ووتی: سەر تاشـین کـە نیشـانەیەکی خەواریجەکانـە، مانای ئەوە ناگەیەنێ خەڵکی نەجدیش خەواریجن. دەڵێم: ئەمـە ڕاسـتە، بـەڵام سـیفەتەکانی تـری خـەواریج لـە تـەکفیر کردنـی موسـڵمانان و جێبـەجێکردنی ئایەتەکانی هاوبەشدانەران لەسەر موسڵمانان و دەرکەوتن لە لای ڕۆژهەڵاتەوە... تاد، هەموو ئەوانە لە وەهابییەتدا هەن.

بەهەمان شێوە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ وەهابییـەکان خـەواریجن – وەك چۆن شێخ وتی –، بەڵام چەندین سیفەتی خەواریجیان تێدایە، ئەگەر ئـەم سـیفەتانە لـە جگـە لـە خـەڵکی نەجـددا کۆبووبانەوە،ئـەوا شـێخ فـەتوای خەواریجبوونی بۆ ئەوان دەردەکرد، وەهابییـەکان ڕیش تاشـینیان بـە نیشـانەی ژنانی بوون، تەبەڕوکیان بـە نیشـانەی هاوبەشدانانی مـەزن دانـاوە! ئایـا بۆچـی ناچارکردنی خەڵکە لەسەر سەرتاشین و تەکفیر کردنی موسڵمانان و شەڕ لەگەڵ کردنیان و بەپێویست دانانی کۆچـکردن بـۆ درعییـە...تـا، گشت ئەمانـە بۆچـی نابنە نیشانە لەسـەر ئـەوەی وەهابییـەکان درێـژبووەوەی خەواریجـەکانن، مـادەم گشت موسڵمانانی تر درێژبووەوەی بێ بڕوایانی قوڕەیش بن!؟! لێرەدا پرسـەکە پەیوەستە بە دوو ڕوویی و بێ لایەن نەبوونەوە.

لێرەدا پرسێکی سەرسوڕهێنەر هەیە، ئەویش ئەوەیە کۆمکاری (الفتاوى) زۆربەی جاران ناوی ئەو کەسە نەجدیانە دەشارێتەوە، کە بە خراپە باسیان کراوە لە فەتواکانی شێخدا، بۆ نموونە: یەکێکیان دەستگیر بکرێ لەسەر کارێکی خراپ... بێگومان ئەمەیان باشە ناوی نەهێنرێ و داپۆشینی موسڵمانە، بەڵام ئەوەی پەیوەستە بە ناوچەکانی ترەوە، ئەوا ناوی کەسەکان دەهێنرا کە تاوانی مەییخواردنەوە و نوێژنەکردن و کوفر و زینایان ئەنجامدا بوو، مەگەر بە دەگمەن نەبێ. دەمارگیری گەیشتووەتە کۆکەرەوەی (الفتاوى)، وەك ئەوەی خەڵکی ناوچەکانی تر ناوی باووباپیرانیان لە مرۆڤەکان نەبووبن، ئا بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە باپیرەی فڵان لەسەر مەیی خۆری قەمچی لێدراوە، فڵانە بەندکراوە لەسەر ماددەی هۆشبەر، فیساریش قەمچی لێدراوە، فڵانە لەلایەن محەممەدی کوڕی ئیبڕاهیمەوە قەمچی لێدراوە! سەبارەت بە خەڵکی نەجد ئەوا خەریکە ناوی هیچ یەکێکیان نەبینینەوە، مەگەر لە چەند پرسێکدا نەبێ کە زیان بە شەرمیان ناگەیەنێ.

سەبارەت وتەی شێخ دەربارەی شوێنەکانی تر و وەسفکردنی بە هاوبەشدانان یان بیدعە یاخود نەزانی و جگە لەمانەش ئەوا گەلێك زۆرن، با چەند نموونەیەك وەربگرین.

**ناوچەی خۆرهەڵات:** گشت ئەو فەتوایانەی دژی شیعە و شافیعییەکان دراون زیاتر سەرزەنشتی ناوچەی خۆرهەڵات دەکەن، لایەنێکی ترسناکمان لێ باسکردووە. بۆ نموونە وتویەتی: ئەوان بتپەرستن، سەربڕاوەکانیان حەڵاڵ نین، گەواهی و شایەتیەکەیان وەرناگیرێ، شوفعەیان بۆ نییە.. تاد.

**حیجاز و خەڵکەکەی:** پێشتر ئاماژەیان پێکرا، کاتێك قسەکرا لەسەر خەڵکی دوو حەرەمەکە و وەسفکرانیان بە هاوبەشدانان، جا ئەوەش کە پەیوەست بوو بە شوێنەوارەکان و بەرگی ژووری پێغەمبەر و لابردنی مەقامی ئیبڕاهیم و

بەرگی کەعبە و هاوشێوەی ئەمانە هەموویان دەڕژێنە ناو سەرزەنشتی حیجازەوە، بەتایبەت لەگەڵ کافر کردنی سۆفییەکان و شافیعییەکان و ئەشعەرییەکان یان بەلایەنی کەمەوە بەبیدعەچی دانانیان و حوکمدان لەسەریان بەوەی پێشنوێژی کردنیان پەسەند نییە و سەربڕاوەکانیان ناخورێن، گەواهییەکانیان وەرناگیرێن... تاد، ئەوانە (سۆفییەکان – شافیعییەکان - ئەشعەرییەکان) هەمووان خەڵکی حیجازن.

**سەبارەت بە ناوچەی باشوریش:** بەشی خۆی وەرگرتووە لە وەسفکرانی بە هاوبەشدانان و نەزانی... بینیمان شێخ چ تێکگیرانێکی هەبوو لە فەتوادان لەبارەی (حوکمی ئەوەی تانە لە ئاینی کەسێك بدات)، کەسێکی لە حیجاز بەبێ تاوان دانا، حوکمی لەسەر کابرای سامتەدا بە هەڵگەڕانەوە، لەگەڵ ئەوەی کاری هەر دووکیان هەر یەك شت بوو. هەروەها دەبینین لەبارەی پارچەیەکی کانزایی کە چەند ئایەتێکی قورئانی لەسەر نووسرابوو، ئەوا شێخ نامەیەکی بۆ وەزیری داد نارد، وەك وەڵامی ئەم پرسیارەی کە کردبووی: ئایا دروستە وەك چاوزار بفرۆشرێ، وەڵامەکە دوور و درێژ بوو، ئەمەی تیایدا هاتبوو: ((بەم پێیە دەبێ فرۆشتنی قەدەغە بکرێ، نابێ خەڵك بەکاری بهێنێ و ڕێگریان دەبێ لێبکرێ، ئەوەشی کە لە بازار نمایش دەکرێ، ئەوا دەبێ دەستی بەسەردا بگیرێ، بەتایبەت لەو شوێنانەی هاوشێوەی باشور، کە زۆربەی خەڵکەکەی نەزانیان بەسەردا زاڵە سەبارەت بە پێویستییەکانی شەریعەت و تەواو بەرپاکردنی یەکخواناسی و کاملییەکەی)) [١/ ٩٨]..

بۆ شا فەیسەڵی نووسی، دەربارەی پێویستی سزادانی خراپەکاران و تاوانکاران – وەك: مارەیی زۆر، دواخستنی خەتەنەکردن – لە خەڵکی توهامە بۆ ماوەی دوو مانگ و هەروەها سزادانی قەحتانیەکانیش، بۆ ئەوەی تەمبێ بکرێن و خەڵکی تری پێ چاوترسایی بکرێ!، چونکە لە نەزانیدا تێوەگلاون و

کەسێکیان تێدا نییە کە قورئانخوێن بێ... (٢/ ٤٢). دەڵێم: نکۆڵی کردن لە خراپە، هیچ کەسێك نکۆڵی لە پێویست بوونی ناکات، بەڵام ئەم خراپانە تەنها لە باشور بوونیان نەبووە، دروستیش نییە سزاکان تەنها لەسەر ئەوان جێبەجێ بکرێ بۆ ئەوەی ببنە پەند بۆ ئەوانی تر!.

لە نووسراوێکی شێخدا بۆ سەرۆکی دەستەی فەرمان کردن بە چاکە (٢/ ٢٥١) هانی داوە لە دژی تیرەکانی لەیس، لەبەر ئەوەی ئەوان – بەپێی وەسفی شێخ – لە شەوی نیوەی مانگی شەعبان کۆدەبنەوە و ئاژەڵ سەردەبڕن بۆ جگە لە خوای گەورە گولەی ئاگرین دەتەقێنن و پیاوان و ئافرەتان تێکەڵی یەکتر دەبن!. لەسەر گشت لایەنە بەرپرسەکانی ئەوێ لە میرنیشین و دەستە و دادگای پێویست کرد، کار بکرێ لەسەر لەناوبردنی ئەم دەر و نەخۆشییە، نابێ بەوە واز لە هاوڵاتیان بهێنن کاتێك دەڵێن ((وازمان لێهێناوە))!...

دەڵێم: تێکەڵاوی ئافرەتان و پیاوان تا سەردەمێکی زوو بوونی هەر هەبووە، بەڵام ئەوەی شێخ باسی کردووە، لە کۆبوونەوە لە شەوی نیوەی مانگی شەعبان و سەربرینی ئاژەڵ بۆ جگە لە خوا! ئەوا ئەمە گومانی مەزنی تێدایە، بەتایبەت کە ئەم نووسراوە بەروارەکەی بۆ ١٣٨٨ك دەگەڕێتەوە، بەدووری نازانم یەکێك لە وەهابییەکانی ئەوێ ئەمەی هەڵبسەتبێت، یان گەورەی کردبێت، بەهۆی ئەوەی زانیویەتی ئەم هاندانە گوێ بۆگری هەن لەلای موفتی گشتی، چاوەکان بەڕوووی ئەم ناوچەیەدا دەکرێنەوە بە ئامۆژگاری و ڕێنیشاندان و ڕێگە گرتن لە داب و نەریتە تیرەییەکانی وەك: تێکەڵاوی (کە هیچ دەقێك نییە قەدەغەی بکات، بەڵکو ئەمە بنەڕەتە هەر لە سەرەتای ئیسلامیشەوە).

کاتێك هاوڵاتییەکان زەهرانی باشورەوە سکاڵایەکی بەرزکردەوە بۆ شا سعود (٢/ ٢٨١) دژی دادوەری زەهران و سەرۆکی دەستەوە، ئەمەش دوای ئەوە دادوەر حوکمی (٢٠) ڕۆژ بەندکردن و چل قەمچی بەسەردا سەپاندبوو، پرسەك لەلایەن

شاوە گوازرایەوە بۆ لای موفتی، موفتی نامەی بۆ دادوەرەکە نووسینی سەبارەت بە ڕاستی ڕووداوەکە، دادوەرەکە گومانی وابوو سکاڵاکارەکە: ١. ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ نابێ ٢. نکۆڵیکارە ٣. ڕاستی ڕەت دەکاتەوە ٤. ئامۆژگاری پەسەند ناکات ٥. سوکایەتی بە ئامۆژگاری کاران دەکات ٦. بە ئاشکرا گوناه دەکات (دادوەر جۆری گوناهەکەی ڕوون نەکردەوە)... بەم پێیە شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم نامەی بۆ شا نووسی بەوەی: ((ئەوەی سکاڵاکار خستوویەتیەڕوو هیچ ڕاستییەکی بۆ نییە، بەڵام مەبەستی بوو ڕاستی بە نا حەق پوچەڵ بکاتەوە، بۆیە دەبێ بڕیاری دادوەر جێبەجێ بکرێ و ئاوڕ بۆ ئەوەی نەدرێتەوە کە سکاڵاکار بتسی کردووە))!

دەڵێم: بڕواننە ئەم سکاڵاکارە، کە بڕیاری چارەی خۆنووسینی گێڕاوەتەوە بۆ لای ئەوەی ماق ئەوی خواردووە، واتە خودی موفتی!، موفتی داوای لە وەزارەتی داد نەکردووە لێکۆڵینەوە لە بابەتەکەدا بکەن و بانگی گەواهیدەر بکەن بۆ سکاڵاکارەکە و لەسەر بابەتەکە... تاد، کە دەبوایە لە ژێر سایەی لایەنە چاودێرییە دادوەرییەکان ئەنجام بدرێت. هەروەها لەبەر ئەوەی سکاڵاکارەکە ڕاستەوخۆ سکاڵاکەی بۆ لای شا بەرزکردەوە و داوای مافەکەی کرد، ڕێوشوێنەکان بەبێ گومان هەڵە بوون، چونکە پرسیار لە دادوەرەکە کرا، دەبێ ئەم دادوەرەش پاساو بۆ حوکمەکەی بێنێتەوە و تۆمەتەکان فراوان بکات و لەوانەشە زیادیان بکات. بەڵام وتەی دادوەری گوێ بۆگری هەبوو و دانی پێدانرا بەبێ گومان و دوودڵی لەلایەن موفتیەوە، موفتی فەتوای دا بە ڕاست و دروستی دادگاییەکە بەبێ گوێگرتن لە سکاڵای سکاڵاکار و بەڵگەکەی لەسەر ماف خوراویەکەی، هەروەك وەڵامدانەوەکەی دادوەر هیچ بەڵگەیەکی تێدا نەبوو لەسەر ڕاست و دروستی تۆمەتەکان. کە سکاڵاکار داواکاری و سکاڵاکەی بۆ لای خودی شا بەرز کردۆتەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسێکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو لەوانەیە

بەنـدکردن و قەمچـی لێـدانی بـەهۆی بۆچـوونێکەوە بـووبێ. دواتـر نوێـژی بەکۆمەڵ سوننەتە لای زۆربەی زانایان، بۆیە دروست نییە هیچ کەسێکی لەسەر سزا یـان تـەمبێ بکرێ، چونکە یەکـەم یـان بەلایـەنی کەمـەوە ڕاجیـایی تێدا. دووەمیان پەیوەندی بە مافی ئەوانی ترەوە نییە، سەرکۆنەکردن و تەمبێکردن لە نموونەی ئەم شتانەدا نییـە، زانـا حەنبەلییـەکان و لەناویشیاندا ئیبن تەیمییـە بەدەق وتویانە: ((سەرپەرشتیاری فەرمانکەر بە چاکە و ڕێگریکـەر لـە خراپـە، بۆی نییە خەڵك بە زەبر و زۆرەملێ بهێنێتە سەر بۆچوونی خۆی)).

٣٥- **فەتوایەك سەبارەت بە نە سوڕانەوەی زەوی** (٢/ ١٨٢).

٣٦- **نەصب:** بریتییە لـە لادان لـە ڕێبـازی محەممـەد (درود و سڵاوی خـوای لێبێ) و خانەوادەکەی، پشتکردن لە مافەکانی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) زۆر ڕوونە، گەلێك هۆشداری دراوە لـە پەرستنی تەنانـەت وایلێهاتووە ئەگـەر باسـی گـۆڕ و مزگـەوت شـوێنی جەنگـەکانی کـرا، ئـەوا تـەنها هاوبەشـدانانمان بـیر دێنێتەوە!!!، کەچی دڵخۆش دەبین ئەگەر کۆشکی فڵان حوکمڕانە یان گۆڕەپـانی جەنگەکەی بزانین لەگەڵ فیساردا.

ئەمە وشك و ڕەقی و خواردنی مافی پێغەمبەرە (درود و سڵاوی خوای لێبێ)، سەرباری بڵاوکردنـەوەی هۆشـداری بـەردەوام بـۆ ئەوانـەی ئاهـەنگ دەگێـڕن بـە بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە یان ئیسرا و میعراج یاخود یادی کۆچ کردن لە مەککەوە بۆ مەدینە، تۆمەتبارکردنی ئەو کەسانەی بیر لەم ئاهەنگە دەکەنـەوە بە بیدعەچێتی... تـاد، تەنانـەت یـادی ئـەم بۆنانـە لای وەهابییـەت وایلێهاتووە تەنها بریتییە لە بۆنەیەك لە بۆنـەکانی بڵاوبوونـەوەی هاوبەشـدانان و بیدعـە! گشت ئەمە پێشێلکردن و مافخواردنە، لـە کۆنـەوە ئەمـە پێـی دەوتـر (نەصب)،

خالیدی کوڕی سەلەی مەخزومی — یەکێکە لەوانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە — ئەو شیعرانەی بۆ بەنو ئومەییە دادەڕشت کە بێ بڕوایانی قوڕەیش بەهۆیەوە جنێویان دەدایە پێغەمبەر، بۆیە تۆمەتبار کرا بە نەصب، واتە: پێشێلی مافەکانی پێغەمبەری کردووە. هەر کەسێکی مەزن — پێغەمبەریش گەورەترین کەسە —حەز ناکات ئێش و ئازار و جنێو و تانە و کەم و کورتی تووشی خانەوادەکەی ببێ، ئەمەش بێ زیادەڕۆچوون تیایاندا. هەر لەبەر ئەمە وەهابییەکان لە پاڵ پێشێلکردنی مافەکانی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) هەڵسان بە پێشێل کردنی مافی خانەوادەکەی و بەتایبەتی کەسە تایبەتەکانی (عەلی و حەسەن و حوسەین و فاتیمە)؛ هێشتا شیعە بە خەفەتەوە باسی بەسەرهاتی تێکدرانی گۆڕی حوسەین دەکەن لەلایەن عەبدولعەزیزی کوڕی محەممەدەوە. ئەوەندە بەس بوو ناوبراو بانگی شیعەکان بکات بە دانایی و ئامۆژگاری چاك بۆ واز هێنان لەو بیدعانەی دەیانکرد و گوێی لە بەڵگەکانی ئەوانیش گرتبووبا.

بە هەر حاڵ: شێخ فەتوایدا واباشترە واز بهێنرێ لە وتنی گوزارشتی ((گەورە و سەروەرمان پێغەمبەری خوا)) (١/ ١٩٥ - ١٩٦)، (ئەمەش بۆ پاراستنی یەکخواناسی)!!، لە نامەیەکیدا بۆ یەکێك لە میرەکانی قەتەر جەختی لەسەر ئەمە کردەوە (٣/ ١٨)، مەبەست لە (ئالی محەممەد) گشت ئوممەت، بەپێی ڕای پەسەند و بەهێز (٢/ ٢٢٢)، واتە لای شێخ (ئالی محەممەد عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەین نین)، ئەمە لای ئەو ڕای لاوازە. بەڵام ئەگەر شتەکە پەیوەست بوو بەبێ بەشکردنەوە، ئەوا وەهابییەت زۆر باش (ئالی محەممەد) دەناسێ! ئەگەر ئەو فەرموودەیان شرۆڤە کرد ((سەدەقە بۆ ئالی محەممەد حەڵاڵ نییە))، ئەو کاتە نالێن: سەدەقە بۆ گشت ئوممەت حەڵاڵ نییە بەپێی ڕای پەسەندا!.

دواتـر بینیمـان زۆربـەی وتـەکانی شـێخ لـەبارەی پلەوپایـەی ئالوبـەیت، هۆشـداری دانبـووە لـە زیـاد خۆشویسـتنیان (٢/ ٢٥٤)، هـەروەك هـەمان شـت سەبارەت بە پلەوپایەی پێغەمبەر هەیە، وەهابییەکان هۆشداری دەدەن لە زیـاد خۆشویستنی پێغەمبەر، تا وا بەخـەیاڵی خوێنـەردا هاتووە کە باشـترە: (مـرۆڤ هەڵوێستی وابێ، نە خۆشی بوێ، نە ڕقیشی لێ ببێتەوە)!.

دواتر دەبینین شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم نکـۆڵی دەکات لە ڕێگـری کردنی خانەدانەکان لە بەشوودانی کچەکانیان و مارەکردنیان لە جگە لە خۆیان، بـەپێی ڕەچـاوکردنی شایسـتەیی ڕەچـەڵەك، زۆرتـر تۆمـەتباریان دەکـات بـە لوتبـەرزی و خۆبەگـەورەزانی – فەتوایەکـە باشـە بـێ تۆمـەتبارکردن –، بـەڵام ئەگەر یەکێك لە تیرەکانی نەجد هەڵسا بە بەشوودانی کچەکەی و مارەکردنی لە کەسێك کە تـیرە ڕازی نـەبێ بـە لێهاتوویەکـەی لـە ڕەچـەڵەکدا، ئـا لێـرەدا شـێخ نکـۆڵی لـەم ((خۆبـەزلگر و لوتبەرزانـە)) ناکـات، بـەڵکو فـەتوا دەدات بـە هەڵوەشـاندنەوەی گرێبەسـتی هاوسـەرگیری، بـەهۆی شایسـتە نـەبوون لـە ڕەچەڵەکدا!! (ئەمەیان لە بەشی تێکگیرانی بۆچوونەکانی شێخدا دەخرێتەڕوو). پێشتریش فەتواکەی خرایەڕوو لەسەر کوشتنی ئەوەی پێی وایە ئەبو تاڵیـب بـە موسڵمانی مردووە (لەگەڵ ئەوەی ئەمە پرسێکی مێژووییە، فەرموودەکان تیایدا تێکگیراون، دیوانی چاپکراوی ئەبو تاڵیب گەواهی موسـڵمانبوونی ئـەو دەدات). گشـت ئـەم شـتانە و هاوشـێوەکان لـە ناصـیبایەتیەوەیە، واتـە: پێشـێلکردنی مافەکانی محەممەد و ئالی محەممەد.

٣٧- **جەستەدارکردن :** شێخ پێی وایە پێگەی سوپاسکراو (المقام المحمود) بریتییـە لـە دانیشاندن لەسەر تەخت و عەرش! (٢/ ١٣٦). واتە دانیشاندنی پێغەمبـەر (درود و سڵاوی خـوای لـێبێ) لەسـەر عـەرش!، ئەمـە بیروبـاوەڕی مـەروەزی حەنبـەلی قوتابی ئەحمەدە، خەڵکی پێی تاقیکرانەوە لە بەغداد، قوتابیەکانی شوێن پێـی

ئەویان هەڵگرت وەك: خەلال و دواتر بەربهاری، پاشان بەهۆی ئەم بیروباوەڕە پوچەڵەوە ئاشوب و فیتنە بەرپابوون، لەکاتێکدا هیچ فەرموودەیەکی ڕاست و دروستی تێدا نەهاتووە. ئەوەی ڕاستە ئەوەیە پێگەی سوپاسکراو (المقام المحمود) بریتییە لە تکاکردن (الشفاعة)، هەروەك زۆربەی ئەهلی سوننە ئەمە بۆچوونیانە؛ ئەم بۆچوونە لە ناو حەنبەلییەکاندا هەبوو، دواتر لە ناوچوو، بەڵام شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم دووبارە زیندووی کردەوە.

٣٨- **پێشەوایەتی ئەشعەری دروست نییە:** چونکە گوناهکار و لاسارە (٢/ ٢٩٨). لەگەڵ ئەوەی زۆربەی موسڵمانان لە ئەهلی سوننە ئەشعەرین.

٣٩- **بیدعەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر:** هەڵمەت دژی ئەم یادە و ئەوانەی ئاهەنگ دەگێڕن بەم بۆنەیەوە، لە زۆربەی فەتوا و وتار و هۆشدارییەکاندا هات... گوایە بیدعە و داهێنراوە و خۆچوواندنی تێدایە بە هاوبەشدانەران... تاد، (٣/ ٤٨، ٥٢، ٥٤، ٦٣، ٦٤، ٦٥... تا ٩٥ و لاپەڕەکانی تریش)، زۆر هەوڵی داوە و خۆی ماندوو کردووە بۆ دوورخستنەوەی ئەوەی ئەم ڕێگرییە پێشێلکردنی مافی پێغەمبەر و پێگەکەی بێ... خەڵکی نەجد وەك موسڵمانەکانی تر پێغەمبەریان خۆش دەوێ... تاد. جا ئەمە هەموو دەچێتە ناو نەصبەوە.

٤٠- **بیدعەی یادی کۆچی پێغەمبەر:** بڕوانە (الفتاوی ٣/ ٤٨)، قسەی شێخ لەسەر ئەم یادە وەك هەمان قسەی ئەوە لەسەر یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر، هەمان قسەی لەسەر گشت یاد و بۆنەکان هەیە (٣/ ٤٨)، ئەمەیان دەچێتە ناو نەصبەوە.

٤١- **بیدعەی ئیسرا و میعراج:** بڕوانە: (٣/ ٩٧، ١٠٣) جگەلەوانەش.

زۆر فـەتوای تـر، کـە دەبوایـە لـە بـواری فیقهیـدا بووبـان، کەچـی شـێخ بردوویەتییە خانەی (کافرکردن و یەکخواناسی)، هـەر بۆیـە هەنـدێکمان لێـرد هێناوەتەوە بەهۆی مەترسیداری پرسی (کافر کردنەوە)، هەروەها لەبەر ئـەوەی رەگ و ریشەی زیادەرۆچوونە. هەندێك حـوکمی فیقهیش دەخرێنـەروو کـە لـە بواری بیروباوەڕیشدا نـین – بەهـەمان شـێوە تـەکفیر و کافرکردنیـان تێدایـە – بەڵام ئێمە هەوڵ و کۆششمان کـردووە لـە دابەشـکردنیاندا، ئەگـەر چـی ئـەوەی کتێبـە وەهابییـەکان بخوێنێتـەوە، دەبـینێ سـەختە جیاکـاری بکـرێ لـە نێـوان بیروباوەڕ و فیقه و ئامۆژگاریدا، جا لە هەموویاندا کافر کـردن و بەبیدعەچـی دانان و بە گومڕا دانان دەبینیەوە...!

دووەمیان: حوکمەکان (مەبەستمان لەمە پرسە فیقهییەکانە)

لەگـەڵ تێـك ئاڵـان و تێکـەڵی زۆر لـە نێـوان (بیروبـاوەڕ و فیقـه)، لـە کەلەپوری هزری وەهابی بەتایبەتی، ئەوا ئێمـە – بـەگوێرەی توانـا – هـەوڵ دەدەین تەنها فـەتوا فیقهییـەکان بهێنینـەوە، ئەگەرچـی شـێخ بردبێتیـە نـاو بازنەی یەکخواناسی و هاوبەشدانانیشەوە. بەڵام پێش ئـەوە پێویسـتە ئامـاژە بـدەم بـەوەی ئـەوەی لـەبارەی لێبـوردەیی مەزهـەبی وتـراوە لەگـەڵ مەزهەبـەکانی ئـەهلی سـوننە وەك: شـافیعییەکان و مالیکییـەکان و حەنەفییەکان ئەوا بوونی نییە، تەنانەت ئەگەر ناوبراوان لە بیروباوەڕیشدا شوێن مەزهەبی وەهابیشت کەوتن بن.

بۆ نموونە:

## فەتواکان سەبارەت بە سەپاندنی مەزهەبی حەنبەلی:

ئەمە لە فەتواکانی محەممەدی کوڕی ئیبراهیمدا هاتووە لە پێگەی فەرمانڕەوەوە، چونکە گشت کاروبارە ئاینیەکانی بەدەست بوو، ئەو کات دەوڵەت دەست و زمان و پۆلیسی بەرەهایی خستەبەر دەست بۆ سەپاندنی بۆچوونە بیروباوەڕی و فەتوایە حەنبەلییەکانی، لەوانە شێخ فەرمانی کرد ڕێگری لە شافیعییەکان بکرێ لە ناوچەی لەیس لە خوێندنی قنوت لە بەیانیدا (٢/ ٢٤٢).. ڕێگیشی کرد لەوەی زەیدییەکان ئەرکی دادوەریان لە باشوردا پێبدرێت (٢/ ٢٩٧)، لەگەڵ دانانی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم بەوەی ئەوان بیروباوەڕیان ڕاستترە لە شافیعییەکان، ئەمە مانای وایە هیچ یەکێك لە شافیعییەکان پۆستی دادوەری وەرناگرێ.

### لە فەتواکانی:

١- **فەتوای حەرام کردنی دروستکردنی گەرماو:** لە فەتوا فیقهییەکانی شێخدا هاتووە، ڕێگەی نەداوە گەرماو دروست بکرێت! بە بەڵگەکەی ئەوەی مەترسی کرانەوەی دەرگا هەیە! کاتێك لەلایەن یەکێك لە بەرپرسانەوە پرسیاریان لێکرا: ((ئایتا هیچ ڕێگرێکی شەرعی هەیە لە کردنەوەی گەرماوی هەڵمی گشتی تایبەت بۆ پیاوان، لەگەڵ پابەندبوون بە هەڵسوکەوتە شەرعییەکانەوە لەڕووی شەرمگە "عەورەت"ەوە؟ شێخ وەڵامی دایەوە: پێمان وانییە کردنەوەی نموونەی ئەم گەرماوانە پەسەند بێ، چونکە زیانی لە سوودەکەی زیاترە، هاووێنەی ئەم شتانە هەردەم دەبنە ئامرازێك بۆ چەندین خراپە کە بە خەیاڵی ئەو کەسەدا نەهاتووە کە دایمەزراندووە! هەر چەندە ئێستا سووربێت لەسەر ڕەچاوکردنی ڕەفتاری شەرعی و ڕەوشتی، ئەوا ناتوانین دەستەبەری ئەمە بکەیت لە ئایندەدا لە دوای کرانەوەی دەرگاکە!))[مجموع الفتاوی ٢/ ٨٢]،

ئه‌م مه‌ترسی هه‌بوونه به‌رده‌وام بوو وه‌ك خه‌سڵه‌تێك له خه‌سڵه‌ته‌كانی ڕه‌وتی ناوخۆیی، ئه‌مه‌شی پاساودا بنه‌مای ((پاساو و هۆكار برین))!، بینیمان ئه ڕه‌وته دژی هه‌ر شتێكی تازه وه‌ستانه‌وه به‌م به‌ڵگه كه موفتی پێشووتر باسی كرد، تا ئه‌مرۆش له‌سه‌ر ئه‌م ڕێبازه ده‌ڕوات

یه‌كێك له به‌ڵگه‌كامی ئه‌م مه‌ترسی هه‌بوونه‌یان ئه‌م وته‌یه‌ی شێخه كه ده‌ڵێ: ((سه‌رپێچییه‌كان "واته سه‌رپێچی كردنی پێشه‌واكانی بانگه‌واز" خراپه دێنێته ئاراوه له‌گه‌ڵ نزیكی ده‌رچوون به‌شێوه‌یه‌كی ڕێژه‌یی له شارێگه‌ی ڕاست)) (٢/ ١٩). لێره‌دا مه‌ترسی هه‌یه له ده‌رچوون له ڕێبازه پێشه‌واكانی بانگه‌واز، كه لای شێخ شارێگه‌ی ڕاستییه.

٢- **ته‌نها سه‌ربڕاوه‌كانی وه‌هابییه‌ت دروستن:** ئه‌مه به ده‌ربڕین نه‌یوتوه، به‌ڵكو به ناوه‌ڕۆك وتویه‌تی، پرسیاری لێكرا له‌باره‌ی قه‌سابێكه‌وه ((ده‌درێته پاڵ ئیسلام و ناوی فازڵه‌دینه)) ئایا سه‌بڕاوه‌كه‌ی دروسته؟ وه‌ڵام دایه‌وه: ((ده‌بێ فازڵه‌دینی قه‌ساب موسڵمانێكی بیروباوه‌ڕ دروست بێ! نكوڵی له شته پڕ و پوچه‌كان بكات. هه‌روه‌ها نكوڵی بكات له گشت بیروباوه‌ڕ و بیدعه كوفرییه‌كان وه‌ك: قادیانیه‌ت و ڕافیزایه‌تی بتپه‌رستی و جگه له‌وانیش!.. بۆ حه‌ڵاڵ بوونی سه‌ربڕاوه‌كه‌ی ته‌نها درانه پاڵ ئیسلام و شایه‌تمان ده‌ربڕین و به‌رپاكردنی نوێژ و جگه‌له‌مانه‌ش له بنه‌ماكانی ئیسلام به‌س نییه، ئه‌و مه‌رجه پێویستانه‌ش كه باسمان كرد له‌م قه‌سابه‌دا نرخیان نابێ وناچه‌سپێن مه‌گه‌ر كه‌سێك بیگێڕێته‌وه كه متمانه پێكراوو گوناهكار نه‌بێ و ڕاستییه‌كه بزانێ و به‌م شێوه‌یه كه‌سی متمانه پێكراو دادگه‌ر له یه‌كتر بگوزانه‌وه تا ده‌گاته لای ئه‌و كه‌سه‌ی وه‌ك حوكم لای ده‌چه‌سپێ وپشتی پێ ده‌به‌سترێ له‌شه‌رعدا))[١/٧٧-٧٨].

دەڵێم: زیادەڕۆچوون لە فەتواکەدا دیار و ئاشکرایە، ئیسلام هەر لە بنەڕەتدا مەرجی لە کەسی جولەکە و نەسرانیدا دانەناوە، ئەی چی سەبارەت بەو موسڵمانەی کە بنەماکانی ئیسلام جێبەجێ دەکات؟ لەگەڵ ئەوەشدا داننانێین بەوەی سەربڕاوەکەی حەڵاڵە تا دڵی نەپشکنین و بە دڵنیاییەوە دەزانین بەپێی پێوەرەکانی ئیسلامە کە شێخ بەپێوەری داناوە و بۆ زۆربەی موسڵمانان دانی پێدانەناوە. وەك ئەوەی بڵێت: تەنها سەربڕاوەکانی ئەو کەسانە دروستە کە لەسەر مەزهەبی ئێمەن، یان خەریکە وابڵێت!

٣- **بوکەڵەکانی کچان و یاری عائیشە:** پرسیار لە موفتی کرا لەبارەی بوکەڵەکانی کچان، ئایا دروستە وەك یاری عائیشەی دایکی باوەڕداران، کە پێغەمبەری خوا (درود و سڵاوی خوای لێبێ) دانی پێدانا یان دروست نییە؟ موفتی (١/ ١٨١ – ١٨٢) لێکدانەوەی زۆرەملێی بۆ کردووە بۆ حەرام کردنی بوکەڵەکانی منداڵان، جیاوازی خەیاڵی و بێ بنەمای دروست کردووە لە نێوان ئەم بوکەڵانە و یاری عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، لەوەی بوکەڵەکانی ئەمڕۆ زیاتر وردەکاریان تێدایە...هاوشێوەی ئەم پاساوانە...

ئینجا هەوڵی داوە نکوڵی بکات لەوەی یاری عائیشە وێنەی گیانداران بێ! داوای کردووە ئەوەی ئەمە دەڵێ: ((بەڵگە بهێنێتەوە)) دواتر ئەمە بڕیوە بەوەی ئەوەی گومانی وایە ((هیچ ڕێگەیەك بۆ ئەمە نادۆزێتەوە))! لەگەڵ ئەوەی لە هەمان ئەو فەرموودەیەدا کە یاری کردنی عائیشەی تێدا هاتووە باسی ئەوە کراوە کە ((ئەسپێك بووە، دوو باڵی پێبووە))، کاتێك پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) لەم بارەوە پرسیاری لێکرد، عائیشە وتویەتی: ئایا نەتزایوە سولەیمان ئەسپێکی دوو باڵی لەگەڵدا بووە؟ پێغەمبەریش (درود و سڵاوی خوای لێبێ) زەردەخەنەی کردووە. هەموویان فەرموودەکەیان بە ڕاست

داناوە و هیچ یەکێکیان بە لاواز دایاننەناوە، بەڵام زیادەڕۆچوون وا دەکات پەی ببرێتەبەر بە زۆرەملێ حەرام و قەدەغەکردنی شت. ئەوەی نامۆیە ئەوەیە کە کۆکەرەوەی فەتواکانی شێخ ئەمەی خستۆتە ناو بەشەکانی ((بیروباوەڕ)) نەوەك بەشەکانی فیقھ!

ئەمە نەریتی ئەم قوتابخانەیە، لە کاتی خستنەڕووی خوێندنەوەکەمان بۆ فەتواکانی شێخ ئیبن بازدا (ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەردەکەوێ کە هەموو بابەتە لاوەکییەکانیان خستۆتە ناو بیروباوەڕ، وەك: ڕیش، وێنەگرتن، باڵاپۆشی... تاد،ئەم کارەیان وەك هەوڵی پێشەوا ئەحمەدە کە ویستوویەتی هەندێك شتی فیقھی بخاتە ناو بازنەی بیروباوەڕەوە تا چیتر قسەی لەسەر نەکرێ! ئەحمەد ((دەستهێنان بەسەر خوفەکاندا)) و پێشتریش سەوری (بە بەدەنگی خوێندنی بیسملای) خستۆتە ناو بازنەی بیروباوەڕەوە، وەهابییەتیش هات گشت ئەو بابەتە فیقهیانی ڕاجیاییان لەسەرە خستە ناو بازنەی بیروباوەڕەوە. بەم پێیە ئەوەی پێچەوانەی ئەمانە بجوڵێتەوە ئەوا ((لە کۆمەڵە گومڕایە تیاچووەکانە، لە چوارچێوە ئەو حەفتا و دوو کۆمەڵەیە کە دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە)). ئینجا لێرەدا ناکۆکیەك هەیە لەسەر ئەوەی ئایا بەر تکا و شەفاعەت دەکەوێ یان تا هەتایە لە ئاگردا دەمێننەوە! تەنها کەسێك ئەمە دەزانێ کە زۆر هەوڵی دابێ لە تێگەیاندنی ئەم گەلە و کتێبەکانی ئەوانی خوێندبێتەوە.

٤- **وێنەگرتن:** لەلای شێخ یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، وەهابییەکان بەشداربوون بە حەڕام کردن و توندگیری تیایدا، ئەمەشیان لە بەشی بیروباوەڕدا هەژمار کرد، بە هەر حاڵ: ڕووکەشی بەڵگە هێنانەوەی شێخ ئەوە دەگەیەنێ کە وێنەگرتن یەکێکە لە تاوانە هەرە گەورەکان و مایەی مانەوەیە لە دۆزەخدا!

[٢/ ١٥٦]. سەبارەت بە وێنەی سەر مافور و بالیف و پەردەکان ئەوا دوو حوکمیان هەیە، یەکەمیان: ئەگەر نرخەکە زیاد بکات (واتە: نرخی کەل و پەلەکە) ئەوا دەبێ نرخەکە زیادەکە ڕەت بکرێتەوە. دووەمیان: ئەگەر لەسەر مافور بوو، ئەوا دەبێ داپۆشرێ، یان لەسەر مافورێکی گرانبەها بوو ئەوا ملی دەبڕدرێت [١/ ١٩٥].

٥- **ڕیش**: ڕیش یەکێکە لە پرسە گەورەکانی لای وەهابییەت، لەلای ئەوان ئەمە چووەتە ناو یەکخواناسی و حوکمەکان و ئامۆژگارییەکان و گشت بابەتە ئاینیەکان، ئەوانەی ڕیشیان تاشیوە لەلایەن وەهابییەکان بە هاوبەشدانەر و ژنانییەکان وەسفکراون... تاد، شێخ وتەی درێژ و بۆچوونی توونـد فەتوای ترسناکی هەن لە بابەتی ڕیش تاشین یان کورتکردنی ڕیشدا (بڕوانە: ٢/ ٥١ - ٥٧). نامۆیی لەوەدا نییە شێخ ڕیش تاشینی حەڕام کردووە، بابەتەکە ڕاجیایی تێدایە لە نێوان ئەوانەی پێیان وایە حەڕامە و ئەوانەش کە پێیان وایە ناپەسەندە، بەڵام ئەوەی نامۆیە وتە و ڕا و بۆچوونە توونددەکانیەتی، لەوانە: ((تەنها کەسانێك ئەمە دەکەن لە پیاوان کە ژنانی بن)) (٢/ ٥٢). بە سەرزەنشتەوە وتویەتی: ((بەپێچەوانەی ئەم ژنانیانە! کە دوژمنی پیاوەتین، هەر یەکێکیان دەیانەوێ لەسەر شێوەی دایکی بێ نەوەك باوکی، بێ گومان ئەمەیان پیاو نییە))! [٢/ ٥٦]..! تاشینی ڕیش ((یەکێکە لە گوناهە گەورەکان)) [٢/ ٥٣]. ئەوەی بیتاشێت ئەوا خۆی چوواندووە بە جولەکە و نەسڕانیەکان، هەر کەسێکیش خۆی بە گەلێك بچوێنێ ئەوا لەوانە! [٢/ ٥٥، ٥٦]. سزاکەشی تەمبێ کردنە، بەپێی ئەوەی کاربەدەستی موسڵمانان بە گونجاوی دەبینێ [٢/ ٥٥]، ئەوەی ڕیش دەتاشێ دەبێ کۆچی لەلا بکرێ تا تۆبە دەکات [٢/ ٥٦]،

ئەوەی ڕیش دەتاشێ تاوانکارە و گوناهبارە و پێشنوێژیەکەی دروست نییـە)). [٢/ ٢٩٤].

دەڵێم: ئەمانە چەند ڕا و بۆچوونێك لەوپەڕی زیادەڕۆچوون و بریندارکردندان، چەندین جار زیاتر لەمە لە فەتواکانی شێخ ئیبن بازدا دەبینین.

٦- **دەبێ ئوتومبیلەکان لە دوای بانگدان لە شارەکاندا بوەستێنرێن:** یەکێك لەو تووندیانەی شێخ لە نوێژی بە کۆمەڵدا، ئەوەیە نامەی بۆ شا سعود ناردووە لە ساڵی ١٣٨٠ك، تیایدا باسی پێویستی ((دانانی ڕێنمایی کردووە بۆ هاتووچۆی ئوتومبیلەکان و بانگدان و قامەت، فەرمانی توونـد دەربکرێن بەوەی لەسەر پۆلیسی هاتوچۆ پێویستە هاتوچۆی ئوتومبیلەکان ڕابگرن لە دوای بانگدان بە دە خولەك تا نوێژ تەواو دەبێ، بە پێنج خولەك پێش خۆرئاوابوونیش ڕابگیرێ)) [١٣٢/٢]. زیاتر وتی: ((دەبێ ئەم ڕێنماییانە جێبەجێ بکرێن وەك: گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر)). بۆ زانین نوێژی بە کۆمەڵ لای زۆربەی زانایان سوننەتە، بەڵکو بەپێی ڕای بەهێز لای ئەحمەدیش سوننەتە.

٧- **حەرام کردنی گوڵاوی کۆڵۆنیا:** پیسە و نوێژکردن پێیەوە دروست نییە، ئەگەر هاتوو ماددەی بێ هۆشکەری تێدابوو (٢/ ٩٣).

٨- **جگەرەکێشان:** حەرام بوونی دیارە، بەڵام ئەوەی پیس بێت و نوێژکردن پێیەوە دروست نـەبێت (٢/ ٩٣) ئەمەیان سنووربەزاندنی شێخە لە فەتواکانیدا، هەروەها پێی وایە جگەرەکێش گوناهکارە و پێشنوێژی کردنی دروست نییـە (٢/ ٢٩٤)... ئەمەیان زیادەڕۆچوون و سنووربەزاندنە.

٩- **نوێژی بەکۆمەڵ:** فەرزی عەینە، لە هیچ پێشەوایەکەوە بە شێوەیەك ڕاست نەچەسپاوە وتبێتی سوننەتە! (٢/ ٢٦٢ - ٢٦٤). ئەمە ڕایەکی زۆر توونـدە، ڕای ڕاست ئەوەیە کە نوێژی بەکۆمەڵ سوننەتە. بەڵام لەوەش توندتر فەتواکانی پێشوویەتی کە تیایدا بەپێویستی داناوە ئوتومبیلەکان لە شاردا بوەستێنرێن لە دوای بانگدان [٢/ ١٣٢]. فەتوادانی شێخ بە تەمبێکردنی پزیشکێك کە نۆرینگەی لەسەر خۆی داخستووە لە کاتی نوێژدا، لەگەڵ تۆمەتبارکردنی بەوەی بە تەنها لەگەڵ ئافرەتێکی بیانیدا بووە، لەسەر هەر دوو کارەکەی تەمبێکرا، موفتی گشتی ئەمەی پەسەند کرد! [٢/ ٢٧٤]. فەتوایدا بە پشکنینی ناوی خەڵك لە نوێژی بەیانیدا [٢/ ٢٧٥]. لەگەڵ ئەوەی ئەم کارەی شێخ بیدعەیەکە پێغەمبەر و جێنشینە سەرڕاستەکان نەیانکردووە. تەنانەت شێخ فەتوایدا بە سزادانی ئەو کەسانەی ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ نابن (٢/ ٢٨٠)، تەمبێکردنی ئەوەی نایەتە نوێژی بە کۆمەڵ لەگەڵ خەڵك بە لێدانی چل قەمچی (٢/ ٣٨١).

ئەمە هەمووی لە زیادەڕۆچوونەوەیە، جا ئەگەر وازمان هێنا لە ڕەخنەگرتن لە زیادەڕۆچوون لە هاووێنەی ئەم شتە ڕاجیاییە فیقهیانەدا، ئەی چۆن دەتوانینرەخنە لە زیادەڕۆچوون بگرین لە شتی مەزنتردا. یان لەو شتانەی موسڵمانان یان زۆربەی موسڵمانان تیایدا زیادەڕۆچوون وەك پرسی (تێکۆشان و جیهادی داواکردن)، لە ئایندەدا دەخرێتەڕوو.

١٠- **حەرامکردنی خوێنبەخشین:** (٣/ ١٧٣)، چونکە خوێن پیسە! گواستنەوەی پیس لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرێ دروست نییە!.

١١- **توووندگیری لە حوکمەکانی حەجدا:** ئیبن مەحمودی موفتی قەتەر، فەتوایدا لەبارەی ئەوەی دروستە پێش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان و لە شەویشدابەردباران (ڕەجم) کردنی شەیتان لە ڕۆژەکانی تەشریقدا ئەنجام بدرێ، ئەمەشی لە نامەیەکدا بڵاو کردەوە، ئەمە ڕا و بۆچوونێکی فیقهییە و ئامانجی ئاسانکاری کردنە بۆ حەجاجەکان، بەڵگەی خۆی هەیە؛ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم کتێبێکی لە بەرپەرچدانەوەی موفتی ناوبراو نووسی (٦/ ٦٧ - ١١٩) زۆر هێرشی کردۆتەسەر، بەشێوەیەك وتویەتی ناوبراو: ((بە نەزانی و گومڕایی کوێرانە ئەم فەتوایەی داوە... نامەکەی هەڵەی وای تێدایە، کە پێشتر کەسی تر هەڵەی وای نەکردووە!... پێچەوانەی سوننەتی ڕاشکاو فەتوای داوە! دژی ئەوەی پێشینان لەسەری ڕۆیشتوون، هەڵسوکەوتی کردووە! هەڵە و تێکەڵکردن و نەزانی درۆکردن بەناوی خوای مەزن بەبێ زانیاری تێدایە...)).

داوای لە: ((کاربەدەستی موسڵمانان شا سعود کردووە، بەو پێگەیەی پێیدراوە ئەم کەسە پاشگەز بکاتەوە لەم کارەی، کە دەروونی ئەم کارەی بۆ ڕازاندۆتەوە بۆ دەرکردنی ئەم فەتوایە...))، ئەمەش ئەنجامدرا، ئیبن مەحمود بە بڕیاری شا هاتە لای شێخ، شێخ محەممەد ئیبراهیم باسی ئەوەی کردووە: ((ناوبراو تۆبەی کردووە و ئەویش تۆبەکەی وەرگرتووە))!!.

ئەمە گوزارشتێکە لە شێخ ناوەشێتەوە، چونکە هەر خوا تۆبە لە بەندەکانی وەردەگرێ. ئەگرا شێخ بیوتبایە: وەڵامی تۆبەکەی ئەومان دایەوە، هاوشێوەی ئەم دەربڕینانە. ئینجا شێخ بۆی دەرکەوت ئیبن مەحمود تەنها لە چەند شتێکە سادەی ناو نامەکە پاشگەز بووەتەوە نەوەك لە گشت شتی ناو نامەکە (٦/ ٧٠)!... شێخ دووبارە بە سەرزەنشتکردنەوە گەڕایەوە سەری وتی: بەم کتێبەی ((حەجی تێکدا... بێ ئەوەی هەست بکات شتێکی پڕوپووچی ویستووە!... بێ دین و خوانەناسەکان کتێبەکەی ئەویان لە گەندەڵکردنی

ئایندا بەکارهێناوە))... تا دوایین ئەم هەوڵانەی شێخ بۆ گەورەکردنی شتەکە. شێخ ئەم شتانەی بۆ موفتی قەتەر ئیبن مەحمود بەکارهێنا، بە پوختی: کەسێکی ((هەژار، فێڵکەر، بێ شەرم، نەزان، نکۆڵیکار، لە خوانەناسی ڕۆچوو، یان دوورووە، وەك بنزێکی خراپە کە بە سمپێیەکانی بەدوای مەرگیدا بگەڕێ، بایەخ نادا بە ڕێبازی پێغەمبەری خوا و کاربەدەستان، هیچ تێڕامانێکی نییە، ڕێگایەکی جیاوازی گرتووە لە ڕێگەی خەڵکی بەهەشت... تاد)).

لێرەدا دوو تێبینی هەن: یەکەمیان: زانایانی شانشینەکە یان زۆربەیان لەسەر فەتواکەی ئیبن مەحمودن! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پێیان وایە ڕاستی پێکاوە، دووەمیان: خودی ئیبن مەحمود- موفتی قەتەر - بەم شێوەیە کراوە نییە، وەك ئەو خوێنەرە گومانی بۆ دەچێت، کە ئەم هێرشە دەخوێنێتەوە. بەڵکو ناوبراو لە هەمان ڕەوتە و بەندەکانی خوا تەکفیر دەکات و بە هاوبەشدانان تۆمەتباریان دەکات،، وەهابییەتەکی تەواوە. لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەمە لە نێوان دوو موفتی حەنبەلیی تەیمی وەهابیدا ڕوویداوە، سەبارەت بە شتێکی فیقهی، کە پێشتریش ڕاجیایی لەسەر بووە، ئەی چۆن ڕاجیایی قبوڵ دەکەن لەگەڵ زانای چوار مەزهەبەکەدا؟ چ جای مەزهەبەکانی تری موسڵمانان و لەو شتانەی فیقهی نین؟ بەڕاستی دیمەنەکە زۆر ترسناکە!

١٢- **خۆکوشتن دروستە:** شێخ خۆکوشتنی بە دروست داناوە (٦/ ٢٠٧) لەو دۆخەی دوژمن کەسەکە دەستگیر دەکات و سزا و ئەشکەنجەی دەدات تا دەگاتە نهێنی تێکۆشەران... تاد. ئەمە لە فەتوایەکدا بۆ جەزائیرییەکان (ئەوانەی دەدرێنە پاڵ ئیسلام)! خستەڕوو، لەو کاتەی تێکدەکۆشان دژی فەڕەنسییەکان!... دەڵێم: ئەم فەتوایە من نەهەژاند، تەنانەت کە بناغەی ئەو کەسە زیادەڕۆچووە

هاوچەرخانەشە (کە خۆیان دەتەقێننەوە لە ناو موسڵمانان) منی نە لەرزاند، بەڵکو ئەوەی منی هەژاند لە فەتواکە هاتنی جەزائیرییە تێکۆشەرەکانە دژی داگیرکەری فەڕەنسی، کە هیچ نارِوونیەك لە دەستدرێژی و ستەمکاریەکەیدا نییە، کەچی شێخ سەرکۆنەیان دەکات بەناوی ئیسلام و دەڵێت: ((هەندێك جەزائیری هاتوونەتە لامان و دراونەتە پاڵ ئیسلام))!. شێخ هێشتا بیروباوەڕی ئەوانی تاقی نەکردۆتەوە! چونکە تەنها سەلەفییەکانی جەزائیر هاتوونەتە لای شێخ، کە کەمینەی جەزائیرن – بەتایبەت ئەو کات – داوای فەتوا و ڕوونکردنەوەیان کردووە لەبارەی خۆکوشتنیان بۆ پاراستنی خاك و ئاینیان، لەگەڵ ئەوەشدا شێخ تەواو بڕیار نادات لەسەر موسڵمانێتیان!!!.

١٣- **حەڕامکردنی فرۆشتنی وێنە و تەلەفزیۆن:** (٧/ ٧ - ٨)

١٤- **ڕای پەسەند ئەوەیە فرۆشتنی ڕادیۆ حەڕامە:** (٧/ ٨)، چونکە کڕیار کە ڕادیۆ دەکڕێ، ئەوا پڕوپاگەندە بۆ بێ بڕوایان دەکات بەوەی ئەوان ئەوانن و ئێوەش ئێوە.

دەڵێم: ئەمە لەسەر گشت ئەو کڕیارانە جێبەجێ دەبێ، کە شت لە بێ باوەڕان دەکڕن! هەروەك چەندین فەتوای دیکەی هەن لەبارەی سەرزەنشتکردنی ئەوەی ڕادیۆ دەکڕێ (١٠/ ٢٢٤، ٢٢٦، ٢٥١).

١٥- **حەڕام کردنی فرۆشتنی گوڵاوی کۆڵۆنیا:** هەروەها حەڕام کردنی خۆ پێ بۆنخۆشکردنی (٧/ ١١).

**١٦- حەڕامرکردنی بیمە کردن:** ( ٧/ ٣٤ )

١٧- **لەناوبردنی ئامێرەکانی ڕابواردن:** ( ٨/ ١٧١ - ١٧٢ )

١٨- **حەرامکردنی یاریەکانی بەهێزکردنی لەش:** کە تیایدا بەرد لەسەر سینە دەشکێندرێ، لەبەر ئەوەش کە جادوو و سیحرە، تەنها کەسانی عەقڵ بچوک هەڵدەخەڵەتێنێ! (٨/ ١٣٧).

١٩- **پرسیاری لێدەکرێ لەبارەی یاریە جەماوەرییەکان، ئەویش وەڵامدانەوەتە و دەڵێ شەترەنج و تۆپی پێ حەرامن:** (٨/ ١٢٢ - ١٢٩)، ئەمە لە فەتوایەکی درێژدا وەڵامداوەتەوە. ئەمە وەك لادانە لە وەڵامدانەوە، بەهۆی بڵاوبوونەوەی یارییە جەماوەرییەکان لە نەجددا.

٢٠- **حەرامکردنی یاری تۆپ، ئەگەر هاتوو ڕێکخراو بوو:** مەبەست لە ڕێکخراو بوون ئەوەیە (ئەگەر لەسەر شێوازێکی ناسراو، دوو کۆمەڵە، لێدانی سزا، کۆڕنە، تۆپی سور و زەرد بوو)... تاد (٨/ ١١٩، ١٢٠، ١٢٨) هەروەها قەدەغەکردنی کرێ وەرگرتنی ئەوانەی خۆیان بۆ ئەمە یەکلا کردۆتەوە، موفتی نامەی بۆ شا نووسی بۆ ڕاستەوخۆ قەدەغەکردنی ئەمە بە ڕەهایی (٨/ ١٢٢).

٢١- **حەرامکردنی یاری کێرم:** ( ٨/ ١٣٢ ).

٢٢- **مەسحەفی لەچاپدراو، کە ڕاڤەی لەگەڵدایە، حوکمەکەی سوتاندیەتی:** (٨/ ١٧٤) یان دەبێ بنێژرێ!.

٢٣- **سووتاندنی کتێبەکان ( چاودێری مەزهەبی ):** (٨/ ١٧٥، ١٧٦) لەوانە سووتاندنی کتێبی (تحفة الأعیان) دوای پشکنینی لە ڕاگەیاندندا!. کاتێك خاوەنەکەی داوای

قەرەبووی کرد، شێخ وەڵامی دایەوە و وتی: ((سەلامەتی ئەو سزایەیە کە شایستەی))! چەندین فەتوای دا بە پشکنینی کتێبخانە بازرگانیەکان بێ قەرەبوکردنەوەی خانەوەکانیان.

٢٤- **بە مەرجدانانی شایستەیی لە ڕەچەڵكدا لە کاتی هاوسەرگیریدا**: (١٠/ ١٢١).
کاتێك یەکێك لە خانەدانەکان لێی پرسی، ئایا کچەکەی بە شووبداتە یەکێکی نا خانەدان؟! وەڵامی دایەوە و وتی: دروستە (١٠/ ١٢١)! وتی:((پێشینان لەسەر ئەمە بوونە، بێ ئەوەی نکوڵی لێبکەن، تا ئەندازەیەك لە هەندێك شاردا بینراوە، لوتبەرزی و خۆبەگەورە زانین وای لە هەندێك کەس کردووە کچەکانیان تەنها بدەنە کەسانێکی دیاریکراو، پێغەمبەری خوا و جێنیشینە سەرراستەکانی وەك پێشەنگ و پێشەوا بەسن بۆ ئێمە))!!!!.

دەڵێم: ئەمە باشە، ئەگەر لە فەتواکەدا نیازی ڕاست بێت، بەڵام شێخم بینی، وەك گشت سەلەفییەکانی تر، ئیسلام بەکاردەهێنن بۆ جیاوازی کردن لە نێوان هاوسەراندا، بە پاساوی شایستەیی، ئەگەر کەسێکی هاشمی هات، ئەوا بە لوتبەرزی تۆمەتباری دەکەن، بەدروستی دەزانن کچەکانیان لە نا خانەدانەکان مارە بکەن، ئەمەش هەر بە ئیسلام دەیکەن!.. ئەمە شتێکی زۆر سەرسامکەرە، ئەوەندە ڕوونە پێویست بە زۆر ڕوونکردنەوە ناکات، نکوڵی لە نەوەی هاشم دەکات، کە شایستەیی بە مەرج بگرن، لە هەمان کاتدا داندەنێ بە مەرجگرتنی شایستەیی لەلایەن عوتەیبە و سوبەیە و هۆزی تەمیم. لێرەدا دەمارگیری تیرەیی دەردەکەوێ، کە بە ڕۆشنی بە ئایین ڕووپۆشکراوە.

یەکدەنگی لەسەر ئەوەیە کە نەوەی هاشم – لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە – لە هەموو عەرەبەکان خانەدانترن، هەروەك لە فەرموودەدا هاتووە: ((باشترینی باشترینن)). ئەوەی شێخ باسی ئەوەی کردووە، کە پێغەمبەر (درود و سڵاوی

خوای لێبێ) هەندێك لە کچەکانی لە کەسانی نا هاشمی مارە کردووە، بەهەمان شێوە عەلیش وایکردووە، شتێکی ڕاستە، بەڵام بۆچی ئەگەر بابەتەکە پەیوەست بوو بە تیرەگەرایی و هۆزگەراییەوە، ئەمە لەبیر دەکات، فەتوا دەدات بە پێویستی ڕەچاوکردنی شایستەیی و پێویستی هەڵوەشاندنەوە گرێبەستی هاوسەرگیری ئەگەر تیایدا ڕەچاو نەکرابوو؟!!

٢٥- **دروست نییە دەست لەسەر شوێنی دەشۆردن ( مەغسەل ) بشۆردرێ:** (١٠/ ٢٦٤)، چونکە پاشماوەکانی خۆراك دەچنە شوێننی پیسەوە.

٢٦- **ئەوەی جگەرە و تلیاك بکێشێ چل قەمچی دەبێ لێبدرێ:** (١٢/ ٩٥).

٢٧- **جگەرەکێش گوناهکار و لاسارە:** شایەتیدانی وەرناگیرێ (١٣/ ٢٦).

٢٨- **ئەوەی ڕیش دەتاشێ لاسار و گوناهکارە:** شایەتیدانی وەرناگیرێ(١٣/ ٣٠).

٢٩- **ئەو کەسە شیعەیەی لە عاشوراداا خەفەت دایدەگرێ:** شایەتیدانی وەرناگیرێ (١٣/ ٢٩).

٣٠- **شایەتیدانی ئیبازییەکان:** ڕەتکراوەیە (١٣/ ٣٠).

٣١- **شایەتیدانی یاریزانی بۆکسێن:** پوچەڵە (١٣/ ٣١).

٣٢- **شوێنەکانی ڕابواردن و گۆرانیەکانی پێش نوێژ:** لە ئامۆژگارییەکی گشتیدا باسی خراپەکانی کردووە، هۆشداری داوە لەبارەیانەوە، پێش هۆشداریدان لەبارەی نەکردنی نوێژ، هۆشداری داوە لە بارەی گۆرانی و ئامێرەکانی ڕابواردن (١٣/ ١٠٧ - ١٧٥).

٣٣- **ئەوەی چا لە ناو بازاردا بخواتەوە: گەواهی و شایەتیدانەکەی ڕەتکراوەیە** (١٣/ ٣٣).

٣٤- **سوڕانەوەی زەوی پوچەڵ و بێ بنەمایە:** (١٣/ ١٠٧، ١١٠).

٣٥- **پرسیاری لێکرا لەبارەی ئەو ئاژەڵانەی شیعەکان قەتیف سەریان دەبڕن،** چ وەڵامێکی دایەوە؟

به یەك وشه وەڵامی دایەوە... ئایا دەزانن چییە؟ ((ڕیسوابن))!! (١٢/ ٢٠٧).

ئەمە چییە؟!!! کێ موفتی گشتی دەوڵەتە؟!! ئەمەی بە بەشێکی مەزنی وت لە گەل؟!!

ئایا ئەمە ڕوویدەدا ئەگەر دەڵاڵ بوونی نەبوایە، مەبەست ئەوەیە دەوڵەتی دەڵاڵی ئەم ڕەوتە نەبوایە.

## تێکگیرانی بۆچوونەکانی محەممەدی کوڕی ئیبڕاهیم:

شێخ محەممەدی کوڕی ئیبڕاهیم، ڕاست ناکات لەم توونـدگیر و تـەکفیرەدا کـە بینیمـان. ئەمەشـم دوای ئـەوە زانـی کـە بـە دوو پێـوەر و کێشـانی بـە دوو تـەرازوو فـەتوای داوە. ئەگـەر بینـرا وەهابییـەك یـان حەنبەلییـەك یـاخود تەنانـەت خۆشـی شتێکی کردووە، کە پێشـتر فـەتوای لـەبارەوە داوە بـەوەی ئـەم شـتە زیادەڕۆچـوون و هاوبەشدانانە، ئەوا لەم کاتەدا پەنا دەباتەبەر لێکدانەوە (تأویل) و پاساو هێنانەوە و گوایـە مەبەسـت لەمـە فلان و فیسـار شـتە بـووە؛ پێشـتر بەشـێك لەمـە لـە بابـەتی شایسـتەیی لـە ڕەچـەڵك و جگەلەویشـدا خرایـەڕوو، ئەمانـەی خـوارەوە چـەند نموونەیەکی ترن لەم بارەوە:

١- **بەرگری کردن لە تەبەڕوککردنی حەنبەلییەکان:** بـەرگری لـە تەبـەڕوك دەکـات، ئەگـەر پەیوەسـت بـوو بـە حەنبەلییەکانـەوە. کاتێـك ڕاڤـەکاری کتـێبی (زاد المسـتنقع)ی حەنبـەلی وتـی: ((بەرەکـەتی خـۆی دووبـارە بەسـەر ئێمـەدا دابارانـدەوە))، شێخ بە بەرەکەتی زانستەکەی لێکی دایەوە، نەوەك بە بەرەکەتی خـودی ئـەو!! [الفتـاوی ١/ ١٠٣]. وەهابییـەت لێکدانـەوە (تأویـل) دەکـەن، ئەگـەر شتەکە پەیوەست بوو بە شێخی مەزهەبەکانیانەوە، کەچی لێکدانەوە بۆ شێخ و زانایـانی مەزهەبـەکانی تـر ناکـەن (بـۆ زانیـاری پێشـینە حەنبەلییـەکان سـۆفی بوونـە). هـەر بۆیـە کاتێـك شـێخ وتـەی هاوەڵـانی پێشـەوا ئەحمـەدی بینـی ((تەوەسول کردن بـە پیاوچاکان)) لێکدانـەوە (تأویـل)ی کـرد بـەوەی مەبەسـت لەمـە تکاکردنـە بـە نـزا و دوعاکانیانـەوە، نـەوەك بـە خـودی ئـەوان!! (٣/ ١٥٩)، ئەمەش لێکدانەوەیەکە تـەنها حەنبەلییـەکان دەیکـەن، ئەگـەر کەسـێکی تریـان بینی ئەمە بکات، ئەوا بە هاوبەشدانان و بیدعەچێتی وەسفی دەکەن...!.

**٢- سەرەدانکردنی گۆڕی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) لەلای حەنبەلییەکان:**

کاتێك لە توێژینەوەکانی ڕابردوودا وتمان: وەهابییەکان لە پرسی گۆڕ و تەسەوفدا، پشت بە ئیبن تەیمیە دەبەستن، نەوەك بە حەنبەلییەکان، هەر بۆیە شێخ واق ورما کاتێك بینی حەنبەلییەکان لە کتێبە فیقهییەکانیاندا چەسپاندوویانە: ((سوننەتە سەردانی گۆڕی پێغەمبەر "درود و سڵاوی خوای لێبێ" بکرێ))؛ بیانو هێنانەوەکەی شێخ چۆن بوو؟! ئایا چۆن وتەی حەنبەلییەکان و وتەی ئیبن تەیمییە لەگەڵ یەکتردا دەگونجێنێ؟ کە وەهابییەکان شوێن ئیبن تەیمییە کەوتوون، لە بە بیدعەدانانی و هەژمارکردنی لە ڕیزی ئامرازەکانی هاوبەشدانان! ئەگەر باسەکە پەیوەست بێ بە سەفەرکردن. ئەوا شێخ وتویەتی: ((وتەی حەنبەلییەکان کە دەڵێن: سوننەتە سەردانی گۆڕی پێغەمبەر بکرێ، بەوە لێکدەدرێتەوە کە مەبەست لێ سەردانکردنی مزگەوتەکەیەتی! ئەمەش لە میانەی بردنی گومانی باش بە زانایانەوە... تاد)) (٦/ ١٣٦).

کەواتە شێخ لە نێوان دوو شتدایە: یان دەبێ پاساو بۆ زانایانی مەزهەبەکانی تریش بهێنێتەوە، گومانی باشیان پێ ببات، وەك چۆن گومانی باشی بە حەنبەلییەکان بردووە، بیانوی بۆیان هێناوەتەوە – لە کاتێکدا بیانو هێنانەوەیەك لاوازە –، یان دەڵێت: سەردانکردنی گۆڕی پێغەمبەر لای زانایان و حەنبەلییەکان سوننەتە، لای ئیبن تەیمییەش بیدعەیە، دواتر یەکێك لە ڕا و بۆچوونەکان پەسەند دەکات. بەڵام ئەم پاساو هێنانەوەیەی شێخ بۆ حەنبەلییەکان تەنها دەمارگیری و لایەنگیرییە. زۆر جار ئەم دوو ڕوویی و تێکگیرانە لە وەهابییەکانەوە دەبینرێ، لەوانەیە بۆ ئەوە بووبێ تا هەندێك (خەڵکی سوننیان لەگەڵ بمێنێتەوە)، چونکە شێخ و وەهابییەت لە پێشتر ئەگەر حوکمەکانیان بەبێ لادان دابەزاندبایە سەر هەمووان، ئەوا هیچ کەسێکی

سـونیان لەگەڵـدا نـەدەما، کـە بـە بەڵگـەی بهێننـەوە، تەنانـەت لەوانەیـە هـیچ موسڵمانیشیان لەگەڵدا نەمابایە. کار گەیشتووەتە حەنبەلییەکان، هـەروەك لـەم پرسە و هاوشێوەکانیدا دەیبینی.

٣- **موفتی هەرە گەورە (باڵا)**: شێخ بـە نازنـاوی مـوفتی هـەرە گـەورە (باڵا) نـاوزەد دەکرا، ئەمە دەچێتە ناو ئەو زیادەڕۆچوونەی کە وەهابییەت نکوڵی لێکـردووە، کەمتریش نییە لێی وەك: ((سەروەرمان پێغەمبەری خوا، گەورەمان پەیامبـەری خوا، عەلی خوا ڕووخسار ڕێزدار کردووە، پێشـەوا عـەلی، دادوەری دادوەران فڵان کەسە... تاد)). وەك ئەوەی هەندێك لە وەهابییـەکان ئـەم نازناوەیـان بـە کێشـە داناوە، بۆیە پرسیاریان لە شـێخ کـردووە دەربـارەی ڕەوایـەتی ئـەم نازنـاوە، جـا وەڵـامێکی درێـژی داوەتـەوە، کـە ئەمـە پوختەکەیـەتی: ((هـیچ کێشـەیەك لـەم نازناوەدا نابینێ)) (١/ ١٧٣)، ((لەبەر ئەوەی ئەگەر بە دەربرینـی (أفعل)ی پلـەی باڵاش هاتبێت، مەبەست لێی بە چاکتردانانی ڕەها و ململانێ نییە لەگەڵ خوا لە گەورەییدا، بەڵکو مەبەست لێی گەورەترین کەسی نێو موفتیەکانە و سەرچاوە و بناغەیە بۆیان...)). بەڵام یەکێك لەو وەهابیانەی دڵسۆزی ڕێبیرەکەیە ((ڕێبیری: فرێـدانی زیادەڕۆچـوون))، کـە شـێخ سـولەیمانی کـوڕی حەمدانـە، نکـوڵی لـە قوتابیـانی شـێخ و خـودی شـێخیش کـرد لەسـەر پەسـەند کردنـی ئـەم نازنـاوە، ڕەخنەیەکی توندی گرت لە شێخ و قوتابییەکانی، بەم وتەیەی: ((بەکارهێنانی ئەم نازناوە بۆ بەدیهێنـراو، بێ ڕێزی کردنە لەبەرامبەر پێگەی پەروەردگارێتی و ململانێی کردنە لەگەڵی لەسەر گەورایەتیدا!)). بەڵام شێخی موفتی هەرە مەزن

لـە بەرپەرچـدانەوەکەی بـۆ ئـیبن حەمـدان[1] سـوربوو لەسـەر (٥/ ٥٧، ١١٥، ١٤٤) ئەوەی هیچ نا دروستییەك لەم نازناوەدا نییە.

لێرەدا شێخ بەدوای وتەی زانایاندا گەرا، نەوەك لە دەقـە شـەرعییەکان بۆ ئەوەی پاساو بەمە بدات، هـەر بۆیـە بـینی حەنەفییـەکان نازنـاوی ((پێشـەوای مەزن)) بۆ ئەبو حەنیفە بەکاردێنن، ئەمەش بەوە دانانرێ لە پێگەی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) بە بەرزتر دانراوە... تاد.

دەڵێم: لێرەدا دەرکەوت؛ وەڵامدانەوەی شـێخ لاوازی و شـڵەژانێکی زۆری تێدایە، موفتی جیاوازە لەگەڵ پێشەوا، شێخ کردەوەکانی حەنەفییەکان بە بەڵگە ناهێنێتـەوە لـە شـوێنەکاتر تـردا، ئەی بۆچـی لێـرەدا کـە ناچـارە دەسـتی پێـوە دەگرێت؟ هەمیشە مەزهەبەکانی تر بەڵگەیان هێناوەتەوە بە کردەوەی زانایـانی مەزهەبـەکانی تـر لـە دژی وەهابیـەت، تـەنها یـەك وەڵامیـان لـە وەهابیەتـەوە دەسـتکەوتووە، ئـەویش ئەمەیـە: ((هـەموو کەسـێك شـتی لێـوەردەگیرێ و ڕەتدەکرێتەوە))!، ئەو شەرعناسانە: ((زانایانیـان کردۆتـە پـەروەردگار جگـە لـە خوای مەزن و شوێنیان کەوتوون))!، لێرەدا دەبینین شێخ پێچەوانەی پـەیرەوی وەهـابی جوڵاوەتـەوە، کاتێـك بابەتەکـە پەیوەسـت بـووە بـە ناونیشـانەکەی، بـە

(١) سەلمانی کوڕی حەمدان؛ یەکێکە لە زانا وەهابییەکان، کە دژی موفتی هەڵگەڕانەوە، نکۆڵی لە بێ دەنگی موفتی گرت لەسەر ئەوەی نەزانان ناویان لێناوە ((موفتی مەزن)) (٥/ ١١٦). بەڵام شێخ بەڵگەی بەوە هێنایەوە حەنەفییەکان نازناوی (پێشەوای مەزن) بۆ ئەبو حەنیفە بەکاردێنن، ئەمەش مانای کەمکردنەوەی پێگەی پێغەمبەر و بەگەورەگرتنی پێگەی ئەبو حەنیفە نییە لە هی ئەو...!.. سەرباری ئەوەی دوو نازناوەکە جیاوازیان هەیە. یەکێك لە چاکەکانی هەڵمەتی سولیەمانی کوڕی حەمدان دژی شێخ ئەوەیە کە گواستنەوەی مەقامی ئیبراهیمی وەستاند، هەندێك لە وەهابییەکان وەك: عەبدولڕەحمانی معلمی کتێبێکی نووسی تیایدا ئاماژەی کرد بە پێویستی پاك کردنەوەی (مزگەوتی حەرام) لەو شوێنەوارە!... بەڵام شێخ بەرگری لە معلمی کرد، بەڵام هەوڵەکەی ئیبن حەمدان بووە هۆی وەستاندنی مەقامی ئیبراهیم.

گەرمی و توونـدی بـەرگری لێکـردووە. لـە جێیـەکی تـردا بەڵگەی هێناوەتـەوە بەوەی موفتی مەزن (یەکێك نییە لە ناوە جوانەکانی خوا)، جا وتویەتی: ئەوەی وتویەتی خوا ((موفتی مەزنە، ئەوا ڕاست نییـە، چونکە یـەکێك نییـە لـە نـاوە جوانەکانی خوای مـەزن)) (١/ ٢٠٦)!.

دەڵـێم: ئـەی بۆچـی شـێخ محەممـەدی کـوڕی عەبـدولوەهاب و قوتابخانەکەی، کە شێخی ناوبراویش سەر بەو قوتابخانەیە، بـە توونـدی هێـرش دەکەنە سەر سۆفییەکان، بەهۆی ئەوە چەند نازناوێکیان لە پێغەمبـەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) ناوە، کە لە نێو ناوە چاك و بەرزەکاندا نەهاتوون، بەڵکو لـە کتێبی (التوحید)دا هاتووە، دروست نییە بوترێ: (دادوەری دادوەران یان پاداشای پادشایان)، چونکە دادوەری دادوەران و پادشای پادشـایان تـەنها خوایـە؛ لەگـەڵ ئەوەی ئەم دوو نازناوە لە لە ناوە چاك و جوانەکانی خوا نین!!!.

کەواتـە دەرەنجامێکمـان دەسـتدەکەوێ، ئـەویش ئەوەیـە کاتێـك شـتەکە پەیوەسـت دەبـێ بــە مەزهەبــەکانی تــرەوە، ئــەوا ((هاوبەشــدانان))ە یــان ((سەردەکێشێ و هۆکارێکە بۆ هاوبەشدانان))!، ئەگەر شتەکە پەیوەست بـوو بـە زانایانی مەزهەبی حەنبەلی و پیاوانیەوە، ئەوا ((هیچ کێشەیەکی تێدا نابینن))، چونکە لە ناوە چاك و پیرۆزەکان نییە، ((ئەوەش ئەمە بە یەکێك لە ناوە چـاك و پیرۆزەکان هەژمار بکات ئـەوا هەڵەیـەکی هـەرە قێزەونـی کـردووە))!!.. دواتـر ((سوودبەخش و زیانبەخش)) یەکێك نین لە ناوە چاك و پیرۆزەکـانی خـوا، لـە کاتێکدا ئێوە ئەو کەسە کافر دەکەن، کە دەڵێت: فڵان کەس زیانبەخشە یان فڵانە سوودبەخشە، لەگەڵ ئەوەی مەبەسـتی لەمـە سـوودێکی تایبەتـە نـەوەك ڕەهـا و زیانێکی تایبەتە نەوەك بێ سنوور، لەگەڵ ئەوەی کردەوە گەڕاوەکەی بۆ ناوێـك بەکارهێناوە کە یەکێك نییە لە ناوە چاك و پیرۆزەکانی خوا.

٤- **وشەی (سەروەرمان محەممەد)**: لە الفتاوی (١/ ١٩٥) و (١٣/ ١٥٤) هاتووە واباشترە فەرامۆش بکرێ، هۆکارەکەشی بۆ پاراستنی ((سنووری یەکخواناسییە))! پاك و بێگەردی بۆ خوا... بەکارهێنانی نازناوی موفتی مەزن... و شای مەزنی شکۆدار... بەدروست داناوە! ئەمە تێکگیرانە.

٥- **فەتوای داوە بەوەی پێویستە بەدواداچوون بۆ ناوی خەڵك بکرێ لە نوێژی بەیانیدا**: (٢/ ٢٧٥). لەگەڵ ئەوەی ئەمە بیدعەیە، پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) و جێنشینە سەرڕاستەکانی ئەنجامیان نەداوە، ئەمە دژە لەگەڵ گەرم و گوڕییەکەی لە ڕێگری کردن لە بیدعە و لەگەڵ ئەو دروشمەی (دوایینی ئەم ئوممەتە تەنها بەوە چاك دەبێ کە پێشینی ئەم ئوممەتەی پێ چاك بووە)... ئەگەر شێخ وەڵامی دایەوە ئەمە لە بەرژەوەندییە ڕەهاکانە، یان بیدعەیەکی چاکە، وەك چۆن عومەر خەڵکی کۆکردەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژی تەراویح، ئەوا لایەنگیرانی ئاهەنگ گێڕان بە بۆبەنی لەدایکبوونی پێغەمبەر هەمان وەڵام دەدەنەوە. کەواتە شێخ و زیادەڕۆچووان مەبەستی ڕاست و جددی نییە لە بنەما یاساییە مەزنەکان کە دووبارەی دەکاتەوە... پێغەمبەری خوا ڕاستی فەرموو: ((هەر کەسێك بە توونددی ئایین بگرێ، ئەوا ئایین بەسەریدا زاڵ دەبێ)).

٦- **بیروباوەڕی سەفارینی**: شێخ باسی ئەوەی کردووە هەندێك بۆچوونی ئەشعەری هێناوەتە ناو بیروباوەڕی ئەشعەریدا (١/ ٢٠١)، کە ناوەکەی ئەمەیە: (الدرة المضية في عقيدة الفرقة المرضية). ئەم کتێبە ئەمڕۆ لای سەلەفییەکانی ئێستا ناسراوە بە یەکێك لە کتێبەکانیان لە بواری بیروباوەڕدا هەژمار دەکەن. ئەمە تێکگیرانە

شێخ کتابه‌که ده‌خوێنێته‌وه هانی خوێندنه‌وه‌ی ده‌دات، له‌کاتێکدا ئه‌شعه‌ریه‌تی تێدایه، به‌هه‌مان شێوه کتێبه‌کانی مه‌زهه‌کانیش له هه‌ڵه به‌دەر نین.

٧- **کتێبی ( لمعه الإعتقاد ):** شێخ باسی ئه‌وه‌ی کردووه، ئه‌وه‌ی مه‌قده‌سی حه‌نبه‌لی له (لمعة الإعتقاد)دا هاتووه، له‌سه‌ر مه‌زهه‌بی موفه‌ویزه‌کان جێبه‌جێ ده‌بێ، مه‌زهه‌بی موفه‌ویزه‌کانیش له خراپترین و پیسترینی مه‌زهه‌به‌کانه (١/ ٢٠٣). له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی شێخ ستایشی دانه‌ری کتێبی ناوبراو ده‌کات و به پێشه‌وای ئه‌هلی سوننه ناوی ده‌بات!... ئه‌مه‌ش تێکگیرانه، چۆن ده‌کرێ له یه‌ك کاتدا مه‌قده‌سی شوێنکه‌وتووی خراپترین مه‌زهه‌ب و سه‌له‌فیش بێ؟! لێره‌دا ده‌گه‌ین به‌و ده‌رەنجامه‌ی به‌بیدعه‌چی دانان گه‌یشتووه‌ته کتێبه‌کانی ((پێشه‌وایانی ئه‌هلی سوننه له حه‌نبه‌لییه‌کان))! ئه‌مه نامه‌یه‌کی دکتۆرام بیر دێنێته‌وه، که هی شێخ سه‌عیدی کوڕی مسفره له باره‌ی (عه‌بدولقادری گه‌یلانی و بیروباوه‌ڕه‌که‌ی)، دکتۆری ناوبراو جه‌سته بڕیار ده‌دات بۆ خوا و سۆفییه، به‌ڵام حه‌نبه‌لیه‌ته‌که‌ی تکای بۆ کردووه، ڕایه‌کانی حه‌نبه‌لییه‌کان و وه‌هابییه‌کانی له بۆچوونه‌کانیدا کۆکردۆته‌وه له باره‌ی گه‌یلانی: ((که‌سێکی سوننی سه‌له‌فییه له بیروباوه‌ڕدا، به‌ڵام هاوبه‌شدانه‌ره یان له هه‌ندێك شتدا هاوبه‌شی بڕیارداوه بۆ خوا))!...

٨- **به‌رگری کردن له ئیبن ته‌یمییه :** شێخ باسی ئه‌وه‌ی کردووه هه‌ر که‌سێك ناوه‌کانی خوای له کرده‌وه‌کان داتاشیبێ وه‌ك: مورید له (ئیراده) و شائی له (مه‌شیئه)... تاد ((ئه‌وا خراپترین هه‌ڵه‌ی کردووه)) (١/ ٢٦) — ئه‌مه‌ی له میانه‌ی به‌رگری کردن له نازناوی: موفتی مه‌زندا وتوه، به‌وه‌ی یه‌کێك نییه له ناوه‌کانی خوا —، جا کاتێك شێخ بۆی ده‌رکه‌وت ئیبن ته‌یمییه وشه‌ی (شائی) به‌کارهێناوه وه‌ك ناو بۆ خوا، ئه‌وا موفتی پاساوی بۆ هێناوه‌ته‌وه، وتویه‌تی: ((ئه‌مه ناوی بکه‌ری

شائەیە، لە هەواڵدانەوە لەبارەی خواوە هاتووە، بە وشەی ناو، نەوەك بە ناوی دانابیٚ)) (١/ ٢٠٥)... دەڵێم یان دەبیٚ ئەم پاساو هێنانەوەیە بگشتێنیٚ، یاخود دەبیٚ بڵیٚ: ئیبن تەیمییە ((خراپترین هەڵەی کردووە)). بەڵام لە میانەی شارەزایی من لەم قوتابخانەیەدا هەر لە ڕۆژانی ئەحمەدەوە (ڕەحمەتی خوای لێبیٚ)، ئەوا توونددگیریان لە دەربڕیندا ئەوا تەنها دژی کردەوە و بۆچوونی ئەوانەیە، کە لەسەر مەزهەبی ئەوان نین.

بەڵام ئەگەر یەکێك لە حەنبەلییەکان یاخود وەهابییەکان کەوتە ناو هەمان هەڵەوە، ئەوا پاساوی لەو شێوەیە دێننەوە. بەداخەوە، ئەم دوو فاقی و تێکەڵکارییە گشتییە لە تێکڕای ئەو مەزهەبە ئیسلامییاندا دەبینریٚ، کە من شارەزاییم تیاندا هەیە، ئەوە دەخرێتەڕووله فەتواکانی شێخ ئیبن بازدا هاتووە. نکوڵی کردووە لەوەی پێی وایە کەسانێك لە سۆفییەکان لەسەر ئاو دەڕۆن. کاتێکیش پرسیاری لێکرا دەربارەی ئیبن قودامەی مەقدسی، کە ئەوانەی ژیاننامەکەی ئەویان نووسیوە، ئاماژەیان بەوە کردووە کە ئیبن قودامە لەسەر ئاو دەڕۆیشت، ئیبن باز وتی: ئەمە کەرامەتە!!!. مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە هەڵنەخەڵەتێین بە ژیرگەراییان، کاتێك وەڵامی سۆفییەکان یان ئەشعەرییەکان و شەڕعناسە لاساییکەرەوەکان دەدەنەوە، ئەوان لەم ژیرگەراییەیاندا ڕاست ناکەن و جدی نین. بە بەڵگەی ئەوەی ئەوان پاشگەز دەبنەوە، ئەگەر شتەکە پەیوەست بوو بە کردەوەی یەکێك لە حەنبەلییەکانەوە.

٩- **ڕاڤەکاری کتێبی (الزاد) کەسێکی ئەشعەرییە:** شێخ لە (١/ ٢٠١) ڕاڤەکاری کتێبی (الزاد) لەسەر ڕێچکەی ڕاڤەکاران ڕۆیشتووە، کەوتۆتە ناو بیروباوەڕی ئەشعەرییەکانەوە، ئەشعەرییەکان بەشێکن لە جەهمییەکان! لەگەڵ ئەمەشدا شێخ هەڵساوە بە وتنەوەی کتێبی ناوبراو، چونکە خاوەنەکەی کەسێکی

حەنبەلییە، لەکاتێکدا کتێبەکانی ئەشعەرییەکان دەسوتێنرێن و لە ناودەبرێن بەبێ هیچ دەستەبەری (زەمانەت)ێك.

١٠- **دیاریکردنی کات لە نێوان بانگدان و قامەت:** ئەم فەتوایەیدا لە وتارێکدا بۆ شا سعود (٢/ ١٣٢). ئەم دیاریکردنە – ئەگەر بەگوێرەی پەیڕەوی ئەوان بگشتێندرێ – ئەوا بە بیدعەیەك دادەنرێ کە پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) و هاوەڵان و شوێنکەوتووان و پێشینە چاکەکان نەیانکردووە. ئەمە شێوازی پەیڕەوی وەهابییە. تەنگ بەوانی تر جگە لە خۆیان هەڵدەچنن، ئەو بیدعانەش نابینن کە خۆیان دایدەهێنن، بەپێی پێناسەکەیان (من ناڵێم ئەم دیاریکردنە بیدعەیە، زۆرێك لەو شتانەش بیدعە نین کە وەهابییەکان وەسفی ئەوانی تری پێ دەکەن.. نا، بەڵکو لێرەدا من تەنها ڕەخنە لە تێکگیران دەگرم). هەر کەسێك ئایین بە توندی بگرێ، ئەوا ئایین بەسەریدا زاڵ دەبێ.

١١- **ڕەوایی بیدعەیەك:** لە نامەیەکدا کە بۆ دادگاکان ڕەوانەی کردبوو، شێخ باسی کردووە (پێویستە لەسەر پێشنوێژ خوێنی هەر مزگەوتێك، لە دوای نوێژی بەیانی، ڕۆژانە هەڵبستێت بە فێرکردنی سێ کەس یان زیاتر لە کۆمەڵەی مزگەوتی خۆی و شارەزاکردنیان لە بنەماکانی ئایین و مەرجەکانی نوێژ... مەجلیسێکی ڕۆژانەیان بۆ گرێبدات...) ... (١/ ٨٩)... دەڵێم: ئەم کارە بیدعەیە، لەلای ئیبن باز و لیژنەی هەمیشەیی فەتوادان... هەروەك دەخرێتەڕوو...

١٢- **پاشای خاوەنشکۆی مەزن:** شێخ پێی وایە هیچ شتێکی تێدا نییە، چونکە شکۆیەکی هایە شایستەی خۆی (١/ ٢٠٦)، ئەمە باشە، ئەی بۆچی شێخ نەیوت واز لێهێنانی باشترە، هەروەك وتی وازهێنان لە بەکارهێنانی ((سەروەرمان باشترە))، یاخود بۆچی نەیدەوت پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) سەروەریەکی

شایستەی خۆی هەیە، بەتایبەت کە پێغەمبەر گەورەی نەوەکانی ئادەمە؟ ئەگەر نازناوی (پاشای خاوەنشکۆی مەزن) بۆ پاشایەکی دیکە جگە لە پاشای شانشینی عەرەبی سعودی بەکار هاتبووبا، ئەوا شێخ دەیوت: تەنها خوا خاوەن شکۆ و گەورە و مەزنە...و...و...تاد.

ئێمە زانستێکمان دەوێ بڕوا پێکراو بێ، تا هەمووان دەزانن بە زیادەڕۆچووانیشەوە کە ئێمە تێکناگیرێین، ئەم بڕوا پێکرانە تەنها بە دوو شت دێت: یان بە لادانی زیادەڕۆچوون لەو شوێنانەی زمان لووسیمان تێداکردووە یاخود کەم کردنەوەی زیادەڕۆچوون لەو شوێنانەی زیادەڕۆچوونمان تێدا کردووە؛ بەڵام لە یەك کاتدا نکۆڵی بکەین لە بەکارهێنانی (سەروەرمان پێغەمبەری خوا) و دانبنێین بە بەکارهێنانی (موفتی مەزن) و (پاشای خاوەنشکۆی مەزن)، ئەمە تێکگیرانێکە متمانە کەم دەکاتەوە.

١٣- **ئاگر بۆ بێ باوەڕ و کافر نابڕێنەوە:** ئەوەی بە بێ باوەڕی و کافری دەمرێ دەڵێین: خەڵکی ئاگرە (٣/ ١٨٧). ئەمە هاوسەنگییەکی باشە لە شێخەوە، لەگەڵ ئەوەی لە چەندین شوێنی تردا بۆنی ئەوە دەکەین کە ئاگر بڕاوەتەوە بۆ کەسانی ڕکوعبەری سوژدەبەر.

١٤- **سەربڕین لەلای گۆڕ ناپەسەندە!:** شێخ ڕوونکردنەوە و سەرنجی داوە لەسەر یەکێك لە دەقە فیقهییە حەنبەلیدا: ((سەربڕینی ئاژەڵ لای گۆڕ ناپەسەندە))، بەوەی مەبەستی ناپەسەند بوونە، بەڵام لە ڕووکەشدا وادیارە بە حەڕام دانراوە (٣/ ٢٣٥). دواتر ئەوەشی وتوە کە حەنبەلییەکان مەبەستیان لەمەدا نزیك بوونەوە نییە لە بەدیهێنراودا.

دەڵێم: ئەمە پاساو هێنانەوەیە بۆیان، لەبارەی شتێك کە لە دڵی ئەواندایە و ئێمە لێی نازانین، لەگەڵ تۆمەتبارکردنی مەزهەبەکانی تر بەوەی لە دڵەوە مەبەستیانە لە بەدیهێنراوان نزیك ببنەوە، ئەمەش لەبارەی شتێکەوەیە لە دڵی ئەواندا، کە ئێمە نایزانین. ئەگەر شێخ – و هەموو وەهابییەکان – پاساویان بۆ هەمووان یان هەموانیان تۆمەتبار بکردایە، ئەوا ئەمە زۆر باوەڕ پێکراوتر دەبوو. یان ئەگەر حەنبەلییەك بیکات ناپەسەندە، ئەگەر شافیعییەکیش بیکات هاوبەشدانان بێ بۆ خوا، گومان لەوەدا نییە ئەمە دەمارگیرییەکی دیار و ئاشکرایە، هەروەها بەڵگەیەکیشە لەسەر ئەوەی جۆش و خرۆشی لە هێرشکردن یان بەرگری کردندا شتێکی مەزهەبیە، نەوەك ئاینی بێ[1].

١٥- **یەکدەنگی:** شێخ و زۆرێك لە زانا سەلەفییەکان، لە کۆن و نوێدا بەڵگەیان بە یەکدەنگی هێناوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی زۆربەی ئەم یەکدەنگیانە خەیاڵی و بێ بنەمان؛ بەڵام کاتێك دژی یەکدەنگیەکی بەهێزتر هەڵسوکەوت و فەتوا دەدەن، ئەوا دەچن پەنا بۆ ڕەتکردنەوەی یەکدەنگی دەبەن یان دەڵێن یەکدەنگی شوێنێك یان وڵاتێك مانای یەکدەنگی موسڵمانان ناگەیەنێ! ئەمە ژیرگەرایيە – بەداخەوە – لەگەڵی ناگونجێن، بەڵکو لەو کاتەدا بەکاری دێنن، کە پێویستیان پێ هەیە، شێخ باسی ئەوەی کردووە: یەکدەنگی هەرێم و وڵاتێك مانای یەکدەنگی موسڵمانان ناگەیەنێ، ئەی چۆن کردەوەی کۆمەڵێکیان بە مانای یەکدەنگی موسڵمان دێ (٣/ ٦٥).

دەڵێم: لەگەڵ یەکەم سەیر کردنەوە هاوسەنگی پێوە دیارە، بەڵام کاتێك دەزانین شێخ ئەمەی باسکردووە لە میانەی هێرشکردنە سەر یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر، لە چوار چێوەی بەرگری کردن لە زانایانی شانشینەکە، کە

هەندێك ئەوانیان تۆمەتبار کرد بە سەرپێچی کردنی یەکدەنگی ئوممەتی ئیسلامی لە ئاهەنگێران بەم بۆنەیەوە، شێخ باسی ئەوەی کردووە ئەوان دژی یەکدەنگی نەجوڵانەتەوە، چونکە یەکدەنگی وڵاتێك مانای یەکدەنگی هەموو وڵات و شار و کۆمەڵەکانی ناو وڵات و شارەکە ناگەیەنێ، ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە ئێمە بە وەهابی و سەلەفییەکان دەڵێین، ئەم بەڵگەیە کە شێخ بەکاریهێناوە. ئەگەر لەگەڵی ڕۆیشتبایە و لە شتەکاندا بەکاریهێنایە، کە بانگەشەی بوونی یەکدەنگی لەسەر دەکرد ئەوا ڕاستی دەپێکا.

تەنانەت ئەگەر زانا حەنبەلییەکان ئینجا تەیمییەکان پاشا وەهابییەکان پەییان بەمە بردبا، ئەوا دان بە بەرامبەردا دەنرا و زۆرێك لە کێشەکان نەدەمان. هەر لەم چوارچێوەیەدا ئەوان حوکمی هاوبەشدانان بەسەر شتێکدا دەدەن ئەگەر جگە لەوان ئەنجامی بدات، ئەگەر هەندێك کەس لەخۆیان هەمان شت بکەن ئەوا لێکدانەوە (تأویل)ی بۆ دەکەن، ئا بەم شێوەیە متمانەی لاواز دەبێ ئەگەر هەر نەمێنێ لە زۆربەی ئەو شتە تەنهایانەی کە پێی لە موسڵمانان جیا دەبنەوە.

١٦- **بەسەرهاتی داماڵینی بەرگی کتێبی (التوحید):** بە زنجیرە شێخ لە زانستخوازێکی نەجدی بە ناوی عەبدولڕەحمانی بەکری باسی کردووە (ناوبراو خاوەنی بەسەرهاتەکەیە لەگەڵ شێخێکی هیندی کە نەفرینی لە شێخ محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب کردووە) (١/ ٧٥). کۆکەرەوەی فەتواکانی شێخ باسی ئەوەی کردووە کە ئەم بەسەرهاتەی لە زۆر شێخەوە بیستووە. وەهابییەکان لەسەر ئەمە نین، لەوانەیە کتێبێك فەرامۆش بکەن، چونکە خاوەنەکەی فڵان کەسی ئەشعەرییە یان سوفییە، تەنانەت ئەگەر کتێبەکە هیچ یەکێك لەم ڕا و بۆچوونانەشی تێدا نەبێ ئەوا هەر قبوڵی ناکەن، لە کاتێکدا هەندێك کتێب

قبوڵ دەکەن، کە فەرموودەی لاواز یان بیدعەشی تێدایە، تەنها لەبەر ئەوەی دانەرەکانیان حەنبەلین، وەك پێشتر، هەروەك لە بڕگەی داهاتوودا دەخرێتەڕوو.

١٧- **ئیبن کەسیر و ئیبن قودامە و چیرۆکی عوتبی:** ئەمە چیرۆکێکە ناوەڕۆکەکەی باس لەوە دەکات نابینایەك تەوەسولی بە پێغەمبەرەوە (درود و سڵاوی خووای لێبێ) لە دوای کۆچی دوایی کردنی کردووە، خوای مەزنیش بینایی بۆ چاوەکانی گێڕاوەتەوە، ئەم چیرۆکە یەکێکە لە بەڵگەکانی سۆفییەکان لە تەوەسوول کردن بە پێغەمبەرەوە بۆ لای خوا، شێخ دانی بەوەدا ناوە کە: ((ئیبن کەسیر و ئیبن قودامە – کە دوو کەسی حەنبەلین –، بەرپەرچی ئەم چیرۆکەیان نەداوەتەوە، ئەوەش کە هەڵە و لەبیرچوونەوە بەسەریدا نایە دیارە)) (١/ ١٧٦).

دەڵێم: ئەم دوو ناوبراوانە لە بیروباوەڕدا حەنبەلین، پێیان وایە دروستە تەوەسول بە پێغەمبەرەوە (درود و سڵاوی خوای لێبێ) بکرێ لە دوای کۆچی دوایی کردنی، بەڵام پاساوی بۆیان هێناوەتەوە بە لەبیرچوونەوە و هەڵەکردن! نا، لەبیرچوونەوە و هەڵە نییە، یان ئەگەر وایە با ئەم پاساوە بۆ هەمووان بهێنێتەوە.

## ( خاڵە ئەرێنییەکانی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم )

شتێکی گونجاو نییە، ماڵئاوایی لە شێخ بکەین بەبێ باسکردنی هەندێك لە خاڵە ئەرێنییەکانی فەتواکانی – هەر چەندە کەمیشن –، لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لە فەتوا زیادەڕۆچووەکانی ئەومان فەرامۆش کرد – هەر چەندە زۆریشن –، بەڵام ئەمە بۆ ئەوەیە تا نەوترێ ئێمە تەنها جەخت لەسەر خاڵە نەرێنییەکان دەکەینەوە، لەکاتێکدا ئەوان تەنها باسی خاڵە باشەکان دەکەن.

زیادەڕۆچــووان جــەخت دەکەنــەوە لەســەر شــوێنەکانی تــەکفیر، زانــ فەرمییەکان شتی کورتبڕ دەگوازنەوە.

زیادەڕۆچووان شتی ورد و دوور و درێژ دەگوازنەوە، بەڵام زانایان تـەنێ شتی کوتبڕ دەگوازنەوە.

هەمووان کۆکن لەسەر ئەوەی وردەکاری پێش کورتبڕیەوە.

کۆت و بەندکراو لە پێش ڕەها دەخرێ!!

ئەمە جەنگی زانا و زیادەڕۆچووانە، کە بـە سـەرکەوتنی زیادەڕۆچـووان کۆتایی دێت، ئەگەر هیچ نوێکارییەکی هزری گشتگیر نەبێ، کە لە دەقـە باڵاکـان وەربگـیرێ – لەگـەڵ زانینـی ئاسـتی گومانـدار و دڵنیاییەکـەی – چ لـە قورئـانی پیرۆز یان ژیاننامەی پێغەمبەر، بە مـەرج هێشتنەوەی مـاوە بـۆ ڕا و بۆچـوونە میانڕەوەکان، لە بەڵگە هێنانەوە ڕاڤەدا، بۆ دەرچوون لە ڕاڤەی وەهابی سـەلەفی حەنبەلی تەیمی و ڕەخنە لێگرتنی، وەك چۆن ڕەخنـە لـە ڕاڤـەکانی تـر دەگـرێ ئەگـەر پێچـەوانەی بەڵگـە بـێ. بـەڵام ئـەوەی لێـرەدا نوێسـازیەك هـەبێ بـەبێ ڕەخنەگرتن لە بۆچوونی پێچەوانە، ئـەوا ئەمـە کـرداری نوێسازی و چاکسازی هزری دوادەخات.

بە هەر حاڵ؛ شێخ هەندێك ڕا و بۆچوون و فـەتوای بـاش و هاوسـەنگی هەیە، بەشێوەیەکی ڕێـژەیی، دیارترینیـان لێـرەدا دەیخەمـەڕوو، ئامـاژە بـەوەش دەدەم شێخ پێچەوانەی زۆربەیان جوڵاوەتەوە لە چەندین شـوێندا، بـەڵام دەبـێ ئەم ڕا و فەتوا هاوسەنگانە یان بۆ زۆربەیان ڕوونکردنەوەیان بۆ بکرێ.

١- **وتەکەی لەبارەی یەکخواناسیەوە:** وتەیەکی جوان و ئاسانی هەیە، لەبارەی دانـان بە خـوای بەدیهێنـەر و بەڵگـەکانی بـوونی ئـەو (١/ ٢٩)، گونجـاوە بـۆ ئـەوەی لـە بەرنامـەکانی خوێندنـدا دابنـرێ، لـە جیـاتی کۆکردنـەوە و داگرتنـی پـەیڕەوی خوێندن بە وتە دەربارەی هاوبەشدانان و هاوبەشدانەران.

٢- **ئیلحاد و خوانەناسی لە بتپەرستی خراپترە:** ئەمە بۆچوونێکە پشتی پێنابەسترێ لەلایەن دانەرانی پەیڕەوە ئاینییەکان، تەنها بایەخ دەدەن بە دووبارە هۆشداریدان لەبارەی موسڵمانە هاوبەشدانەرەکان. شێخ دەڵێت: ((بانگخوازانی ئیلحاد و خوانەناسی مەترسیان لەسەر گەنجان زیاترە لە مەترسی بانگخوازانی بتپەرستی، ئەوان بە شێوازە زۆرەکانیان لە ناو خەڵکدا بڵاوبوونەتەوە، بۆیە زیانی ئەوان زیارە، هاتوچۆ زیاتر لەگەڵ ئەواندایە))[الفتاوی: ١/ ٣١].

٣- **نستی کەلام:** هەڵوێستێکی هاوسەنگی هەیە لەبارە زانستی ژیربێژی و زانستی کەلام (١/ ١٩٩)، بە پوختی لەو بارەوە وتویەتی: ((زانستی ژیربێژی؛ شتێك لە ڕاستی تێدایە، لە کاتی پێویستدا باس دەکرێ، هەموو ئەوەی لە زانستی ژیربێژیدا دانراوە پوچەڵ نییە، بۆ ئەوەش دروست نەکراوە تا هەموو ڕاستییەکی پێ پوچەڵ بکرێتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم زانستەش پارێزراو نییە... ئیبن تەیمییە و ئیبن قەییم و ئەشعەری لە کاتی پێویستدا بەکاریان هێناوە)).

٤- **سەربرینی ئاژەڵ لای گۆڕ وردەکاری تێدایە:** ئەگەر بۆ خوا بوو، ئەوا سەربرینی ئاژەڵ لای گۆڕ گوناه و سەرپێچییە، ئەگەر بۆ نزیك بوونەوەش بوو لە خاوەن گۆڕەکە، ئەوا ئەم کارە هاوبەشدانانی مەزنە (١/ ١٣١).

٥- **ڕۆژگار:** پێی وایە هیچ ڕێگییەك نییە لەوەی شتێك بدرێتە پاڵ ڕۆژگار و سەردەم، بۆ نموونە: ((بارودۆخ ڕێگەی نەدام، کات و سەردەم یارمەتیدەرم نەبوون لەسەر فڵان کارە؛ چونکە ئەم شتە بڵاوە و باوە لە قورئان و سوننەتدا:

﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ ﴾ واتە : ( بەڕاستی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هات ) ،((هەر سەردەمێك بەسەر خەڵکدابێ ئەوا سەردەمی دواتر لەو خراپتر دەبێ)) (١/ ١٧١).

دەڵێم: کەواتە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە لە بارەی قەدەغەکردنی تانەدان لە ڕۆژگار پوچەڵە، تانەدان و سەرزەنشتکردنی ڕۆژگار بریتی نییە لە سەرزەنشتکردن و تانەدانی خوا، لە فەرموودەکەدا هاتووە کە هەندێك ڕۆژگار خراپترن لە هەندێکی ترە.

٦- **پاداشتی بیدعەچییەکان:** هەندێك لە بیدعەچییەکان، پاداشت وەردەگرنەوە لەسەر نیاز و مەبەستیان، نەوەك لەسەر ئەو کردەوانەیان کە تیایاندا هەڵەیان پێکاوە، ئەگەر هاتوو کەسەکە موسڵمان بوو، بەڵام هەندێك بیدعەی دزێوی تێدابوو، لە کاتێکدا بڕوای بە خوا و پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دوایی هەبوو، بەڵام ڕاستی بە تەواوی نەپێکاوە بەهۆی کرچ و کاڵی ڕا و بۆچوونەکەی (١/ ٢٤٧).

٧- **هەواڵی تاقانە (ئاحاد):** ئەگەر هاوبەڵگەی لەگەڵ هاتن، ئەوا زانست و دڵنیابەخش دەگەیەنێ، نەوەك تەنها گومان (١/ ١١).

دەڵێم: مەرجی هاتنی هاوبەڵگە لەگەڵ هەواڵی تاقانە بۆ بەدەستەوەدانی زانستی دڵنیابەخش، شتێکی باشە، زۆربەی سەلەفییە هاوچەرخەکان لەسەر ئەمە نین، لەگەڵ ئەوەی هەموو گومانێك هاوسەنگی زیاد دەکات، تەنها سوربوون و زیادەڕۆچووان بەرەو زیادەڕۆچوون دەبات.

٨- **ڕاڤەکردن بە ئاماژە:** ئەم ڕاڤەیە دروستە، بەڵام سۆفییەکان زێدەڕەوییان تێدا کردووە، تا سنووریان بەزاند (٢/ ١٢).

٩- **ڕاجیایی هاوەڵان:** لە بەرپەرچدانەوەی بۆ فەرموودەیەکی لاواز ((هاوەڵانم وەك ئەستێرەکانن))، ئەوا باسی کردووە ئەگەر وتەی دوو هاوەڵ تێکگیران، یەکێکیان بڵێ: حەڵاڵە، ئەوەی تریشیان بڵێ: حەرامە، ئەوا دەبێ یەکێکیان ڕاستی پێکابێ و لەسەر ڕێنوێنی بێ، ئەوەی تریشیان بە هەڵەداچووبێ و لەسەر ڕێنوێنی نەبێ (٢/ ١٣)، دەڵێم: واتە ئەوەی تریان لە بۆچوونەکەیدا لە وێڵیدایە، چونکە گومڕایی لە بەرامبەر ڕێنوێنیە. بەڵام شێخ خۆی دوورگرتووە لە وەسفکردنی هاوەڵان بە گومڕایی، تا کۆك نەبێ لەگەڵ شیعەکان. بەڵام ئەوەندە بەسە بزانین کە شێخ پێی وانییە ڕا و بۆچوونەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر بەڵگەن. ئەمەش فراوانکارییە بۆ شەرع بەپێی چەند دەقێك کە لە سروش و نیگاوە نین.

١٠- **دانیشتنی حەسانەوە ( جلسه الإستراحه ) و زانستی فەرموودە:** شێخ پێی وایە شەرعی نییە، بەڵگەشی هێناوەتەوە بەوەی نوێژی پێغەمبەر ڕۆژانە ٥ جار لە ماوەی ١٥ ساڵدا دووبارە بۆتەوە، ئەی چۆن هاوەڵان نەیانگواستۆتەوە، لە کاتێکدا سیفەتی نوێژی پێغەمبەریان (درود و سڵاوی خوای لێبێ) بینیوە، تەنها یەك کەس گێڕاویەتیەوە، کەچی هاوەڵانی تر باسیان نەکردووە، لەوانەیە ئەمە بەهۆشی شتێکی لە ناکاوەوە ڕوویدابێ نەوەك بەشێوەیەکی بەردەوام بووبێ (٢/ ٢١٩).

دەڵێم: ئەمە ڕەخنەگرتنێکی باشە، شتەکانی تریش لەسەر ئەمە پێوانە بکە. ئەگەر وەهابییەکان بە گشتی لەسەر ئەم گومانە ڕۆیشتبووبان، ئەوا ئاشکرا دەبوو، کە زۆربەی ئەو فەرموودانەی بە بەڵگەی دێننەوە لە زیادەڕۆچووندا ڕاست نین، یان دژی بەڵگەیەکی بەهێزترن.

١١- **ئەو کەسە کافر ناکرێ کە تانە لە هاوەڵان دەدات:** (١٢/ ١٨٧).

ئه‌مه هاوسه‌نگیه‌کی نامۆیه که له یه‌کێك له وه‌هابیه‌کانه‌وه به‌رجه‌سته بووه. پرسیاری لێکرا: ئایا ئه‌و که‌سه کافر ده‌کرێ که تانه له هاوه‌ڵان ده‌دات؛ به کورتی وه‌ڵامی دایه‌وه: کافر ناکرێن.

ده‌ڵێم: ئه‌مه ڕاسته، تانه‌دان له هاوه‌ڵێکی ڕێزدا سه‌رپێچی و گوناهه. تانه‌دان له هاوه‌ڵای لاسار ئه‌وا ناپه‌سه‌نده یان ڕێپێدراوه. هه‌ندێك له پێشینان تانه‌یان له وه‌لیدی کوڕی عه‌قه‌به ده‌دا به‌هۆی دابه‌زینی قورئان له‌سه‌ر تاوانکارییه‌که‌ی. سه‌له‌فییه هاوچه‌رخه‌کان له‌سه‌ر ڕای شێخ نین، به‌تایبه‌ت ساده‌کانیان.

١٢- **کۆچکردنی پێویست و سوننه‌ت:** ئه‌وه‌ی باسکردووه: ((کۆچکردن له وڵاتی هاوبه‌شدانانه‌وه بۆ وڵاتی ئیسلام پێویست نییه، ته‌نها له‌سه‌ر ئه‌و که‌سه نه‌بێ که ناتوانێ ئاینی خۆی به ئاشکرا بکات و ده‌ریبخات، به‌ڵام ئه‌وه‌ی بتوانێ ئاینه‌که‌ی به ئاشکرا بکات ئه‌وا کۆچکردن بۆ ئه‌و سوننه‌ته (١/ ٩١)، له‌وانه‌یه سوننه‌تیش نه‌بێ ئه‌گه‌ر مانه‌وه‌ی موسڵمانه‌که له ناو وڵاتی هاوبه‌شداناندا به‌رژه‌وه‌ندیه‌کی ئاینی تێدابێ. ده‌رخستنی ئاینه‌که‌ی ته‌نها بریتی نییه له ئه‌نجامدانی نوێژ و هاوشێوه‌کان و خۆدوورگرتن له قه‌ده‌غه‌کراوه‌کان، به‌ڵکو به‌ئاشکرا نواندنی یه‌کخواناسی و خۆبه‌ریکردنه له‌و هاوبه‌شدانانه‌ی هاوبه‌شدانه‌ران له‌سه‌رینه)).

سه‌ره‌تای فه‌تواکه هاوسه‌نگییه، کۆتاییه‌که‌شی زیاده‌ڕۆچوونه. که لێره‌شمان هێناوه‌ته‌وه ئاماژه‌یه‌که بۆ که‌می فه‌توا هاوسه‌نگه‌کان، ته‌نانه‌ت ئێمه به که‌مترین هاوسه‌نگیش ڕازی ده‌بین، ئه‌گه‌ر کۆتاییه‌که‌شی به‌راییه‌که‌ی پوچه‌ڵ بکاته‌وه.

١٣- **هه‌ڵوێسته‌که‌ی له‌باره‌ی ئالوبه‌یت:** له‌گه‌ڵ لادانی له ئالوبه‌یت له چه‌ندین شوێنی زۆردا، ئه‌وا له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا هه‌ندێك جار وته‌ی جوان له‌باره‌ی ئالو به‌یته‌وه

دەکات، لەوانە ئەم وتەیەی:((دەبێ ئالوبەیت زیاتر لە موسڵمانان خۆشەویستتر بن)) [الفتاوى: ١/ ٢٥٤]. ئەمە شتێکی باش و ڕاستە، بەڵام هەرگیز هیچ سەلەفییەك هەستی پێناکات! چونکە هۆشداریدان لەبارەی زیادەڕۆچوون لە خۆشەویستیاندا لە یاد و عەقڵی سەلەف و وەهابییەکاندا جێگربووە، بە واتایەکی تر پێشێلکردنی مافەکانیان کە بە نەصب ناسراوە لای پێشینان لە مێشکیاندا چەقیوە.

١٤- **هەڵوێستەکەی لەبارەی زەیدییەکان:** لەم بارەوە (١/ ٢٥٦ - ٢٥٧) پوختەی وتەکەی دەهێنم، دەڵێت: زەیدییەکان میانڕەویان تێدایە، تەواو لەسەر ڕێی ڕاست نین لە پرسی ئەبوبەکر و عومەردا، بەشێك لە گۆڕپەرستیان لا هەیە، ڕێگری لە جگە لە خۆیان دەکەن بینایە لەسەر گۆڕ دروست بکەن، کەچی بەخۆشیان دروستی دەکەن، نکۆڵی لە گۆڕپەرستی شافیعییەکان دەکەن، گۆڕپەرستی لا شافیعییەکان زیاترە لەوەی لای زەیدییەکان هەیە، بەڵام موعتەزیلایەتی زیاتر لە ناو زەیدییەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. زەیدییەکان دەڵێن: ئێوە خەڵکی نا عەرەبی وەك بوخاری پێش ئالوبەیت دەخەن، ئێمەش دەڵێین: هەر کەسێك شایستەی پێشخستن بێ پێش دەخرێ، بوخاری لە کوێی دانراوی زەیدی کوڕی عەلیەوەیە؟ کتێبی بوخاری لای ئومەت ناسراوە. زەیدییەکان باشترن لەوانەی خەڵك بەرەو خەڵەتاندن دەبەن، ئەوانە ژەهرن!.

نازانمەبەستی کێیە لەوانەی خەڵك بەرەو دەستگرتن بە خەڵەتاندنەوە دەبەن، (لەوانەیە مەبەستی ئەهلی سوننە بێ لە شافیعییەکان و جگەلەوانیش لە یەمەن). لێرەدا دیارە زەیدیەکان بە چاکتر دادەنرێ لە ئەهلی سوننە کە دژەڕای وەهابییەتن، دان دەنێ بەوەی بەلایەنی کەمەوە زەیدییەکان لە ئەهلی سوننەی یەمەن لە یەکخواناسییەوە نزیکترن. سەبارەت بە بەچاکتردانانی

بوخاری لە دانراوەکەی زەید کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (کە بە موسنەدی پێشەوا زەید ناسراوە) شتێکی سروشتییە، چونکە بۆ مەزهەب دەگەڕێتەوە، هەر مەزهەبێك پێی وایە دانراوەکانی پێشینانی ڕاستترن لەوانەی تر.

١٥- **هەڵوێستی لەبارەی تەبەریەوە:** ئیبن جەریر بەرگە کتێبێکی لەبارەی فەرموودەی غەدیرەوە[1] نووسی، دەزانین کەمێك لە شیعەگەرایەتی تێدایە بەڵام نەگەیشتووەتە بیدعەچێتی (١/ ٢٥٧).

کەواتە هەموو شیعەگەرایەتیەك بیدعەچێتی نییە؛ لەوانە کەسێك شیعی سوننی بێ. ئەمەش هاوسەنگییە لە دابەشکردندا.

١٦- **هەڵوێستی لەبارەی بەیحانی:** لە (١/ ١٠٤) باسی ئەوەی کردووە، بەیحانی پێ وایە دروستە تەبەڕوك بە شوێنەواری پیاوچاکانەوە بکرێ. بەم هۆیەوە ناوبراو – لای شێخ و وەهابییەکان – هاوبەشدانەرە. بەڵام شێخ ئەمەی نەوت، بەڵکو ستایشی بەیحانی نووسەر کرد، کە ئەم وتەیەی لەبارەوە وت، کەواتە تێکگیران

(١) فەرموودەی غەدیر لەبارەی پلەوپایەی عەلیەوە هاتووە، ئەمەش دەقەکەیەتی: ((هەر کەسێك من گەورەی بم، ئەوا عەلی گەورەی ئەوە، خوایەگیان دۆستایەتی و پشتی ئەوە بگرە کە دۆستایەتی و پشتی ئەو دەگرێ، دژایەتی ئەو کەسەش بکە، کە دژایەتی ئەو دەکات))، فەرموودەکە سەحیحە، بەڵکو هەندێ لە فەرموودەناسان – وەك ئەلبانی – بێ چەند و چوون پێداگیریان کردووە لەسەر ئەوەی بەرێژنەیی – متواتر – هاتووە، ئەهلی سوننە بە سەحیحی داناوە، وەك: ئیبن حەجەر و زەهەبی و جگەلەوانیش... بۆیە ناوی نراوە فەرموودەی غەدیر، چونکە پێغەمبەر لە دوای حەجی ماڵئاوایی فەرموویەتی، لە شوێنێکدا کە ناوی غەدیری خومە، دەکەوێتە نێوان مەککە و مەدینە، بنچینەی ئەم فەرموودەیە لە سەحیحی موسلیم هاتووە. ئەم فەرموودەیە کۆڵەگەی شیعەیە لە چەسپاندنی وەسیەت بۆ پێشەوا عەلی، لە کاتێکدا ئەهلی سوننە کورتی هەڵدێنن لە پلەوپایە نەوەك لە وەسیەتدا. هەندێك لە ناصیبەکان (ماف پێشێلکەرەکان وەك ئیبن تەیمییە و هەندێك لە وەهابییەکان بە لاوازی دادەنێن.

بۆچی و لەچی؟ لەبەر ئەوەی ئەگر لە کەسێك تووڕە بوون یان مشتومڕی لەگەڵیان کرد لەبارەی دەڵێن: ((گۆڕپەرستەکان))، ئەگەر لێی ڕازی بوون، دەڵێن: ((نووسەرەکەی باشە، سوودبەخشە، گشت مرۆڤێکیش لە وتەکەی وەردەگیرێ و ڕەت دەکرێتەوە))!.

١٧- **حەنبەلییەکان و فەرمووده لاوازەکان:** شێخ باسی ئەوە دەکات، کە حەنبەلییەکان زۆر جار بەڵگە دێننەوە لە زۆر بابەتدا بە فەرموودەی نەناسراو، تەنانەت هەندێك جار بەڵگەی ناسراو و بەهێزتریش هەن (٢/ ١٧). ئەمە هاوسەنگییە لە شێخدا لە ڕەخنەگرتن لە حەنبەلییەکان.

١٨- **شوێنکەوتووانی مەزهەبەکان ئەشعەرین:** دانی بەوەدا ناوە زۆربەی شوێنکەوتووانی چوار مەزهەبەکە و هەندێك لە فەرموودەناسانیش ئەشعەرین (١/ ٢٠٠). ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زۆربەی ئەهلی سوننە لە شوێنکەوتووانی چوار مەزهەبەکەن، نەوەك مەزهەبی وەهابی. شێخ چەندین حوکمی توونـدی هەیە دەربارەی ئەشعەرییەکان، لەو حوکمانە: شایەتیان لێوەرناگیرێ و ئاژەڵە سەربڕاوەکانیشیان ناخورێن.

١٩- **وەك ئەوانی تر بە هەژارانی نەوەی هاشم دەدرێ:** (٤/ ١٤٧). ئەمەیان باشە، زەکات و سەدەقە حەرامە بۆیان، بەڵام لە پێنج یەکیشان پێنادرێ، لێرەدا لە دوو لاوە کێشەیان بۆ هاتووە، واباشتر بوو بیوتبا: پێویست بێ نیاز بکرێن بەشێوەیەك کە پێویستیان بە پێنج یەك نەبێ، بەڵام ئەگەر ئەمە فەراهەم نەبوو، ئەوا ناکرێ بە یەکجار نەوەی هاشم بێ بەش بکرێ لە پێنج یەك و زەکات.

٢٠- **دژی ئەو کەسە وەستایەوە کە ویستی هاتوچۆی نێوان سەفا و مەروە بکاتە دوو بەش:** واتە پیاوان لە ئافرەتان جیا بکاتەوە (٥/ ١٤٦)، ئەمەیان شتێکی باشە هەندێك لە وەهابییەکان دەیانویست لە هاتوچۆی نێوان سەفا و مەروە پیاوان لە ئافرەتان جیا بکەنەوە، بۆ ئەوەی تێکەڵاوی دروست نەبێ!...

٢١- **وەڵامی داوایەکی بەڕێوبەری قوتابخانەیەکی نەدایەوە لە باشور، کە داوای کردبوو قوتابیەك وەرنەگرێ کە ناوی (شوعی) بوو:** (٦/ ١٦٤). ئەمەشیان باش بوو. چونکە بەڕێوبەرەکە (شوعی).. (شیوعی)بوونی بەیەکەوە بەستبووەوە...!

٢٢- **ڕێگری کرد لە دروستکردنی یاریگایەك لە موزدەلیفە:** (٥/ ١٧٠)، ئەمەشیان باشە.

ئا بەم شێوەیە شێخ چەند خاڵێکی ئەرێنی هەبووە، بەکەمی نازانین، بۆی دەپارێینەوە خوای مەزن ڕەحمەت و لێخۆشبوونی خۆی بەسەریدا ببارێنێ.

## سیاسەتی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبڕاهیم

ئایا شێخ محەممەدی کوڕی ئیبڕاهیم سیاسی بووە؟! مەبەستم ئەوەیە ئامانجی سیاسی ستراتیژی هەبووە؟! بەوەی ڕۆژێك بێت و ڕەوتی مەزهەبی وەهابی حوکمڕانی وڵات بکات بەکردار؟.

ئەوەی فەتواکانی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبڕاهیم بخوێنێتەوە، بزانێ چۆن سیستەمە ئاینیە حوکمڕانەکانی داناوە، وەك: سیستەمی دەستەی فەرمانکردن بە چاکە و دادگا و بانگەواز، ئەوا ئەم ئامانجە ستراتیژییە بە شۆڕبووەوە لەبەر چاوی خۆی دەبینێ.

### فەتوایە سیاسییەکان :

مەبەست ئەوانەیە کە ڕەهەندی سیاسیان هەبووە، لە ناوخۆ و دەرەوەدا دیارن، مەبەست تەنها لە (پاشکۆیەتی سیاسی یان کاریگەربوون بە دۆخی سیاسی لە شانیشەکەدا) نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە ناوخۆ و دەرەوەدا کاریگەری زۆر بەهێزی هەیە، ئەوەی دەرەوە تەکفیری بۆ هەیە، ئەوەی ناوەوەش بە دووڕوویی و خراپە و گومڕایی ... تاد وەسف دەکرێ، بەڵام بەگوێرەی گونجان.

١- **سیستەمی کۆماری حەرامە:** پرسیار لەبارەی سیستەمی کۆماری و سەرۆکایەتی کۆماری لێکرا (ئایا دروستە یان نا؟). وەڵامی دایەوە: ((سیستەمێکی شەرعی نییە، بەڵکو پوچەڵە، پوچەڵە، پوچەڵە، پێچەوانەی سیستەمی محەممەدە، دژی ڕێبازی هاوەڵان و ئەوەیە کە موسڵمانان لەسەرینە، ئەمە سیستەمێکی تەواو فەرەنسییە)) (١٢/ ١٧٣). ئەمە کەمێکە لەوەی تایبەتە بە دەرەوە، کە پێشتر زۆربەی لە تەکفیردا خراوەتەڕوو...

٢- **ئایا سڵاوی سەربازی هاوبەشدانانە؟:** شێخ باسی ئەوەی کردووە دانانی دەست لەسەر نێوچەوان وەك: سوژدەبردنە و دەچێتە ناو هاوبەشدانانەوە (١/ ١٠٩).
دەڵێم: ئەمەیان ناوخۆ و دەرەوە دەگرێتەوە.

٣- **یەکێك لە سیاسەتەکانی هەڵ قۆستنەوەیە بۆ پشتگیری کردن لە مەزهەب، لەسەر حیسابی دەوڵەت و هاوڵاتیانی تر:**

شێخ بەسام کە ژیاننامەی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیمی نووسیود. باسی لەوەی کردووە کاتێك کرانەوە هاتە کایە، وبڵاوبووەوە وەسفی شانشینەکە کرا بە پاشکەوتوو، شێخ ئەم هەلەی قۆستەوە و داوای کرد پەیمانگە زانستییەکان بکرێنەوە بۆ ڕۆشنبیرکردنی گەل بە ڕۆشنبیری مەزهەبی، کە شانازی دەکات بە بیروباوەڕەکەی و سەری پێبەرزە، خۆی دەپارێزی لە ڕۆشنبیریەکانی تر... تاد، شێخ ئەم داوایەی بۆ هاتە دی. ئینجا کۆلیژەکان کرانەوە، بەهەمان بۆیەی ناوخۆیی دەرچوانیان بەرهەم هێنا، بوونە دادوەر و مامۆستا و وانبێژی زانکۆکان... تاد.

٤- **دەستەی فەرمانکردن بەچاکە و خۆڕییەری!:** لەگەڵ ئەوەی شێخ هەوڵیدا گشت دامەزراوە ئاینیەکان لە دەوڵەت دابڕێنێ، بەڵکو جیاکردنەوەی خوێندن و فێرکردن و بانگەواز و فەتواوان و ڕاگەیاندنی ئاینی و ڕابیتەی جیهانی ئیسلامی و دادگا... تاد، بەڵام با نموونەیەك وەربگرین، ئەویش (دەستەی فەرمانکردنە بە چاکە)، شێخ وایکرد ئەندامانی ئەم دەستەیە شیاو نەبن بۆ تانە لێدانیان، هەروەها کردیە سەرچاوەی کۆتایی لە دیاریکردنی سزا و جێبەجێکردنی لەسەر هەر تاکێکی گەل، کە شتی خراپەی لا دەبینن – بەپێی پێوەرە وەهابییەکان، کە

دانانیّ بە ڕاجیایی مەزهەبیدا –، لەگەڵ ئەوەی دەستەی ناوبراوی بردە ناو گشت کاروباری خەڵکدا[1].

شێخ سیستەمی دەستەی فەرمانکردن بە چاکەی نووسی، دابەشی کرد بۆ سێ بەش (٦/ ١٧٤ - ١٧٥) ، یەکەن : چاودێران ((بەشەوو ڕۆژ لە ناو بازارەکان و تێکڕای وڵاتدا هاتوچۆ دەکەن ، پاڵپشتیان دەکرێ بە ژمارەیەك سەرباز کە پێویستی پێ دەبێ بۆ دەستگیرکردنی ئەو کەسەی گوناه بە زمان دەکات یان بە کردەوە! دەیهێننە بەردەم لایەنی دووەم)) ، ئەویش لایەنی دادگایە (دادگای شەرعی نییە، بەڵکو مەبەست لێی سەرۆکایەتی گشتییە) لەسەر ئەم لایەنە پێویستە سزا و سنوور و تەمبێکردنەکان ڕوون بکاتەوە ، بەبێ سکاڵاکار و سکاڵا لەسەر کراو! بەڵکو ئەم لایەنە لایەنی کۆتاییە! واتە هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە داوای مافی خوراوی خۆی بکات لای دادوەر! –

دواتر ئەمە ڕەوانە دەکرێن بۆ بەردەم لایەنی سێیەم، کە (لایەنی جێبەجێکارە): کە هەر لەناو دەستەدایە، دەتوانێ بکەری گوناهەکە بکوژێ و بەند بکات و قەمچی لێ بدات... تاد، بێ تێپەڕین بە دادگای شەرعیدا، چ جای حوکمڕان و کاربەدەستی فەرمی! شێخ ئەوەشی چەسپاندووە کە سەرۆکی

---

(١) دەترسم لەم دەروازەیەوە – بەبێ نیازێکی باش – تەکفیر کردنی عەلمانیەت بەرهەم هاتبێ، وەك سیستەمێك، چونکە ئایین لە دەوڵەت جیا دەکاتەوە، بزوتنەوە ئیسلامییە سیاسەتکارەکان – ئەگەر لەسەر ئاراستەی محەممەدی کوڕی ئیبراهیم بن – بیانەوێ حوکمی دەوڵەت بگێڕن بە تێڕوانینی بەرتەسکی مەزهەبی، کە پێی دەڵێن (ئایین)، بەهۆی نەشارەزایی لە ئایین و مەزهەبدا بەیەکەوە، چونکە ئەوەی گومان ببات بە ڕەهایی ئایین دەناسێ، ئەوا ئاینی نەناسیوە، ئایین هەمیشە پێویستی بە (عاشقان زانین و زانستە) بۆ ئەوەی بە بەردەوامی سەلمێنراو و براوە مەزنەکان بەرز بکەنەوە، بێ یەکلاکردنەوەی گوماندار و وردەکارییەکانی، چ جای بەکارهێنان و قۆستنەوەی مەزهەبی و تیرەیی و ناوچەیی؟! هاواری هەمووان لە پێناو جیاکردنەوەی مەزهەبە لە دەوڵەت، نەوەك ئایین لە دەوڵەت.

فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە — کە لە ژێر فەرمانی خودی شێخدایە — (وەك ئەو میر و کاربەدەستەیە، کە گوێڕایەڵی کردنی پێویستە)!...

ئا بەم شێوە کاربەدەستە قسە ڕۆیشتووەکان و حوکمڕانانی هەرێمەکان، دەتوانن هەر کەسێك ڕاپێچ بکەن، سزای بدەن بێ گەڕانەوە بۆ دادوەر، بەڵام دەکرێ بۆ لای موفتی بگەڕێتەوە! ئەمە سیستەمێکی مەترسیدارە، نازانم چۆن شێخ توانیویەتی لەسەر زەوی بیرۆینێ (هەست دەکەم ئەمە لە ماوەی نێوان جێنشینایەتی سعود و فەیسەڵدابووە، لە ساڵی ١٣٧٧ك)، لەبەر ئەوەی شێخ — کەسێکی — سیاسییە ئەوا زۆر هەل دەقۆزێتەوە.

ئەم دەستەیە — وەك نموونەیەك — جیاکرایەوە لە دەوڵەت، بەشێوەیەك بووە سەرچاوە و لایەنی کۆتایی لە چاودێری کردنی هەر کەسێك و سزادانی هەر یەکێکی تر لەگەڵ بیەوێ!.

هەر بۆیە: کاتێك ڕووداوەکانی دەستەکانی فەرمان کردن بە چاکە، پاڵپشتی موفتی بۆی و پاراستنی ئەندامەکانی لە دەوڵەت دەخوێنینەوە، ئەوا تووشی سەرسامی دەبین! سزا بەسەر کەسێکدا جێبەجێکراوە، کە لە ماڵی خۆی گوێبیستی خراپەك بووە — وەك گۆرانی یان شتی لەو جۆرە — تەنانەت ئەگەر ئەنجامیشی نەدابێ یاخود بەڵگەی لەسەر بەرپا نەبووبێ! (٦/ ١٧٦). لەناوبردنی ئامێرەکانی ڕابواردن وەك: ئامێرەکانی ژەنین و دەف و دۆڵ و وێنە، تەنانەت ئەگەر ڕێپێدراویش بن لەم شوێنانە لەلایەن حوکمڕانەوە!. تەنها لە یەك دۆخدا نەبێ، ئەویش دروستبوونی زیانێکی مەزنترە (٦/ ١٨٥) ئەمە فەرزی کیفایەیە، ئەوەش کە ئامێرەکان لە ناودەبات قەرەبووکردنەوەی لەسەر پێویست نییە.

ئەندامانی دەستەی فەرمانکردن بە چاکە، سەرۆکی شارەوانی عەنیزەیان تۆمەتبار کرد بەشتێك کە نەیکرد بوو، بۆیە ئەندامانی ناوبراو دەستگیر کران، موفتی نامەیەکی بۆ وەزیری ناوخۆ نووسی، دوای ئەوەی تکای بۆ ئەو ئەندامانە

کرد، بە هەڕەشەوە وتی: ((گەورە پیاوانی وڵات! وپاڵپشتیکەرانی چاکە کاریگەر بوونە بەو شتەی بەسەر ناوبراواندا هاتووە)) (٦/ ١٨٢). شێخ بە گەورە پیاوان لێرەدا هەڕەشە دەکات، بەوەی ئەوان دلگرانن بەهۆی ئەوەی بەسەر ئەندامانی دەستەی فەرمان کردن بە چاکە هاتووە. واتە: لەوانەیە وڵات پشتگیری و لایەنگیری ئەوان لەدەست بدات، لە کاتێکدا ئەوان گەورە پیاوانی وڵاتن! لە چەندین چیرۆکدا، ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە شێخ ویستوویەتی دەستەی ناوبراو ببێتە حکومەتی سێبەر!. بەتایبەت لەوەی پەیوەستە بە ژیانی خەڵکەوە.

٥- **وەزیری دەرەوە ڕادەسپێرێ بۆ گەڕان بەدوای کەسێکی سۆفیدا:** ئەمە لە (الفتاوى: ١/ ٢٦٦)دا هاتووە، لەبەر ئەوەی یەکێك لە سعودییەکانی خەڵکی حیجاز ڕۆیشووەتە سەیلان، بانگەواز بۆ بەرنامەی خوا دەکات، سۆفی بووە و لەسەر تەریقەتی شازیلی بووە. موفتی داوای لە وەزیری دەرەوە کردووە کەسێکی باوەڕپێکراو دابنێ بۆ ئەوەی بەدوایدا بگەڕێ و چاودێری بکات و بەدواداچوون بۆ هەواڵەکانی بکات...!

٦- **جەژنی نیشتمانی بیدعەیە:** وەك بیدعەی ئاگرپەرستانە (٣/ ١٠٧).

٧- **ڕۆژی پاك و خاوێنی:** بیدعەیە (٣/ ١٢٢).

٨- **گومان هەیە لە حەڵاڵی سامان و دارایی دەوڵەت:** (٥/ ٧). شێخ فەتوای بۆ شا سعوددا، بەوەی کەعبە لە پارە و سامانی پۆستە دروست بکرێتەوە، چونکە خاوێنترین ماڵ و سامانە، ئەگەر نەبوو ئەوا لە پارە و سامانی ناوخۆیی با دروست بکرێ، چونکە پێی وایە پاکترین سامانە... ئەم پێشنیازە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گومانی هەیە لە حەڵاڵ بوونی گشت سامان و دارایی دەوڵەت، جگە لەم

دوو سەرچاوەیە نەبێ... ئەمە مافی ئەوە، بەڵام ئەم شتە پەیوەندی بەلایەنی سیاسیەوە هەیە.

٩- **وەڵامی ئەو پێشنیازەی نەدایەوە کە خرابووەڕوو بۆ هەڵواسینی ئەو بەرگەی بە بەر کەعبەدا، کە بەلێن (بەیعەتی) شا و سوننەتی دەستگرتن بەسەر حیجاز و هاوشێوەی ئەمەی تێدابوو:** (٥/ ٩)؛ ستایشی دەکرێ لەسەر ئەم هەڵوێستەی. چونکە مزگەوتەکان بۆ خوان و هی خوان، دەبێ نووسراوەکانی مزگەوتانیش تەنها بۆ خوا بن، بەبێ ڕەچاوکردنی شەرعی و ناشەرعیبوونی ئەمە، بەڵام هەڵسانی شێخ بە ڕەتکردنەوەی ئەم پێشنیازە سەرنجی ڕاکێشام.

١٠- **تێکۆشان (الجهاد):** شێخ پێی وایە بێ بڕوایان جەنگیان لەگەڵ دەکرێ بەهۆی بێ باوەڕی و کوفرەکەیان، نەوەك بەهۆی دەستدرێژی کردنیان. ئەمەش پێچەوانەی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە:﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ ﴾البقرة: ١٩٠. واتە: ( بجەنگن لە پێناوی ڕێبازی خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن، نەکەن دەستدرێژی بکەن )، ئەوەی نامۆیە ئەوەیە ئیبن تەیمییە هەمان بۆچوونی نییە لەسەر تێکۆشانی داواکردن (جهاد الطلب). کاتێك وەهابییەکان بینیان ئەم فەتوایەی ئیبن تەیمییە دەست و پێی بزافی ئەوان دەبەستێتەوە، ئەوا نکۆڵیان لێکرد، شێخ (٦/ ٢٠٠) باسی کردووە ئەم فەتوایەی خستۆتەبەردەم شێخەکانی ڕیاز، ئەوانیش نکۆڵیان لێکردووە!. دواتر بە کتێبەکانی وەهابییەکان بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر دەستپێشخەری کردنی موسڵمان لە شەڕکردن لەگەڵ ناموسڵماندا، ئەگەر دەستدرێژیشیان نەکردبێتە سەر موسڵمانان، جا وتویەتی: ((لە کتێبەکانی بانگەوازدا؛ هیچ شتێك نابینی. بەڵگە بێ لەسەر ئەوەی شەڕ لەگەڵ هاوبەشدانەران دەکرێ بۆ دوورخستنەوەی

خراپەکەیان، بەڵکو ئەگەر لە خاوەن سروشتێکی باش بپرست ئەوا پێی ڕادەگەیاندی کە ئەوان بەهۆی بێ بڕوایی و کوفرەکەیانەوە شەڕیان لەگەڵ دەکرێ)) (٦/ ١٩٩).

دەڵێم: کێشەکە لێرەدا ئەوەیە، هاوبەشدانەران وشەیەکی گشتییە لای شێخ، کە موسڵمانان و بێ باوەڕان بە یەکسانی دەگرێتەوە، بەڵکو لە میانەی مێژوویی وەهابییەتدا دەردەکەوێ کە شەڕکردنی موسڵمانانیان لەپێشتر داناوە، چونکە پێیان وابووە کافر و بێ باوەڕترن لە بێ باوەڕە ڕەسەنەکان و نزیکتریشن، بەلگەیان بەم فەرمایشتەی خوای مەزن هێناوەتەوە:﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ ﴾ التوبة: ١٢٣. واتە : ( بجەنگن دژی ئەو بێ باوەڕانەی کە لێتان نزیك دەبنەوە بە دەوروبەرتاندان). لەگەڵ ئەوەی گشت ئایەتەکانی تێکۆشان و شەڕ لەبارەی دەستدرێژیکەرانەوە هاتووە. بەهەمان شێوە کۆکردنەوەی ئایەتەکانیش بەیەکەوە ئەمە دەخوازێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾البقرة: ١٩٠. واتە : ( بجەنگن لە پێناوی ڕێبازی خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن ، نەکەن دەستدرێژی بکەن" دژی ژن و منداڵ و هتد"چونکە بەڕاستی خوا ئەو دەستدرێژکەرانەی خۆشناوێت ) ، ﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا .... ﴾ الأنفال: ٦١. واتە : ( جا ئەگەر "دوژمنان" بەلای ئاشتیدا دایان شکاندو حەزیان پێکرد تۆش" ئەی محەممەد (د. خ) ، ئەی پێشەوا" ئامادەیی خۆت دەربڕە) .... تاد.

١١- **مۆڵەتی بە میر سوڵتان نەدا، سەبارەت بە فیلمی فێرکاری بۆ قوتابیانی پۆستە :** (١٠/ ٢٥٦)، ئەمەش لەبەر ئەوەی سەخت بوو مامۆستا لە دەرەوە بهێندرێ، بۆیە میر سوڵتان ویستی سوود ببینێ لە کاسێتی فێرکاری، کە (چۆنیەتی ڕێکخستنی

پۆستە و دابەشکردن و گەیانی بە خاوەنەکانی) فێری قوتابیان دەکات. لەلایەن خودی شای سعودیەوە داوای ئەم فەتوا و ڕوونکردنەوەیە کرابوو! پرسیارێکی دوور و درێژ بوو و هاوکات بە تکا و پاڕانەوە داوای لێکرابوو. وەك ئەوەی میر سوڵتان دەستەوەسان بووبێ لە دەرکردنی فەتوایەك لە لایەن موفتیەوە یان ترسی هەبووبێ لەوەی مۆڵەت نەدات. بەڵام شێخ سوور بوو لەسەر ڕێگرتن لەمە. لەمەشدا وانەیەك، بریتییە لەوەی کاربەدەست هەر چەند بدات بە زیادەڕۆچووان، ئەوا هیچ شتێکیان لێ بەدەست ناخات، بەڵکو تەنها داوای ڕوونکردنەوە کردن لە نموونەی ئەم شتانەدا چەسپاندنی زیادەڕۆچوون و ئاگاداردنەوەی هەمووانە بەوەی خودی پادشا ناتوانێ فەتوا لە موفتی وەربگرێ.

سەرم لە پرسیارەکە سوڕما، بەوەی چۆن بابەتەکەی خستۆتە بەردەم شێخ و داوای لێکردووە لیژنەیەك پێکبهێنێ، کە متمانەی پێیان هەبێ، تا لەم فیلمانە بکۆڵێتەوە و بزانێ خراپە و گۆرانی و ڕابواردنیان تێدا نییە، تەنها فیلمی فێرکارین. بەڵام شێخ بە متمانە بەخۆبوونەوە وەڵامی داوەتەوە: ((پێمان وایە جگە لە قەدەغەبوون هیچ شتێکی تری بۆ نییە))!!!، چونکە وێنەی تێدایە، لاساییکردنەوەی بیانیەکانە!!، پرسەکەش ئەوەندە پێویست نییە تا ڕێگە پێدراو بێ وەك چۆن خواردنی مرداربوو ڕێگەی پێدەدرێ!!.

دەڵێم: پاك و بێگەردی بۆ خوا! ئەمە چ باڵادەستییەکە!!؟. ئەمە ئەو نێوەندگیرەیە کە ئەم دامەزراوەیە لە دەوڵەتدا هێناویەتیە بوون!.

١٢- **ئایا شێخ لە هزری ئیخوان؟ ئیبن بازیش لە کۆمەڵەی جوهەیمانەوە نزیکتر بوو؟**

مەبەستم لە ئیخوان (هاوەڵانی فەیسەڵی دوەیش)ە، ئەوانەی ڕاپەڕین دژی شا عەبدولعەزیز لە ساڵی ١٣٥٢ك. ئێمە دەزانین شێخ نکۆڵی لەم دەرچوونەی ئیخوان کرد و لە پاڵ شا عەبدولعەزیزەوە وەستا، بەهەمان شێوە ئیبن بازیش لە پاڵ دەوڵەتەوە وەستا دژی کۆمەڵەی جوهەیمان، ئەمە شتێکی زانراوە، بەڵام من

لێرەدا پرسیار لە نزیکی هزری دەکەم، لە میانەی فەتواکانی ئیبن بازدا ئەوە دەخرێتەڕوو، پێش ڕاپەڕینی کۆمەڵەی جوهەیمان لە هەموو خەڵك زیاتر بەرگری لەو کۆمەڵەیە کردووە.

هەر لەسەر باسی شێخ محەممەدی کوڕی ئیبراهیم دەمێنینەوە، لە کاتی خوێندنەوەم بۆ فەتواکانی، پرسیارم کرد: جیاوازی چییە لە نێوان ئەم هزرە و هزری ئیخواندا، لەگەڵ ئەوەی هزری ئیخوان بڕوایان بە ڕاپەڕین و شۆڕش هەیە و شێخیش بڕوای پێ نییە؟!. شێخ بە نەرمی وتاری پێشکەشی ئەوان کردووە، پشتگیری زۆربەی فەتواکانی ئەوانی کردووە، بەڵام شۆڕشەکەی ئەوانی بە نا دروست داناوە، بەڵکو بینیمان فەتوای داوە بە: ((خۆگرتنەوە لەو کێشانەی لە نێوان شا عەبدولعەزیز و ئیخوان ڕوویداوە)) (١٢/ ١٧٠)!... ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شێخ تەنها لە شۆڕش و ڕاپەڕیندا بۆچوونی لەگەڵیان جیاوازە.

تەواوبووین لە خستنەڕووی وێنەیەکی کورتبڕ لە هەندێك شوێن و نیمچە تێروتەسەلیش لە چەند شوێنێکی تردا لەبارەی موفتی پێشووتر (محەممەدی کوڕی ئیبراهیمی ئالی شێخ) ڕەحمەتی خوای لێبێ، کە نەوەیەکی تەواوی لە دوای خۆی جێهێشت لە زانایان و دادوەران و بانگخوازان و ئامۆژگاریکار و بانگخوازان لەسەر ڕێباز و توونددگیری و سیاسەتی خۆی، چەند خاڵێکی ئەرێنی کەمی هەبوو باسمان کردن. چەندین خاڵی زۆری نەرێنیشی هەبوو باسی چەند نموونەیەکمان لێکرد، هەموو ئەم کارەشم وەك دڵسۆزی کردووە بۆ خوا و پێغەمبەر و پێشەوایانی موسڵمانان، گومانم وایە خوای مەزنیش خۆی لێپرسینەوە لە نهێنیەکان دەکات، لە خوای گەورە داوکاریان ڕاست پێکانمان لە هەڵەکردنمان زیاتر بێ.

## فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی موفتی دووەم شێخ ئیبن باز

گومان لەوەدا نییە شێخ ئیبن باز بەناوبانگترین موفتییە لە نێو سێ موفتییەکاندا، لە هەمووان کاریگەری زیاترە لە هزری ناوخۆیی و زۆرترین ناوبانگی هەیە لە جیهانی ئیسلامیدا، هەر بۆیە دەبێ هەڵوێستەیەکی زۆر بکەین لەسەر فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی شێخ ئیبن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، لەبەر دوو هۆکار.

**هۆکاری یەکەم / هەستی گشتی :**

لێرەدا هەستێکی گشتی هەیە — گومان زیاتر بەو لایەدا دەکەوێ کە ڕاستە - سەبارەت بەوەی شێخ ئیبن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لە هەمووان زیاتر هاوسەنگ و زاناتر و متمانە پێکراو و سەنگینترە لە ناو خەڵکدا.

ڕاستە ئەم هەستە پاڵپشتی نەکراوە بە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان، بەڵام لە ڕاستییەوە نزیکترە، ناوبانگی شێخ و باسکردنی بە باشە، گەواهیدەرن لەسەر ئەمە[1].

کەواتە با یەکەم جار لەگەڵ ئەم هەستە بڕۆین.

**هۆکاری دووەم / متمانەداری :**

لەبەر ئەوەی ئەگەر بینیمان شێخ ئیبن باز هاوسەنگتربوو، ئەوا دەبێتە بەڵگەیەکی بەهێز لەسەر هاوڕێ و هاوونە و شێخەکانی، بەڵام ئەگەر لە پرسێك یان زیاتردا زیادەڕۆچوو بوو، ئەوا دەبێتە بەڵگەیەك بۆ زیادەڕۆچووان، تەنانەت لەگەڵ هاوسەنگبوونی یەکێك لە هاوڕێ یان شێخەکانی لەم پرسەدا، سەرباری ئەوەی موفتییەکە، زۆرترین جەماوەری هەیە، نە موفتی ئێستا پێی دەگات و نە موفتی پێشووش پێشی کەوتووە، کاری ئەو (موفتی گشتی) سەنگی خۆی هەیە لای گشت خەڵك ، کەواتە لە زیاتر لەو دوو دۆخەی باسکران بەڵگەی پێ دەهێنرێتەوە.

---

(١) من لەگەڵ ئەو هەستەدام، دوای لێکۆڵینەوە لە کتێبی هەر سێکیان، ئەگەرچی هاوسەنگییەکە ڕێژەییش بێ، چونکە دەکرێ ئیبن عوسەیمین لە هەندێك پرسدا هاوسەنگتر بێ، شێخ ئیبن بازیش لە هەندێکی تردا هاوسەنگتر بێ، بەراوردکردنیش پێویستی بە توێژینەوەیە.

# ڕێگەی هێڵی ڕاست کورت دەکەمەوە

هەر یەکێك دوودڵ بێ لە وەرگرتنی فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی محەممەدی کوڕی ئیبراهیم یان محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب، ئەوا دوودڵ نابێ لە وەرگرتنی فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی ئیبن باز، هۆکاری گرێبەست و خاڵی یەکدەنگی یان نیمچە یەکدەنگییە لە نێو ئەهلی سوننەدا، لە شانشینەکەدا و تەنانەت لە نێو زۆربەی ئەهلی سوننە و لە دەرەوەشدا، ڕاستە دوو تاقم پێی ڕازی نەبوونە: ئەو زیادەڕۆچووانەی ئیبن باز لە ڕیزی ((زانایانی دەسەڵات)) دەژمێرن، ئەوە دەزانین کە ئایا ئەوان پاساویانهەیە لە متمانە پێنەکردنی یان نا؟... یان مەزهەبە ئیسلامییەکان جگە لە حەنبەلییەکان، کە زانا و مەرجەعی خۆیان هەیە، ئەگەرچی دەزانن ئیبن باز چ پێگەیەکی هەیە لە ناو پێکهاتەی سەلەفییدا و شوێنە مەزنەکەی لەلای دەوڵەت و زۆربەی هاوڵاتیان. شتێکی سروشتییە ئەوانە پاساویان هەبێ، چونکە لە مەزهەبە ئیسلامییەکانی ترن، زانای خۆیانیان هەیە.

کەواتە ئەگەر لە ڕا و بۆچوونەکانیدا زیادەڕۆچوونمان بینیەوە، ئەوا پێویست نییە لێکۆڵینەوە لە فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی تردا بکەین، زیادەڕۆچووە هاوچەرخەکان بەڵگەیەکی باڵایان لەبەردەست دەبێ لەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگە، مەگەر دەوڵەت و کۆمەڵگە بەڕووی قۆناغێکی تری نوێسازی هزری ڕاستەقینەدا بکرێتەوە.

ئەگەر پێچەوانەش بوو، بەوەی کتێب و فەتواکانی ئیبن بازمان بینی بەلایەنی هاوسەنگیدا دەشکانەوە، ئەوا ئەو کاتە بەڵگە بەدەستی دەوڵەت و کۆمەڵگەوە دەبێ، ئەوە یەکلا دەکرێتەوە کە زیادەڕۆچووانمان لەسەر بناغەیەکی ناوخۆیی تۆکمە ناوەستن.

## ئیبن باز و هاوسەنگی!

هاوسەنگی نرخێکی گەورەی دەبێ، ئەگەر لەسەر هاوسەنگی شێخ ئیبن باز بنیاتنرابوو، ئەمە کاتێك دەوڵەت تەنها هێزی ناوخۆیی وەربگرێ و نوێسازی گشتگیری هێزی پەسەند نەکات، لەگەڵ ئەوەی نوێسازی گشتگیری هێزی پێویستە. چونکە کتێبە کۆنە زیادەڕۆچووەکان دەستیان بەبڵاو کردنەوە کرد لە نێو قوتابیاند. پێگەیەکی وایانگرت کە پێشینەی بۆ نەبووبێ، بەتایبەت کە شێخ ئیبن باز زۆر بە توندی ئامۆژگاری کرد بۆ دەستگرتن بەم کتێبە زیادەڕۆچووانە، لە توێژینەوەکانی ڕابردووشدا ڕەخنە لەم کارەی گیراوە[1].

### ئەو بارودۆخەی دەوری ئیبن بازی دابوو فەرامۆش دەکەین

کاتێك خوێندنەوە دەکەین بۆ ڕا و فەتواکانی شێخ ئیبن باز، ئەوا دوور لەو بارودۆخەی دەوری ئیبن بازی دابوو ئەم کارە دەکەین،— لە کاریگەری قوتابیانی و سیاسەت — هەر چەندە ئەم بارودۆخانە زۆر گرنگ بوون.

بەبێ

بەڵام لەبەر ئەوەی زیادەڕۆچووان و میانڕەوان بە یەکەوە سەیری ئەو کەسانە ناکەن کە لە دەوری ئیبن باز دادەنیشتن و ئەو بارودۆخانەی ڕا و بۆچوون و

(١) وەك زیادە وتەیە — بەبێ دووڕوویی و زمانلوسی — من وەك خودی خۆم ئەوپەڕی ڕێز و حورمەت هەیە بۆ ئەم شێخە ڕێزدارە، پێشتر شەرەفی ئەوەم پێدراوە بەوەی یەکێك بووە لەو زانایانەی زانستم لێ وەرگرتوون، بایەخم بە کتێب و فەتواکانیان داوە پێش بیست ساڵ بەر لە ئێستا. من پێم وایە ئەگەر قوتابیانی میانڕەو و هاوسەنگ دەوری ئەویان دابووبا، ئەوا ڕا و بۆچوون و فەتواکانی زۆر زیاتر لەوەی هەیە هاوسەنگیان تێدا ڕەنگ دەدایەوە، بەڵام بەداخەوە میانڕەوەکان کەمتەرخەمیان لەم بارەوە نواند و زۆربەی ئەوانەی دەوری ئەویاندا بوو زیادەڕۆچوو بوون، ئەمە لە کاتێکدایە هەمووان بە دوای زیادەڕۆچوون و توندگیریدا دەگەڕان بۆیە دەبوایە ئەمە کاریگەری هەبووبا لەسەر شێخ، مرۆڤ بە سروشتی خۆی کاریگەر دەبێ بەوانەی دەوروبەری و ئەوانەش کە لەگەڵ دانیشتوون.

فەتواکانی تێدا دراون، بەڵکو تەنها سەیری خودی ((بەرهەکان))ی دەکەن و لێـی ورد دەبنەوە و گەواهی پـێ دێننـەوە یـان بەرهەڵستی پـێ دەکەن، لەبـەر ئـەم هۆکـارەی خرایـەڕوو سـەرنجی بـارودۆخی دەوری ئـیبن بـاز نـادەین، هـەروەها لەبـەر سـەختی چەسپاندنی ئـەم بارودۆخانـە – چـونکە زۆربـەیان گـوێزراوەی زارەکـین – و لەبـەر ئەوەی هەمووان پێشـبینی ئـەوە دەکـەن زانـا یـان شـەرعناس فـەتوا و بۆچـوونەکانی دەردەکات لـە پێنـاوی خـوا و بـێ ئـەوەی لـە لۆمـەی لۆمـەکاران بترسـێ و چاوەڕوانی ستایشێکی دوور یان نزیك ناکات، زمانلوسی لەگەڵ هیچ کەسێکی ناو مەجلیس ناکات و دەمارگیری بەرامبـەر هـیچ کەسـێکی دوور نـانوێنێ، یـان بەلایـەنی کەمـەوە: ئەمـە تێڕوانینی جەماوەری و گشتییە بۆ زانا و شێخەکان.

## بەرهەمی شێخ ئیبن باز

شێخ ئیبن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێ). دەیان کتێب و سەدان وتار و وتە و هەزاران فەتوای هەیە؛ بەخۆشبەختیەوە هەموویان لە چاپدراون لە (٢٦) بەشدا لە ژێر ناونیشانی (مجموع فتاوی ابن باز)[1]، بەرگی مام ناوەند کە قەبارەی هەر یەکێکیان (٤٥٠ لاپەڕەیە).

محەممەدی کوڕی سەعدی شوەیعری ئەم فەتوایانەی کۆکردۆتەوە، لە خانەی (ئەصداء) لە چاپدراوە. لێرەدا جەخت دەکەینەوە لەسەر ئەو بەشانە کە زیاتر ئەو فەتوا و ڕا و بۆچوونانەی تێدایە کە پەیوەستن بە تەکفیر و بەبیدعەدانان و گومڕاکردن و پاشکۆکانی ئەمانە، دەبینین کە ئایا ئەم (بێ بەشکردنە) لە شوێنی شەرعی خۆیدایە، یان لە پێگە و شوێنی مەزهەبی خۆیدایە، جا ئەگەر لە شوێنی شەرعی خۆیدابێ ئەوا قسەی تێدا نییە. ئەگەر لە شوێن و پێگەی مەزهەبیەوە بێ. ئەوا ستەمکاری مەزهەب نابێ دادگەری و هاوسەنگی و لێبوردەیی و ئاسانکارییەکەی ئیسلام پێشێل بکات.

مەزهەب لە خوار ئیسلامەوەیە، نەوەك لەسەرووی ئیسلامەوە بێ، هەر توێژەرێك تەنها لە ناو مەزهەبدا بە دوای هاوسەنگی و میانڕەوی بگەڕێ، ئەوا بێ چەند و چوون زیادەڕەوی دەکات، چونکە مەزهەبەکان لە زۆربەی بۆچوونەکانیاندا. بەرهەمی مێژوویین نەوەك ڕاستی شەرعی؛ ئەمە یەکەم شتە دەبێ بوترێ، کە سەرەتای ڕێگەیە بۆ هەر هاوسەنگییەك، هیچ کەسێکی هاوسەنگ و میانڕەو ناتوانێ هاوسەنگی بنوێنێ، لەکاتێکدا پێی وابێ مەزهەبی ئەو ڕێنوێنی و ڕێگەی ڕاستە.

---

(١) لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لە ناوەڕۆکی ئەم بەشانە فەتوا نین لە ڕاستیدا، بەڵکو وتار و کتێب و سەرنج و ڕ و بۆچوونن، پێناسەی فیقهی فەتوادانی لەسەری جێبەجێ نابێ، لەوانەیە ئەم ناونیشانەی بۆیە بۆ دانرابێ، بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەم ناونیشانە دوای کۆکردنەوە (فەتواکانی ئیبن تەیمییە)، کە هەمان شت لەسەر ئەویش جێبەجێ دەبێ، ئەویش بەهەمان شێوە زۆربەی کتێب و ڕا و بۆچوونن نەوەك فەتوا.

مه‌زهه‌به‌كانی تریش گومڕان، كه‌واته –به‌لایه‌نی كه‌مه‌وه – ده‌بێ دان به‌وه‌دا بنێ كه ئه‌وه‌ی موسڵمانان تێیدا ڕاجیان، ئه‌وا هه‌ر كۆمه‌ڵێكیان به‌ڵگه و بۆچوونی خۆیان هه‌یه، ئه‌گه‌ر هه‌ڵه‌ش بكه‌ن، دان به‌وه‌شدا بنێ كه بواری فراوانی زانست هه‌یه، ده‌وری ئه‌و بوارانه‌ی نه‌داوه، ئه‌مه‌ش پاڵنه‌ر ده‌بێ بۆ خاكی بوون و خۆبه‌كه‌مزانی و زیاتر كردنی بابه‌ته گوماندراه‌كان و كه‌م كردنه‌وه‌ی شته سه‌لمێنراو و بڕاوه‌كان به‌گوێره‌ی توانا.

## بیروباوەڕ له نێو مه جموع فه‌تاوای شێخ ئیبن بازدا

بیروباوه‌ڕ شوێنی یه‌كه‌می گرتووه له ناو به‌رگه‌كانی فه‌تواكانی شێخ ئیبن بازدا، ته‌نها بیروباوه‌ڕ ٩ به‌رگی گرتووه به ناونیشانی (یه‌كخواناسی و پاشكۆكانی). شێخ ئیبن باز ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێ – وه‌ك تێكڕای زانایانی بانگه‌وازی – ئه‌وپه‌ڕی بایه‌خ به‌م بابه‌ته ده‌ده‌ن (بابه‌تی یه‌كخواناسی و هاوبه‌شدانان)، ئه‌مه شتێكی باشه، ئه‌گه‌ر سه‌رنه‌كێشێ بۆ خزاندنی چه‌ند شتێك بۆ ناو بازنه‌ی یه‌كخواناسیه‌وه كه به‌شێك نییه یان تێخستنی هه‌ندێك شت بۆ ناو بازنه‌ی هاوبه‌شدانان كه به‌شێك نییه لێی.

كێشه له بابه‌ته‌كه و زۆر بایه‌خدان پێی نییه... به‌ڵكو كێشه له ناوه‌ڕۆكدا، به‌وه‌ی ئایا زیاده‌ڕۆچوونی به‌سه‌ردا زاڵه یان هاوسه‌نگی، لێبورده‌یی یان توندڕه‌وی... تاد.

## بابه‌ته‌كانی یه‌كخواناسی لای شێخ ئیبن باز!

به خستنه‌ڕووی پێرستی هه‌ر نۆ به‌رگه‌كه‌ی تایبه‌ت به یه‌كخواناسی، ئه‌وا سه‌رسورمانی دامانده‌گرێ له‌وه‌ی ئه‌م بابه‌ته مه‌ترسیداره (كه یه‌كخواناسییه) و دژه‌كه‌ی (هاوبه‌شدانان)ه، كۆمه‌ڵێك بابه‌تی تێدا كۆكراونه‌ته‌وه، كه هیچ په‌یوه‌ندیه‌كیان پێوه نییه.

یەکخواناسی بریتییە لە زانینی ئەوەی خوا یەکە و تاك و تەنهایە (وشەی یەکخواناسی لە یەك وشەوە داتاشراوە)، هەر ئەو شایستەی پەرستنە، بنچینەکانی ئیسلام ناچینە ناو یەکخواناسیەوە، چ جای باسەکانی تری ئایین، ئەگەرچی پرسەکانی تری ئایین هەموویان پەیوەندیان بەیەکترەوە هەیە ئەگەر لە دووریشەوە بێ.

لە ناو بەرگەکانی یەکخواناسیدا دەبینین هەندێك شتی تێدایە، کە فیقهییە و هەندێکی تریش ڕاجیاییان تێدایە، سێیەمیان شتی هاوچەرخ و چوارەمیان شتی پەیوەست بە بانگەواز و پێنجەمیان شتی پەیوەندیدار بە کۆمەڵگە و شەشەمیان شتی ئابووری تێدایە... تاد.

ئەم بابەتە لە یەکەم ساتەوە ئاسان دێتەبەر چاو، تەنها کەسێك هەست بە مەترسی ئەم شێوە دابەشکردنە دەکات، کە توونـدگیری قوتابخانەی سەلەفیەتی نەجدی بناسێ لە بابەتەکان یەکخواناسی و بەکارهێنانی حوکمی هاوبەشدانان بۆ ئەوانەی لە یەك مەسەلەدا لەگەڵ ئەوان ڕاجیان، بەڵکو بەهۆی زیادەڕۆچوویی ئەم قوتابخانەیە لە یەکخواناسیدا، ئەوا ئەگەر لەگەڵ بەرامبەردا لە پرسێکی فیقهیدا ڕای جیاواز بوو، ئەوا ئەم پرسە ڕاستەوخۆ دەخاتە ناو بازنەی یەکخواناسی و بیروباوەڕ بۆ ئەوەی دژەڕای ئەوان یان هاوبەشدانەر یان بیدعەچی بێ، نەوەك هەڵەکار.

ئەمە بەسەرهاتێکی دوور و درێژە، کەسێك دەیزانێ کە کتێبە کۆن و نوێیەکانی بیروباوەڕی خوێندبێتەوە.

بە هەر حاڵ، دەحەپەسێین کاتێك دەبینین؛ زۆربەی ناوەڕۆکی نۆ بەرگەکە پەیوەندیان بە یەکخواناسیەوە نییە، بەڵکو کۆمەڵێك فەتوای فیقهی و ئامۆژگاری و وتە و وتار و ڕاسپاردەی گشتی و تایبەتین، بەتایبەت بەرگەکانی کۆتایی.

بەشێوەیەك تایبەتتر دەبینین (بەرگە کتێبەکانی یەکخواناسی) لای شێخ ئیبن باز، چەند بابەتێکن زۆر دووبارە بوونەتەوە، جەختیان لەسەر کراوەتەوە، ئەمەش

بهڵگـه لهســهر ئــهوهی لای شــێخ بابــهخی زۆری پێــدراوه، ئــهم بابهتانــه هــیچ پهیوهندیهكیان به یهكخواناسی و بیروباوهڕهوه نییه، مهگهر به زۆرهملێ بیانخهیه ناو ئهم بازنهیهوه.

ئـهو بابهتانـهی دووبـاره دهبنـهوه و جـهختیان لهسـهر دهكرێتـهوه، لـه بهرگـه كتێبـهكانی یهكخواناسیدا بهسهرسوڕمانیهوه دهبیـنین ئهمانـه: وێنـهگرتن، گـۆرانی، ڕیش تاشین، ئاههنگێڕان به بۆنهی یادی لهدایكبوونی پێغهمبهر.

**بۆ نموونه وێنهگرتن**: به ڕێژهیهكی زۆر له بهشی یهكخواناسیدا! كه پێچهوانه و دژی هاوبهشدانانه! هاتووه: فهتوایهك سهبارهت به حهڕامبوونی وێنهگرتن (١/ ٤٣٨)، دواتر وتارێك سهبارهت بـه حـوكمی وێنـهگرتن (٤/ ٢١٠)، ئینجا حـوكمی ههڵواسـینی وێنه (٤/ ٢٢٣)، دواتر حوكمی وێنه و پهیكهر (٤/ ٢٢٤)، پاشان حـوكمی كۆكـردنـهوهی وێنــه بــۆ یــادهوهری (٤/ ٢٢٥)، دهسـتكهوتی وێنــهگر و حوكمهكـهی (٤/ ٣٠٦)، دواتــر حوكمی وێنهی بێ گیان (٤/ ٣٠٦)؛ بهم شێوهیه.

**سهبارهت به ڕیش**: فهتواكانی لـهم بـارهوه لـه بهشـی یهكخواناسـیدا هـاتوون! كـه دژهكهی هاوبهشدانانه! بینیمان به حهڕامی دانـاوه ڕیـش بتاشـرێ یـان كـورت بكـرێ یاخودبه بۆیاخی ڕهش ڕهنگ بكرێ یان ڕێكبخرێ و ڕاسـت بكرێتـهوه، دهبیـنین ئـهم بابهتـه گۆڕهپـانێكی فراوانـی گرتـووه لـه بهشـی یهكخواناسـیدا، لهگـهڵ ئـهوهی هـیچ پهیوهندییـهكی نییـه بـه یهكخواناسـیهوه، خزانـدنی ئـهم بابهتـه بـۆ نـاو بازنـهی یهكخواناسیهوه ههڵهیهكی دیاره، بڕوانه: حهڕامكردنی ڕیش تاشین یان كورت كردنی (٣/ ٣٦٢، ٣٧٢)، فهتوایهكی تـر سـهبارهت بـه بـهردانی ڕیـش (٣/ ٣٦٤)، فهتوایـهكی تـر سهبارهت به حوكمی ڕیش تاشین و ئهوهی ئایا كردهوهكانی پێ پوچهڵ دهبێتهوه (٣/ ٣٦٦)؛ چـوارهمیان فهتوایـهك سـهبارهت بــه ڕیــش تاشـین بــۆ ســهرباز (٣/ ٣٦٨)؛

پێنجەمیان فەتوایەك سەبارەت بە ناچارکردنی سەربازی قوتابی لەسەر ڕیش تاشین (٤/ ٤٤١)،

فەتوای شەشەم سەبارەت بە حوکمی ئەوەی ڕیشەکەی ڕێك دەکات (٤/ ٤٤٣)؛ فەتوای حەوتەم لەبارەی حەرام بوونی ڕیش تاشین (٣/ ٣٧١)؛ فەتوای هەشتەم بەهەمان شێوە لەبارەی حوکمی ڕیش (٣/ ٣٧٥)؛ نۆیەمیان لەبارەی بۆیاخ کردنی ڕیشە بە ڕەنگی ڕەش (٤/ ٥٨)؛ دەیەمیان لەبارەی ڕیش (٨/ ٣٦٨)؛ حەرام بوونی تاشین یان کورتکردنی ڕیش، ئەمەشیان یازدەمینە (٣٧٠)، و دوازدەمیان (٣٧٤)؛ سێزدەمیان (٣٧٥)؛

چواردەمیان لەبارەی ڕیش تاشینی کەسی ناچار لە ناو لەشکر (٣٧٦)؛ پازدەمیان لەبارەی گوێڕایەڵی کردنی باوك لە ڕیش تاشیندا (٣٧٧)؛ شازدەمیان لەبارەی وەرگرتن کرێی ڕیش تاشین (٣٧٢)؛ حەڤدەمیان لەبارەی حوکمی تاشینی ڕوومەتەکان و چەناگە (٥/ ٢٩٠)؛ هەژدەمیان: ئامۆژگارییەك بۆ ئەوەی بانگەوازی دەکات بۆ چەناگە تاشین (٦/ ٤٧٢)؛ نۆزدەمیان: لەبارەی ڕیشەوە (٦/ ٤٧٤) و حەرامبوونی تاشینی و.... بەم شێوەیە.

**ئەوەی پەیوستە بە گۆرانیەوە:** ئەمە بابەتێکی فیقهییە، ڕاجیایی تێدایە، کەچی لە بەشی یەکخواناسیدا کۆکراوەتەوە و باسکراوە! کە پێچەوانەکەی هاوبەشدانانە! لەو بارەوە ئەمانە دەبینین: فەتوایەك سەبارەت بە حەرام بوونی گۆرانی (١/ ٤٣٨)؛ وتەیەکی درێژ لەبارەی هۆشداریدان و حەرامبوونی گۆرانی (٣/ ٣٩١)؛ جارێکی تر حەرام بوونی گۆرانی (٣/ ٤٢٣)؛ حوکمی گۆرانی لە ئیسلامدا (٣/ ٤٢٧)؛ وەڵامدانەوەی پرسیارێك دەربارەی گۆرانی (٣/ ٤٣٣)؛ حوکمی گوێگرتن بۆ گۆرانی (٣/ ٤٣٤)؛ حوکمی گوێگرتن لە مۆسیقا (٣/ ٤٣٦)؛ دواتر شتەکە درێژەی کێشا تا سرودە

ئیسلامییەکانیشی گرتەوە (٣/ ٤٣٧)؛ حوکمی گوێگرتن لە گۆرانیە سۆزدارییەکان (٤/ ١٤٧).

بەهەمان شێوە **ئاهەنگێڕان بە بۆنە ئیسلامییەکان" وەك: یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر و یادی کۆچ و ئیسرا و میعراج** : ئەمەش ڕووبەرێکی گەورەی گرتووە لە بەشی یەکخواناسی – کە پێچەوانەکەی هاوبەشدانانە! – لە فەتواکانی شێخدا، ئەم بابەتانە بەشی خۆیان وەرگرتووە لە بەبیدعە دانان و هۆشداری لەبارەوە دان و یەکێك بوون لە گەورە گوناهەکان و پرسەکانی هاوبەشدانان؛ لەگەڵ ئەوەی بابەتێکی سادەیە و ڕاجیایی تێدایە، بڕوانە: حوکمی ئاهەنگێڕان بە یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر (١/ ١٧٨)؛ دووەمیان لە (٦/ ٤٠٤) هاتووە؛ سێیەمیان: لەبارەی حوکمی ئاهەنگێڕان بە بۆنەی یادی لەدایکبوونەوە (٤/ ٢٨٠)؛ چوارەمیان: لەبارەی حوکمی ئاهەنگێڕان بەبۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێك یان زیاتر لەسەر لەدایکبوونی کەسەکە (٤/ ٢٨٣)؛ پێنجەمیان لەبارەی حوکمی بەرپاکردنی یادەکانی لەدایك بوون (٤/ ٢٨٢)؛ فەتوایەکی تر دووبارە دەبێتەوە لەبارەی حوکمی ئاهەنگێڕان بە لەدایکبوون (٤/ ٢٨٦)؛ پرسیارەکە لە جاری حەوتمدا بەشێوەیەکی تر دەخرێتەڕوو: ئایا بۆ موسڵمانان دروستە ئاهەنگ بگێڕن بە یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە (٤/ ٢٨٩)؛ دواتر هەشتەمیان لەبارەی حوکمی ئاهەنگێڕانە بە بۆنەی یادی ئیسرا و میعراج (١/ ١٨٣)؛ دواتر حوکمی زیندوو ڕاگرتنی شەوی نیوەی شەعبان (١/ ١٨٦)؛ دەربارەی زیادەڕۆچوون لە پێغەمبەر و دوو حەرەمەکەدا (٢/ ٤٠٥)؛ وەڵامی چامەیەك بە ناونیشانی: زیارەت و سەردان (٢/ ٤١٠)؛ بیدعەبوونی ئاهەنگێڕان بە بۆنە ئیسلامییەکان (٨/ ٣٢٨).

یەکێك لە جیاوازییەکانی شێخ – ڕەحمەتی خوای لێبێ – ئەوەیە قسەی کردووە لەبارەی بیدعە و مەترسیداری ئاهەنگێڕان بە ژیاننامەی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ)،بەبۆنەی یادی لە لەدایکبوونی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) (٥/

٥٦)!، لەگەڵ ئەوەی خودی شێخ هەفتانە وتەیەکی هەیە لەبارەی شێخ محەممەدی کوڕی عەبدلوەهاب (١/ ٣٧٤)؛ ئەمەشیان وەك ئەوەی پێشوو هەر بۆنەیە، لەگەڵ بوونی جیاوازیەکی زۆر مەزن لە نێوان محەممەدی کوڕی عەبدوڵا (درود و سڵاوی خوای لێبێ) و محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب (ڕەحمەتی خوای لێبێ).

**ئینجا ڕۆڵی شوێنەوارەکان هات** : لە بازنەی یەکخواناسیدا هێناویەتی، دەبینین بەرپەرچ و وتار دراون لەبارەی حەرام بوونی زیندووکردنەوەی شوێنەوارەکان و هۆشداریدان لەم بارەوە، بەوەی یەکێکە لە هۆکارەکانی هاوبەشدانان! بڕوانە: وەڵام و بەرپەرچەکەی بۆ سالح جەمال (١/ ٤٠١)؛ دواتر وتارەکەی شوێنەوارەکانی مەدینە (ڕەتدانەوەکەی بۆ موستەفا ئەمین) (١/ ٣٩١)؛ دواتر شتەکە گەشەی کرد بۆ ناونیشانێکی مەترسیدار ئەویش بریتی بوو لە: حوکمی ئیسلام لەبارەی زیندووکردنەوەی شوێنەوارەکان! (٣/ ٣٣٤)، بەهەمان شێوە حوکمی ئیسلام لە بارەی بەدواداچوون بۆ شوێنەواری پێغەمبەران (٨/ ٣٢٣).

**ئینجا باسی ئافرەت هات** : باسەکانی ئافرەت لە بەشی یەکخواناسیدا کۆکراونەتەوە، کە پێچەوانەکەی هاوبەشدانانە! سەبارەت بەوەی پەیوەستە بە مەترسی بەشداری ئافرەت لە پاڵ پیاو لە کاردا (١/ ٤١٨)؛ پێگەی ئافرەت لە ژیاندا (٣/ ٣٤٨)؛ حوکمی ئوتومبیل لێخوڕین بۆ ئافرەت (٣/ ٣٥١)؛ بایەخی ڕووپۆشی بۆ ئافرەت (٣/ ٣٥٤)؛ ئافرەت و بانگەواز (٤/ ٣٤٠)؛ دواتر وتەیەك سەبارەت بە حەرامی ڕووت و قوتی (٤/ ٢٤٢)؛ بابەتێکی تر بەناونیشانی: نا بۆ تێکەڵاوی (٤/ ٢٤٢)؛ سەبارەت بە حوکمی تێکەڵاوی لە خوێندندا (٤/ ٢٤٨)؛ هۆشداریدان لەبارەی تێکەڵاوی و ڕووت و قوتی (٤/ ٢٥٤)، حوکمی تۆقە کردنی قوتابی کوڕ لەگەڵ هاوڕێکەی (٤/ ٢٤٧)؛ حوکمی کارکردنی ئافرەت (٤/ ٣٠٨)؛ دواتر دواوە لەسەر ڕەوایی باڵاپۆشی (٥/ ٢٢٤)؛ دووبارە هۆشداریدان لە تێکەوڵای لە قوتابخانەدا (٥/ ٢٣٤، ٢٣٦)؛ حوکمی دانانی ئافرەتان وەك

فەرمانبەری حوکمی لە فەرمانگەکاندا (٦/ ٣٥٥)؛ حوکمی تۆقە کردنی ئافرەتان بەبوونی بەربەستێکەوە (٦/ ٣٥٩)؛ ئافرەت و پزیشك! (٥/ ٣٩٢)؛ جگەلەمانەش چەندانی تر، ئەمانە بابەتی فیقهی کۆمەڵایەتی پەروەردەیین، هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکخواناسیەوە نییە!.

**دواتر پرسە سیاسییەکان** : کە هیچ پەیوەندییەکانیان بە یەکخواناسیەوە نییە، مەگەر بە زۆرەملێ یان تووندگیری بێ، با ئەوە بخەینەوە یاد کە پێچەوانەکەی هاوبەشدانانە! وتارێکی نووسیەوە لەبارەی پرسی فەڵەستین (١/ ٢٢٧)؛ ڕەخنەگرتن لە نەتەوە پەروەری عەرەبی (١/ ٢٨٠)؛ بە فراوانی باسی کردووە، تیایا نەتەوە پەروەرەکانی کافر کردووە؛ وتەیەکی لە کۆنگرەی لوتکەی ئیسلامیدا (٣/ ٣٤١)؛ وتەیەکی دیکەی لەبارەی ڕووداوی مزگەوتی حەرام و مەهدی چاوەڕوانکراو (٤/ ٨٩)؛ ئەمە بابەتێکە لە فیقهدا تاوتوێ دەکرێ؛ دووبارە لەبارەی مەهدی چاوەڕوانکراوەوە (٤/ ٩٨)؛ ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی دەستدرێژی کردنەسەر مزگەوتی حەرام (٤/ ٩٢)؛ حوکمی شینگێڕان لەسەر پادشا و سەرکردەکان (١/ ٤١١)؛ هاریکاری ئیسلامی (٢/ ١٩٠)؛ یەکێتی ئیسلامی و ڕەتدانەوەی سۆفییەکان! (٣/ ١٢٦)؛ جۆرێتی تێکۆشانی فەڵەستین (٤/ ٢٩٥)؛ ئامۆژگارییەك بۆ سەرانی دەوڵەتە عەرەبییەکان (٦/ ٨٢)؛ ئامۆژگارییەك بۆ شا فەیسەڵ (٦/ ٩٣)؛

ئینجا لە چەندین بۆنەدا قسەی کردووە لەبارەی هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلام سەبارەت بە هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت (٦/ ٩٦)؛ هەر لە هەمان بەرگدا لەبارەی هەمان پرسەوە کۆمەڵێك بابەت پێشکەشکراون بڕوانە: (لاپەڕەکانی: ١٠٣، ١١٧، ١٤٨، ١٤٩، ١٥١، ١٥٤، ١٥٥، ١٥٦، ١٥٧، ١٦٦، ١٧٦، ١٨٨، ١٩١، ١٩٩، ٢٠٦، ٢٠٩، ٢١٠، ٢١٤، ٢١٧، ٢١٨، ٢٣٦).

حوکمی گومان کردن سەبارەت بە یارمەتی و پشت بەستن بە ناموسڵمانان لە شەڕکردنی لەگەڵ ستەمکاری عێراق (٦/ ١٤٧)! ئایا دەکرێ شەڕکردن لەگەڵ ناموسڵمان بۆ ئەوەبێ ڕێ لە تێکۆشانی دوژمن بگیرێ (٦/ ١٤٩)؟ ئایا حوکمڕانی عێراق

کافرە و دەکرێ نەفرینی لێ بکرێ؟ (١٥٥)، ئایا ئەو کەسە شەهیدە کە بەهۆی موشەکەکانەوە دەکوژرێ؟ (١٥٧)، ئایا سەنگەر گرتنی خۆبەخشەکان لە شەڕی دژی سەرۆکی عێراقدا دەچێتە ناو سەنگەربەستن لە پێناوی خوادا؟ (١٥٦).

حوکمی پشت بەستن بە بێ باوەڕان لە شەڕکردن لەگەڵ کافر و بێ بڕوایاندا (٢٣٦)!. بەهەمان شێوە چەند بابەتێکی پەیوەست بەمەوە هاتوون لە بەرگی حەوتەمدا، لەم لاپەڕانەدا: (٣٦٦، ٣٨٠، ٣٨٩، ٣٩٨)، هەر کەسێك کەسێکی کافر؛ کافر نەکات، ئەوا خۆیشی وەك ئەوە (٧/ ٤١٧)، لەبارەی کافرکردنی سەدام و دروستی ئاشتەوایی لەگەڵ جولەکە (٨/ ٢١٢). ئەمانە چەند بابەتێکی سیاسین یان زیاتر لە سیاسەتەوە نزیکن، هیچ پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیان بە یەکخواناسیەوە نییە، مەگەر زۆرەملێ پێیەوە بلکێندرێ.

بانگەواز و بانگخوازان: ئەو بابەتانەی پەیوەستن بە فێرکردن و فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە کە لەم بەشەدا کۆکراونەتەوە، بریتین لە چەند بابەتێك هیچ کەس نکۆڵی لە شەرعی بوونیان ناکات، بەڵام کۆکردنەوەیان لە بەشی یەکخواناسی و بیروباوەڕدا، بە زۆرەملێ بووە، شێخ وتەیەکی پێشکەش کردووە لەبارەی بانگەواز و بانگخوازان (٢/ ٣٢٥)؛ بانگەوازی کردن بۆ لای خوا (٢/ ٣٣٢).

وتەیەکی تر لەبارەی بانگەواز (٢/ ٣٤١)؛ وتەیەکی دیکە لەبارەی بانگەواز (٢/ ٣٤٤)؛ چوارەم وتەیەك دەربارەی بانگەواز (ڕەتدانەوەیە) (٢/ ٣٤٧)؛ پێنجەمیان: لەبارەی بانگەوازەوە (ڕەتدانەوەیە) (٢/ ٣٥٢)؛ شەشەمیان لەبارەی بانگەوازەوە (٣/ ١٠٤)؛ حەوتەم لەبارەی بانگەوازەوە (٤/ ٢٢٨)؛ هەشتەمیان: لەبارەی ئەو زانستەی بانگخواز پێویستی پێیەتی (٤/ ٢٣٢)؛ نۆیەمیان: لەبارەی ئەوەی کەشتی ڕزگاربوون فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردنە لە خراپە (٣/ ٣٦٤)؛ دەیەم: دەربارەی ئەرکی مامۆستا (١/ ٣٤٩)؛ یازدەم: لەبارەی بایەخی زانستەوە (٤/ ٥٩)؛ دوازدەم: لەبارەی ڕەوشتی زانایان (٤/ ٧٩)؛ سێزدەم: لەبارەی زانست و ڕەوشتی زانایان (٢/ ٣٠١)؛

چواردەم بە ناونیشانی: لەسەر ڕێگەی زانست (٢/ ٣١٦)؛ پازدەم: سەبارەت بە ئەرکی زانایان بەرامبەر ئوممەت (٤/ ١٣٤)؛ ڕۆشنبیری بانگخواز (٤/ ٢٣٥)؛ کتێبە بەسوودەکان بۆ بانگەواز (٤/ ٢٣٨).

**چەند حوکمێکی فیقهی و ئامۆژگاری** : ئەمانەش لە بەشی یەکخواناسیدا کۆکراونەتەوە، کە پێچەوانەکەی هاوبەشدانانە! وەك حوکمی چەپڵە لێدان لە ئاهەنگەکاندا (٤/ ١٥١)؛ حوکمی بازنەی مسی (١/ ٢٠٦)؛ حەرامبوونی دیاریکردنی ڕەچەڵەك (٣/ ٣٢٦)؛ هۆشداریدان لەبارەی بەرتیل (٣/ ٣٥٧)؛ هۆشداریدان لەبارەی قومار و فێڵکاری و خواردنەوەی ماددەی بێهۆشکەر (٤/ ٢٠٠)؛ حوکمی قاپ و کەل و پەلی زێڕ (٤/ ١٢٣)؛ حوکمی زەکاتی خشڵ (٤/ ١٢٤)؛ پێویستبوونی شوکرانە بژێری لەسەر بەهرە و نیعمەتەکان (٤/ ٣٧)؛ سەرزەنشتکردنی زیادەڕەوی (إسراف) (٤/ ١١٢)؛ هۆشداریدان لەبارەی ڕۆژنامە ڕووت و قوتەکان (٤/ ٢٠٦)؛ بەهەمان شێوە لەبارەی گۆڤارە ڕووت و قوتەکان (٤/ ٢٠٨)؛ بانگەوازێکی گشتی بۆ موسڵمانان (٢/ ٤١٣)؛ تەنها مزگەوتەکان و موسڵمانان لە دوورگەی عەرەبدا دەمێننەوە (٣/ ٢٨٢)؛ هاوسەرگیری بە نیازی تەڵاقدان (٤/ ٢٩)؛ ڕەوشتی ئافرەتان و پیاوانی باوەڕدار (٤/ ٣٩)؛ بیرهێنانەوەی خوا و برایەتی لە پێناوی خوادا (٤/ ١٠٥)؛ حوکمی نەهێشتنی نەخوێندەواری (٤/ ١٤٢)؛ حوکمی گریان بەهۆی نەخۆشیەوە (٤/ ١٤٤)؛ حوکمی ئەوەی سوێند لەسەر تۆبە بخوات (٤/ ١٤٥)؛ پاداشتی نوێژکردن لە مەککە (٤/ ١٣٠)؛ گۆڕینی ناو دوای هاتنە ناو ئیسلام (٤/ ١٥٣)؛ حوکمی هەڵسان لەبەر کەسی هاتوو (٤/ ٣٩٤).

حوکمی یاریەکانی بۆکسێن و ململانێی ئازاد و زۆرانبازێی گا (٤/ ٤١١)؛ حوکمی ئەوەی حوکم دەکات بە جگە لەو بەرنامەیەی خوا دایبەزاندووە (٤/ ٤١٦)؛ حوکمی خەتەنەکردن (٤/ ٤٢٣)؛ پێویستی بەزەیی هاتنەوە بە گیانلەبەردا (٤/ ٢٩٧)؛ بەجێهێشتنی کار و ڕوو لە قوتابخانە کردن (٤/ ٣٠٧)؛ حوکمی کارکردن لە بانکەکاندا

(٤/ ٣١٠)؛ دروست نییە وەسفی مردوو بکرێ بە ((خوالێخۆشبوو)) و ((ڕەحمەپێکراو)) (٤/ ٣٣٥).

حوکمی نووسین لەسەر گۆڕەکان (٤/ ٣٢٩)؛ حوکمی خوێندنی قورئان بۆ مردوو (٤/ ٣٣٩)؛ بەوەفابوون بەرامبەر نەزر (٤/ ٣٥٠)؛ حوکمی یاری پەڕەکان (٦/ ٤٨٩)؛ حوکمی گوێگرتن بۆ ڕادیۆ (٦/ ٤٩٠)؛ حوکمی بەرنامە بەسوودەکان، کە مۆسیقایان لەگەڵ تێکەڵ دەکرێ (٦/ ٤٩٠)؛ حوکمی تەماشاکردنی تەلەفزیۆن (٦/ ٤٩١)؛ حوکمی نوکتە لە ئیسلامدا (٦/ ٤٩٢)؛ حوکمی دانان و لێدانی کرێم لە ڕووخسار (٦/ ٤٩٦)؛ حوکمی بەکارهێنانی گوڵاوی کۆلۆنیا (٦/ ٤٩٧)؛ حوکمی لەپێکردنی پێڵاوی بن بەرز (٦/ ٤٩٩).

حوکمی ڕێوڕەسمەکانی پرسە و سەرەخۆشی (٥/ ٣٤٥)؛ حوکمی فرۆشتنی گیاندارە مۆمیاکراوەکان (٥/ ٣٧٧)؛ حوکمی درێژ بەردانی پۆشاك بەبێ فیز لێدان (٥/ ٣٨٠)؛ چەند پرسیارێك لەبارەی بۆن و گوڵاوەکان (٥/ ٣٨٢)؛ حوکمی سەیرکردنی تەلەفزیۆن (٩/ ٣٨٤)؛ حوکمی خۆداپۆشین لە خزمەتکاری مەسیحی (٦/ ٤٥٤)؛ حوکمی جگەرەکێشان (٦/ ١٦٢)؛ حوکمی جگەرە و بازرگانی پێکردنی (٦/ ٤٥٥)؛ ئەمە دووبارە بووەتەوە لە (٨/ ٩٨)؛ حوکمی لەبەرکردنی پاڵتۆیە پێستییەکان (٦/ ٤٤٦)؛ حوکمی سڵاوکردن لەوەی بە موبایل قسە دەکات، سەبارەت بەوەی ئەگەر نەیزانی ئەو کەسە موسڵمانە یان ناموسڵمانە (٦/ ٣٦٦)!؟ حوکمی کارکردن بە داب و نەریتە تیرەییەکان (٥/ ١٤٢)؛ تیرەگەرایی و خوزەیری (٥/ ١٤٦)؛ حوکمی دەستلێدان لە قورئان بەبێ دەستنوێژ (٤/ ٣٨٣)؛ کارکردن لە کارگەکانی مەیی دروستکردن (٤/ ٤٣٣)؛ خواردنی ئاژەڵە سەربڕاوەکانی موسڵمانان (٤/ ٤٣٥)؛ حوکمی شەرم کردن لە نکوڵی کردن لەوانەی کاریان پاشملە باسکردنی خەڵکە (٤/ ٤٤٠)؛ خولیای وێنەکێشانی شتەکان (٥/ ٣٩٤)؛ لێرسینەوە لە ڕۆژی دوایی دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاك (٥/ ٣٩٦)؛ حوکمی ئاژەڵە سەربڕاوەکانی نەسرانیەکان (٥/ ٣٩٦)؛ درود و سڵاودان لەسەر پێغەمبەر لە

دوای بانگدان، ئایا بیدعەیە؟ (٥/ ٤٣٩)؛ حوکمی دەست بەرزکردنـەوە لـە کـاتی نـزا و پاڕانـەوەدا (٦/ ١٥٨)؛ حـوکمی کوشـتنی جانـەوەران لـە ماڵەکانـدا (٧/ ١٤٨)؛ حـوکمی تەوەسول کردن لە پلەوپایەی پێغەمبەر (٧/ ١٣٣).

**ئامۆژگارییـەکان:** گـەلێك زۆرن؛ ئامۆژگـاری گشـتین لـەبارەی چـەندین بابـەتی جیاواز،بەڵام لە بەشی یەکخواناسیدا دانـراون، کـە پێچەوانەکەی هاوبەشـدانانە! بـۆ نموونە ئەمانە: ئامۆژگارییەکی گشتی (٣/ ٩٣)؛ ئامۆژگارییەکی تری گشـتی (٣/ ٢٥٣)؛ ئامۆژگاری سێیەم (٤/ ١٨٠)؛ ئامۆژگارییەکی گشتی بۆ کاربەدەسـتان و گـەل (٣/ ٢٤٢)؛ ئامۆژگاریـەك دەربـارەی چـەند گـەورە تاوانێکـەوە (٣/ ٢٣٦)؛ ئامۆژگاریـەك بـۆ نەخۆشـەکانی نەخۆشـخانەی بلیبـان (٣/ ٢٦٠)؛ پێویسـتی ڕاسـتگۆیی و دڵسـۆزی لـە مامەڵەدا (٤/ ١٠٣)؛ وتەیەك بە بۆنەی مۆڵەتی بەهارەوە (٤/ ١٨٧)؛ گـەنجان و مۆڵـەت (٤/ ١٩٠)؛ پرسە و سەرەخۆشی کردن لـە گوناهکـاران (٤/ ٢٢٧)؛ پـەروەردەکردنی سـێ کچ (٤/ ٣٧٥)؛ پێویستی فەرمانکردن بە چاکە (٥/ ٧٤)؛ پێویستی یارمەتیـدان لەسـەر چاکە (٤/ ٨٦)؛ ئەرکی گـەنجان (٥/ ١١٧)؛ هۆکارەکـانی بەختـەوەری ئوممـەت (٥/ ٩٤)؛ هۆشـداریدان لـەبارەی قومـارەوە (٥/ ٢٤١)؛ وەسـیەتێك بـۆ هەنـدێك کاربەدەسـتان و میرەکان بە بۆنەی دامەزرانیان وەك میری چـەند ناوچـەیەك (٦/ ٢٩٥)؛ وتـەیـەك بـە بۆنەی باوباران و لافاوەکانی بەنگلادش (٦/ ٣٤٦)؛ هۆکارەکانی لاوازی موسـڵمانان (٥/ ١٠١).

**وەڵام و بەرپەرچەکان و چـاوپێکەوتنەکان:** ئەمانـەش لـە بەشـی یەکخواناسـیدا کۆکراونەتەوە، لەگەڵ ئەوەی پەیوەندیان بە یەکخواناسیەوە نییە، مەگەر کـەمێکیان نـەبێ، لەوانـە: بەرپەرچـدانەوەی دەسـتەی ڕادیـۆی بـەڕیتانی (بەدرۆخسـتنەوەی هەواڵێك) (٢/ ٣٨٠)؛ وەڵامدانەوەی بابەتێکی بڵاوکراوە لە گۆڤاری مصەویـر (٣/ ١٥٦)؛

وەڵامێك بۆ بابەتێکی بڵاوکراوە لە گۆڤاری ئیقرەء (٣/ ١٧٠)؛ وەڵامی بابەتێك کە لە گۆڤاری یەمامە بڵاوکراوەتەوە (٤/ ٢٠٤)؛ چاوپێکەوتنێك لە گۆڤاری ڕایەی سودانی (٤/ ١٦٦)؛ چاوپێکەوتنێك لە گۆڤاری تەکبیری پاکستانی (٢/ ٤٤٨)؛ وەڵامێك بۆ صابونی لەبارەی ئەوەی نووسیویەتی لەسەر سیفەتەکان (٣/ ٥١)؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ تێکۆشەرەکە (٥/ ١٥١)؛ چاوپێکەوتنێك لە ڕۆژنامەی عوکاز (٥/ ٢٥٥).

**پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تر:** لەوانە: هۆشداریدان لە گەشت کردن بۆ دەرەوە (٤/ ١٢٩)؛ گوایە گەشتکردن حەرامە، مەگەر بۆ پێویستی نەبێ، دووبارە جەختی کردۆتەوە لەسەر هۆشداریدان لە گەشتکردن بۆ وڵاتانی کوفر (٤/ ١٩٢)، دواتر باسی حوکمی گەشتکردنی کردۆتەوە بۆ دەرەوەی وڵاتانی ئیسلامی (٤/ ١٩٥)؛ سێیەمیان: بە ناونیشانی: نا بۆ ئەم گەشتانە (٤/ ١٩٧)؛ حوکمی گەشتکردن بۆ وڵاتانی هاوبەشدانەران (٩/ ٢٩٩)؛ مانەوە لە ناویاندا (٩/ ٤٠١، ٤٠٢). قسەی کردووە لەبارەی ئەرکی موسڵمان بەرامبەر کەسی بێ باوەڕ (٤/ ٢٦٦)؛ دواتر ئەم خۆپارێزیەی بەسەر موسڵمانانیشدا داداوە، قسەی کردووە دەربارەی حوکمی نوێژکردن لەگەڵ ئەوانەی دەست بە بیدعەوە دەگرن (٤/ ٣٠٣).

دواتر حوکمی نوێژ کردن لە دوای ئەو کەسەی ناسراوە بە زیادەڕۆچوون لە پێغەمبەران و پیاوچاکانەوە (٤/ ٣١٢)؛ ئینجا حوکمی ئەو کەسەی نوێژ دەکات لە دوای ئەو کەسەی هاواری جگە لە خوا دەکات (٤/ ٣١٤)؛ دروست نییە پێشتر موسڵمان سڵاو لە بێ باوەڕ بکات (٥/ ٣٤٢)؛ حوکمی گەشتکردن بۆ وڵاتی کوفر (٥/ ٣٩٠)؛ سەرەدانی نێوان ئافرەتانی موسڵمان و ناموسڵمان (٤/ ٣٧٨)؛ حوکمی مانەوە لەگەڵ خێزاندا لە دەرەوە (٤/ ٣٨١)؛ حوکمی شەرعی لەبارەی کچێکی شیعە، سەرپەرشتیار ڕێگەی لێدەگرێ گرێبەستی ڤیران ئەنجام بدات (٤/ ٤٣٧)؛ ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی تاقمی شیعە (٤/ ٤٣٩).

حــوکمی حوســەینیەکانی ڕافیزەکــان (٨/ ٣٢٠)؛ هانــدان لەســەر بوارەکــانی ڕاگەیاندن و دەبێ بەجێ نەهێڵدرێ بۆ نــەزان و لادەرەکان (٥/ ٣٦٩)؛ تەنگهەڵچنینی بانگخوازانی گومڕایی بە چاکەخوازان و زانایان (٥/ ٢٩٢)؛ حوکمی پێشنوێژی کردنی کەسی دژەڕا وەك کەسی ئەشعەری (٥/ ٤٢٦)؛ هەر کەسێك سوربێ لەسەر تاوانکاری نابێ موسڵمان لەگەڵ دابنیشێ (٥/ ٤٣٥)؛ دوورکەوتنــەوە لــە ئەنجامــدەرانی گوناهــە مەزنەکان (٥/ ٣٩٨)؛ دوورکەوتنەوە لەوەی بە پاشەملە باسی خەڵك دەکات (٥/ ٤٠١)؛ کۆمەڵەی ڕاگەیاندنی پەیامی خوا (٨/ ٣٣١).

حــوکمی دەرچــوون لەگــەڵ کۆمەڵــەی نــاوبراو (٩/ ٣٠٧)؛ هۆشــداریدان لــە حەبەشــییەکان و گومڕاییکاریەکــەیان (٩/ ٣١٥)؛ هۆشــداریدان لــە بڵاوکراوەکــانی مەسعەری (٨/ ٤١٢)؛ ئامۆژگارییەك سەبارەت بە نەخوێندنەوەی بڵاوکراوەی (لیژنەی بــەرگری لــە مافــە ڕەواکــان) (٨/ ٤١٨)؛ کــافر کردنــی ڕجــائی جــارودی (٩/ ١٩٣)؛ هۆشــداریەك لــە بــارەی کــۆنگرەی پــەکین لــەبارەی ئــافرەت (٩/ ٢٠٣)؛ بیروبــاوەڕی سۆفییەکان پوچەڵە (٩/ ٤٥٧).

**چەند بابــەتێکی کــەلتوری و ڕۆشــنبیر و ڕێکخراوەیــی:** لــە بەشی یەکخواناسیدا باســکراون، وەك: وتەیــەك دەربــارەی هێرشــی هــزری (٣/ ٤٣٨)؛ ئــەرکی زانایــان لەبەرامبەر زۆری ڕێکخراو و کۆمەڵەکان (٤/ ١٣٦)؛ بزوتنەوە ئیسلامییەکان (٢/ ٣٦٠)؛ کەمینە ئیسلامییەکان (٢/ ٣٧٠)؛ مەترسی خوێندنەوە کتێبە هزری و ڕۆشنبیرییەکان (٩/ ٢٣٥)، ئــەدەبی ئیســلامی (٧/ ٢٠١)؛ بایەخــدان بــە کەلــەپوری ئیســلامی و مەترسیداری بەشێکی (٦/ ٢٦٥)؛ ئایا ئیسلام بــە زەبــری شمشێر بڵاوبووەتــەوە؟ (٦/ ٢٨٧).

**چەند بابەتێکی زانستی:** ئەمانەش لە بەشی یەکخواناسیدا دانراون، کە دژەکەی هاوبەشدانانە! گونجان و توانای ڕۆیشتنە سەر هەسارەکان و بەڵگە لەسەر چەسپاوی زەوی و خولانەوە و سوڕانەوەی خۆر... (١/ ٢٥٤).

**هەڵوێست لەبارەی شتە تازەکان :** پێویستی هەبوونی دادگای شەرعی (٤/ ٥٧)؛ بەراورد لە نێوان شەریعەت و یاسادا (٤/ ٥٧)؛ ڕەخنەگرتن لە یاسای باری کەسێتی لە هەندێك وڵاتانی ئیسلامیدا (٤/ ١٢٦)؛ حوکمی ئەوانەی یاسا دەستکردەکان دەخوێنن یان بەوانە دەڵێنەوە (٢/ ٣٢٥)؛ دیاردەی شوفێران و خزمەتکاران (٤/ ٣٩٢)؛ حوکمی هێنانەوە و ئامادەکردنی گیانەکان (٣/ ٣٠٩)؛ بەکارهێنانی ئاو پرژێن تاوان و خراپەیەکی مەزنە (٧/ ٣٩٩)؛ حوکمی ئیسلام لەبارەی جەژنی دایك (٥/ ١٨٩).

**لەبارەی تێکۆشان و تێکۆشەرانەوە:** پلەوپایەی تێکۆشان و تێکۆشەران (٢/ ٤٣٠)؛ تێکۆشان تەنها بۆ بەرگری کردن نییە (٣/ ١٧١)؛ نامەیەك بۆ تێکۆشەرە ئەفغانییەکان (٥/ ١٤٨)؛ لەگەڵ چەندین فەتوای زۆر لەسەر پێویستی پاڵپشتی کردنی تێکۆشەران نە ئەفغانستان و بۆسنە و چیچان.... تاد.

## سۆز و خۆشەویستی بۆ نیشتمان دروست نییە، مەگەر ئیسلامی بێ و شەریعەت جێبەجێ بکات

کاتێك یەکێك زیادەڕۆچوونی زیادەڕەوانی لە تەکفیر کردنی ئەوانەی داندەنێن بە (خۆشەویستی بۆ نیشتمان) لەلای تێکەڵ و ئاڵۆز بوو، شێخ ئیبن باز بەرگری لەە زیادەڕۆچوونە گرت، بەوەی وتی: ((لەوانەیە نیشتمانەکەی ئیسلامی نەبێ! جا چۆن نیشتمانەکەی خۆشدەوێ؟!!)) (مجموع فتاوى ابن باز ٩/ ٣١٧).

دەڵێم: ئەمەش دەچێتە سەر لێکۆڵینەوەکەی ئیبن باز، ئەمە فەتوایەکی مەترسیدارە، چونکە بۆ هەر کەسێك هەیە نیشتمانەکەی لە ئیسلامی بوون دەربکات. دواتر فەتواکانی زاناکانیان کە پێیان وایە – بەپێی تێڕوانینی وەهابییەت – هەر دەوڵەتێك شەرع جێبەجێ نەکات ئەوا نا ئیسلامییە. ئەم فەتوایە کراوەیە بۆ گەلانی جیهانی ئیسلامی، بەوەی خۆشویستن بۆ نیشتمان بتپەرستییە!. هەر بەم هۆیە زۆربوونی ڕێژەی توندڕەوی لە جیهانی ئیسلامیدا و شانشینەکە نابێتە سەرسامکەر بۆمان، چونکە ئەم فەتوایانە لە لایەن گەورە زاناکانی سعودیەوە دەرکراوە.

**چەپڵە لێدان:** خۆچوواندنە بە بێ باوەڕ و کافران، سیمایەکە لە سیماکانی نەفامی! حەرامە (الفتاوی الشرعیة، کۆکردنەوەی: الجریسی، لا ١٥٧٤ لە فەتواکانی ئیبن باز).

**وتنی: ((صدق الله العظیم)):** دەبێ موسڵمان خۆی لێ دووربگرێ، خووی پێوە نەگیرێ، چونکە بیدعەیە (الفتاوی الشرعیة، کۆکردنەوەی: الجریسی، لا ٤١٤ لە فەتواکانی ئیبن باز).

**تۆقەکردن لە دوای نوێژ:** بەهەمان شێوە بیدعەیە (الفتاوی الشرعیة، کۆکردنەوەی: الجریسی، ١٥٧٤ لە فەتواکانی ئیبن باز).

شێخ ئیبن باز فەتوای داوە بە حەرام بوونی هێنانی خزمەتکاری نا موسڵمان چ پیاو یان ئافرەت بێ بۆ دوورگەی عەرەبی[١].

تەلەفزیۆن و هۆشداریدان لەبارەیەوە[٢].

(١)الفتاوی الشرعیة، جمع الجریسي، ٣١٠.

(٢)الفتاوی الشرعیة ٤٢٧.

## فەتوایەك سەبارەت بە گۆیی نەبوونی زەوی

((تەنها بەناوی خوای مەزن، درود و سڵاو لەسەر پێغەمبەرمان محەممەد کۆتـ پێغەمبەر و دواهەمیین پەیامبەر، سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانەکان.

وتن و دانـان بە سوڕانەوەی زەوی، بۆچوونێکی پوچەڵە، باوەڕ پێکردنی دەبێتە هۆی دەرچوون لە بازنەی ئاینی ئیسلام؛ بەهۆی دژ بوونی لەگەڵ ئەوەی لە قورئـانی پیرۆزدا هاتووە، کە ئاماژەی داوە بەوەی زەوی چەسپاوە، خوای مەزن بە چیای ستوون ئاسا ڕاگر و چەسپاوی کـردووە، خـوای پـاك و بێگـەرد فەرموویـەتی : ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ٧﴾النبأ. واته : ( "ئایا" کێوەکانمان وەك مێخ بـۆ دانـەکوتاون؟ ) .﴿وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ٢٠﴾الغاشية. واتـه : ( ئـەی سـەرنجی دەشـتەکانی زەوی نـادەن چـۆن تەختکراوە) . ماناکانیان زۆر ڕوونە، زەوی گۆیی نییە، نا سوڕێتەوە، هـەروەك چـۆن خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ ڕوونی کردۆتەوە، لەوانـەیە سوڕانەوە یـان گـۆڕانی لـە تورەیی خوای پاك و بەرزەوە بێ، هەروەك لەم فەرمایشتەی خوای پاکدا هـاتووە: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ١٦ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ١٧﴾الملك. واتـه : ( ئایا لـەو زاتـە ناترسـن کـە لەسەرووی ئاسمانەوەیە ، کە بەناخی زەویدا بتانباتە خوارەوە ؟! جا دەستبەجێ ئەو زەوی یە بێتە لەرزە . یاخود لەو زاتە ناترسن کە لەسـەروو ئاسماندایـە کـە بایـەکی بەهێز هەڵکاتە سەرتان و بەرد بارانتان بکات ؟! ئەوسا دەزانـن هەڕەشـەی مـن چـۆن بووە ) . زەوی و کێوەکان لە زەویدا دانراون بۆ ڕاگرتنی و پیشگرتن لـە خولانـەوە و بزاوتنـی زەوی، خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَأَنۡهَٰرٗا وَسُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٥﴾النحل. واتـه : ( هـەر خـوا لەسـەرروو کاری زەوی چیاکانی چەسپاندووە تا لەنگەری بگرێت و ئێوە نەلـەرزێنێت و لارتـ

نەکاتەوەو ژێرەوژوور نەبن ، هەروەها چەم و رووبارو ڕێگەو بانی تیادا بەدیهێناوە ، بۆ ئـەوەی رێ دەرکـەن و بەمـەرامی خۆتـان بگـەن ) . ﴿ وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ ﴿٣١﴾ ﴾الأنبياء. واتە: (لە زەویشدا کەژو کێوەکانمان چەسپاندووە). واتـە چـیاکان زەویـان ڕاگرتـووە و چەسـپاندووە و گرانیـان کـردووە، بـۆ ئـەوەی لار نەبێتـەوە و هـەڵیان نەگێڕێتەوە، ئەگەر جوڵ و شڵەژا ئەوا چەسپاوی ڕوونادا.

زەوی بەڵگە و ئاماژەیە بۆ گەورەیی بەدیهێنەری پاك و بێگەرد، نیشانەیەکە لە نیشـانەکانی، وەك گشـت نیشـانەکانی تـری مـەزنی ئـەو، خـوای مـەزن باسـی ئـەوەی کردووە خۆر و مانگ دەڕۆن و مەلە دەکەن لەسەر خولگەی خۆیان، ئەمەشی لـە دوو ئایەتدا ئاماژە پێداوە، ئەوانیش ئەم ئایەتانـەن: ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ واتە: (هەر ئەو زاتەیە کە شەوو ڕۆژی بـەدیهێناوە ، خۆرو مانگیشی دروستکردووە ، هەریەکەیان لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە) ، هەروەها ئـەم فەرمایشـتە: ﴿ لَا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾یس. واتە : ( نەخۆر بۆی هەیە بەمانگ بگات "لە هێڵ و ڕێڕەوی خۆی دەربچێت" ، نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت ، بەڵکو هەریەکەیان لـە خولگـەی تایبەتی خۆیاندا مەلە دەکەن و بەئاسانی دەسوڕێنەوە). باسی ئەوەی نەکردووە زەوی دەسوڕێتەوە، وەك چۆن وا گومان دەبرێ.

ئەگەر زەوی سوڕابایەوە ئەوا خوای پاك و بێگەرد یـان پێغەمبەرەکـەی (درود و سڵاوی خوای لێبێ) بەئێمەی ڕادەگەیاند، کە ئێمەی لەسەر بەڵگە و ڕێگەیەکی ڕۆشـن هێشتۆتەوە، شەوەکەی وەك ڕۆژەکەیـەتی، تـەنها کەسـێك لێـی لادەدات کـە تیاچـووە. سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانەکان)).

## فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی زانایانی تر

نموونەی تر بۆ ئەم توێژینەوەیە (لە زانا و بانگخوازان)؛ لە زانا ناوخۆییە کاریگەرەکان لە دوای دوو شێخە موفتیەکە ئیبن ئیبراهیم و ئیبن باز، ئەوانەن:

ئیبن عوسەیمین (دیارترین زانا، لە دوای شێخ ئیبن باز، بەڵام ئەندامی لیژنەی فەتوا نییە).

**عەبدولعەزیزی ئالی شێخ** (ئەندامی پێشووی لیژنەی فەتوا و ئێستاش موفتی گشتییە).

**ساڵحی کوڕی غەصون** (ئەندامی لیژنەی فەتوا، ١٤١٩ك کۆچی دوایی کردووە).

**عەبدولڕەزاق عەفیفی** (ئەندامی لیژنەی فەتوا، نزیکەی ١٤١٩ك کۆچی دوایی کردووە).

**ساڵح فەوزان** (ئەندامی لیژنەی فەتوا).

**عەبدوڵای کوڕی جبرین** (ئەندامی لیژنەی فەتوا).

**عەبدوڵای کوڕی قعود** (ئەندامی لیژنەی فەتوا).

**عەبدوڵای کوڕی غدیان** (ئەندامی لیژنەی فەتوا).

**بەکری باوکی زەید** (ئەندامی لیژنەی فەتوا).

**حەمود توەیجری** (١٤١٣ کاریگەر و ئەندامی لیژنەی فەتوا نییە).

**عەبدوڵای کوڕی حەمید**(١٤٠٢ك کۆچی دوایی کردووە، ئەندامی پێشووی لیژنەی فەتوا بووە)

**لە بانگخوازە ناودارەکان**

**سەفەری حەوالی** (بانگخوازێکی کاریگەرە، ئەندامی لیژنەی فەتوا نییە).

**سەلمان عۆدە** (بانگخوازێکی کاریگەرە، ئەندامی لیژنەی فەتوا نییە).

**عایز قەڕەنی** (بانگخوازێکی کاریگەرە، ئەندامی لیژنەی فەتوا نییە).

**ناصر عەمر** (بانگخوازێکی کاریگەرە، ئەندامی لیژنەی فەتوا نییە).

جگە لەمانەش شوێنەواریان هەیە، بەڵام ناوبراوان دیارترین و زەقترینن لەسەر گۆڕەپان، هیچیان لە زیادەڕۆچوونێکی پێشوتر و هەڵخەڵەتانێکی دواتر سەلامەت نەبوونە، جا چ لە گۆڕەپانی فەتوادا یان بانگەواز یاخود بزوتنەوەدا بێ، ئێمە حەزمان لە دووانە کە ئەویش بریتین لە شێخ سەلمان عوْدە (بەوەی لە پەرستنی جەماوەرەوە دەربچێ و بێتە ناو خودی خواپەرستیەوە، هاوسەنگیەکەی کورت نەکاتەوە لەسەر کۆمەڵێکی بەرتەسکی هاوەڵانی)، شێخ عایز قەرەنی (با ویژدانی خۆی بکاتە دادوەر و تەنها خوێندنەوە زیاد نەکات و لە مەزهەب نەترسێت)!، سەبارەت بە شێخ سەفەر و شێخ ناصر مەعمەر، ئەوا – لەوەی دەردەکەوێ – هیچ هیوایەك نییە بەوەی بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕاستی، چونکە یەکەمیان ئالۆدەیە بە ئیبن تەیمییە، تەنانەت بە فێل و بادانەوە و هەڵبەستن و نەصب و سیاسەتەکانی، هەر کەسێکیش ئیبن تەیمیەی تێدا توابێتەوە بەم هەموو دەردانەوە، ئەوا دیارە سزاکەی لای خوا بێ بەشبوون دەبێ لە ڕێنوێنی کران، دووەمیان شایستەی لێکۆڵینەوە نییە، لەوانەیە لای خوا پاساودار بێ.

### ئەو نموونەیەی توێژینەوەی لەسەر دەکرێ ( لە کتێب و دانراوەکان )

کتێب و دانراوەکان زۆرن (زیاترن لە ٣٠٠ دانراو)، فەتوا و ڕا و بۆچوونەکان لە کتێبەکاندا پەرش و بڵاون و جگە لەمانەش گەلێك زۆرن، هەر ئەمانەش بنچینەن، چونکە پشت بەستن بە فەتوا گوێزراوە زارەکییەکان زۆربەی جاران گومان هەڵدەگرێ، ئەگەر نا زۆر فەتوا و ڕا و بۆچوونی نامۆی ئەوانە دەبینین کە کەمێك پێش ئێستا ناومان هێنان.

پێش خستنەڕووی چەند نموونەیەك لە ناوەڕۆکی ئەو کتێبانە لە فەتوا و ڕاو بۆچوونەکان، ئەوا باشترە ئاماژە بکەین بە ئەندازەی ئەم دانراوانە.

## ڕێژه‌ی ئه‌و كتێبانه‌ی وه‌ك نموونه‌ی لێكۆڵینه‌وه‌ وه‌رگیراون

مه‌جموع فه‌تاوای لیژنه‌ی هه‌میشه‌یی، كه‌ گه‌یشتووه‌ته‌ ٢٤ به‌رگ.

هه‌روه‌ها فه‌تاواكه‌ی ئیبن عوسه‌یمین كه‌ نزیكه‌ی ٢٥ به‌رگه‌، له‌گه‌ڵ كتێبه‌كانی كه‌ زیاترن له‌ ١٠٠ كتێب.

كتێبه‌كانی حه‌مودی توه‌یجری گه‌یشتووه‌ته‌ ٤٠ دانراو.

دانراوه‌كانی ساڵح فه‌وزان نزیكه‌ی ٢٠ دانراو.

شێخ به‌كری باوكی زه‌ید زیاتر له‌ ٦٠ كتێب.

بانگخوازانیش هه‌زاران كاسێتی تۆماركراو و ده‌یان كتێبیان هه‌یه‌.

ئه‌مه‌ جگه‌ له‌ كتێبه‌كان شێخ ئیبن باز و شێخ ئیبن ئیبراهیم، كه‌ پێشتر توێژینه‌وه‌یان له‌سه‌ركرا.

هه‌روه‌ها جگه‌ له‌ كۆمه‌ڵه‌ دانراوه‌كانی شێخ محه‌ممه‌دی كوڕی عه‌بدولوه‌هاب و قوتابییه‌كان و قوتابخانه‌كه‌ی تا سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی ڕابردوو، نموونه‌ وه‌ك: كتێبی (الدرر السنية)، (ئه‌مه‌یان پێشتر توێژینه‌وه‌ی له‌سه‌ر كراوه‌ و نموونه‌ی له‌سه‌ر نمایش كراوه‌).

ئه‌م ٣٠٠ كتێبه‌ كۆی كه‌رسته‌ی لێكۆڵینه‌وه‌ی ئه‌م توێژینه‌وه‌یه‌یه‌، ته‌نها (٣٠٠ كتێب)! چونكه‌ هه‌ندێك كتێب چه‌ند به‌رگێكن، به‌مه‌ش له‌وانه‌یه‌ كۆی به‌رگ و به‌شه‌كان بگاته‌ نزیكه‌ی ٥٠٠ به‌رگ له‌ نێوان به‌رگی مه‌زن و به‌رگی بچوك له‌م توێژینه‌وه‌یه‌دا.

## جۆری هزر و ڕا و بۆچوون نێو ئه‌م كتێبانه‌

به‌ڵام به‌خۆشبه‌ختیه‌وه‌ زۆربه‌ی فه‌توا و ڕا و بۆچوونه‌كان دووباره‌ن...

خه‌ریكه‌ كتێبه‌كان ببنه‌ یه‌ك كتێب...

بەڵکو ئەگەر شتە دووبارە بووەوەکان بسڕینەوە، لە هەر کتێبێك لەم کتێبانە، ئەوا دەردەکەوت کە ئەم (٥٠٠ بەرگە) تایبەت بە یەك بابەت کە بیروباوەڕە، لە یەك بەشی بچوکی زیاتر لێ دەرناچێ، پوختەکەشی ئەمەی خوارەوەیە

## پوختەی بیروباوەڕ لەم کتێبانەدا

زمان حاڵی بیروباوەڕ لەم کتێبانەدا دەڵێت:

موسڵمانان – جگە لە خۆمان -، دابەشبوونە لەنێوان بێ باوەڕ و بیدعەچی، هەر دوو بەشە ناوبراوەکەش دەبێ تۆبەیان لێوەربگیرێ یان بکوژرێن.

بەڵام دوو کۆسپمان لەبەردەمە، یەکەمیان: دەسەڵات ڕەزامەندی نادات لەسەر ئەمە.

دووەمیان زۆربەی خەڵك حەقیقەت و ڕاستینەی ئایین نازانن و شارەزا نین لێی.

بۆیە دەبێ لێرەدا کار لەسەر دوو بەرە بکرێ:

## یەکەم: بەرەی دەسەڵات

دەبێ زمانخۆشی بۆ دەسەڵات بکرێ و نەرمی لەگەڵ بنوێنرێ و بەلای خۆماندا لاری بکەینەوە، بۆ ئەوەی بیروباوەڕەکەی ببێتە هەمان بیروباوەڕی خۆمان، ئەو هەستەی لا دروست بکەین کە ئێمە پشتێنی پارێزەری ئەوین، چاکە و بەرژەوەندی ئەو لەگەڵ ئێمەدایە؛ و خراپە و زیانیشی لەگەڵ جگە لە خۆماندایە، بەڵێنی پاداشتی زۆری پێبدرێ، هەر کاتێك بەخششی پێشکەش ناوەندێك کرد یان کتێبێکی بۆمان لە چاپدا یاخود مزگەوتێکی دروستکرد، هەروەها بۆ ئەوەی ڕووماڵی سیاسیمان بۆ دابین بکات کە لە میانەیدا دەگەین بە دەرەوە.

## دووەمیان: بەرەی خەڵکی سادە و تازە پێگەیشتوو

ئەوانە دەگۆڕێن لە میانەی شارەزاکردنیان لە بیروباوەڕماندا، هۆشداریدانی دووبارە لەبارەی مەزهەبەکانیان، لە ڕێگەی فێرکردن و وتار و فەتوا و کتێب، بۆ ئەوەی ببنە ئوممەتی ئایندە، لە سەروبەندی بەردەوامبوونی فشار لە ڕێی لایەنە

حکومییـەکان لـە میانـەی فێرکـردن و دادگـا و ئاسـایش و کتێـب...تـاد، ئـەوا ئـەم مەزهەبانە دەتوێنەوە.

جا ئەگەر دەسەڵاتدار و خەڵك باش بوو، ئەوا گۆڕەپانی ناوخۆ دەسازێت و پـاك دەبێتەوە، تەنها بۆ خۆمان دەبێ.

ئەو کاتە ڕوو دەکەینە گۆڕەپان و مەیدانی ئیسلامی، ئینجا جیهانی.

ئەمـە نزیکـەی سـتراتیژیەتی ئـەم کتێبانەیـە کـە بـە پـەرش و بڵـاوی لـە لاپەڕەکانیاندا هاتوون.

لەوانەیە هەندێك پێیان وابێ ئەم وێنەیە لەسەر واقیع جێبەجێ نابێ.

بەڵام ئەوەی ئەم کتێبانە بخوێنێتەوە، هێمایە نهێنیەکانیان بزانـێ، دەزانـێ ئـەو جیـاوازە لـەوەی گومـانی باشـی بـە وتەیـەك بـردووە کـە شـێخ فڵـان وتویـەتی یـان ڕوونکردنەوەیەك کە لە ژێر فشاری بارودۆخی سیاسی دەرچووە.

ئێمە دەمانـەوێ ڕاسـتی (ڕەگ و ڕیشـەکانی زیادەڕۆچوون) بـزانین، بۆیـە دەبـێ لێرەدا تەواو ڕۆشن و ڕوونبێژ بین، یان بەلایەنی کەمەوە دەبێ فـرە خوێندنـەوە لـە نێوان گەشـبین و ڕەشـبینـدا قبـوڵ بکـەین، دواتـر لـە پـاش توێژینـەوە بڕیـار لەسـەر بەڵگەی فڵان یان فیسار تاقمە بدەین.

## سەرنج لەسەر ئەم ستراتیژیەتە

بۆ سەرنجدان لەسەر ئەم پوختەی ڕابردوو دەڵێم:

بـەڵام کێشـەکە ئەوەیـە سـەرەتاکە هەڵەیـە، مەبەسـتم ئەوەیـە دەسـتپێکی زیادەڕۆچوون بە تۆمەتبارکردنی موسڵمانان بەم تۆمەتە هەڵەیە.

ئەو سەرەتایەی بە تەکفیر کردنی موسڵمانان دەستپێدەکات، ئـەوا خـوای گـەورە سەرکەوتن و فەڕ و بەرەکەتی تێ ناخات.

مەگـەر سـەرکەوتنی کـاتی و قۆنـاغی، کـە زۆری پێناچـێ مامۆسـتایانی دوێنـی شکست دەخۆن و بۆ سەردەمی پێشوو دەگەڕێنەوە.

ئه‌مه‌ش به‌یه‌کدانانه‌که به به‌رده‌وامی ده‌هێڵێته‌وه.

ڕێگه‌ی هه‌ره کورت له‌م خولانه‌وه‌یه، ئه‌وه‌یه زیاده‌ڕۆچووانڕازی بن به کۆمه‌ڵگه‌یه‌ك وه‌ك کۆمه‌ڵگه‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر (درود و سڵاوی خوای لێبێ)، ده‌بێ ڕازی بن به‌وه‌ی کۆمه‌ڵگه‌که‌مان باشتر نابێ له کۆمه‌ڵگه‌ی پێغه‌مبه‌ر، خوای گه‌وره ویستی وابووه تێکه‌ڵیه‌ك له کۆمه‌ڵگه‌ی پێغه‌مبه‌ردا بێ، هه‌ر له که‌سی به‌دری تا عه‌ره‌بی ده‌شته‌کی و تا ده‌گاته که‌سی دووڕوو، ته‌نانه‌ت تا جوله‌که و نه‌سرانی (بڕوانه: په‌یماننامه‌ی مه‌دینه).

خوای باڵاده‌ست به پێغه‌مبه‌ری فه‌رمووه: ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ ﴾البقرة. واته: ( ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر "درود و سڵاوی خوای لێبێ" هیدایه‌ت و ڕێنموویی و موسوڵمانکردنی ئه‌و خه‌ڵکه له‌سه‌ر تۆ نییه).

ئایا زیاده‌ڕۆچووان ده‌یانه‌وێ خه‌ڵك به زۆره‌ملێ بکه‌نه باوه‌ڕدار؟!

له کۆمه‌ڵگه سعودیه‌که‌ماندا، ده‌بێ زیاده‌ڕۆچووان ناخی خۆیان ڕابێنن له‌سه‌ر هه‌رمان و هه‌ربوونی فره قه‌ده‌ری و چاره‌نووسی،مافه‌کانیش ده‌بێ به‌یه‌کسانی بۆ هه‌مووان – هه‌موو موسڵمانان – هه‌بن.

له ماڵ و سامان و هاوسه‌رگیری و به موسڵمانان دانانی هه‌مووان.

مه‌گه‌ر که‌سێك ڕازی بێ به‌وه‌ی به نا موسڵمان ناوببرێ، لێره‌دا چه‌ند حوکم و یاسایه‌کی تایبه‌ت هه‌ن خوێن و ماڵی ده‌پارێزن، له‌گه‌ڵ کورت هه‌ڵهێنان له ڕوونکردنه‌وه‌ی به‌ڵگه و بیستنی به‌ڵگه‌که‌دا.

سه‌ره‌تای زیاده‌ڕۆچووان مه‌ترسیداره، هیچ په‌یوه‌ندیه‌کی به ئاینه‌وه نییه.

**هه‌ڵه‌ی سه‌ره‌تا**

ئه‌و سه‌ره‌تایه‌ی به ته‌کفیر کردنی موسڵمانانه‌وه ده‌ست پێده‌کرێ، به موسڵمانبوونی بێ باوه‌ڕ و کافره‌کان کۆتایی نایه‌ت، جیاوازیش له نێوان ده‌ستپێکی

پێغەمبەر و دەستپێکی زیادەڕۆچووان، ئەوەیە پێغەمبەر دەستی کرد بە دانانی ئەوەی بنچینە لە هاوەڵانیدا ئیسلام و موسڵمانێتییە.

هەر بۆیە سوربوونی پێغەمبەر لەسەر چەسپاندنی ئیسلامێتی موسڵمانان. ڕەتدانەوەی ئەوەی دەڵێ فلان دووڕووە و فیسارە بۆ خۆپاراستن شایەتمانی هێناوە. ئەم سوربوونە هاوتا بوو لەگەڵ سوربوونی زیادەڕۆچووان لەسەر چەسپاندنی هاوبەشدانان و بیدعەچێتی موسڵمانان و ڕەتدانەوەی ئەو کەسانەی دەیانوت: ئەوان نوێژ دەکەن و شایەتمان دەهێنن و ڕۆژو دەگرن... تاد.

پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) بەخۆی بەرپەرچی تۆمەتی تۆمەتبار کراوەکانی دەدایەوە.

زیادەڕۆچووان بەخۆیان ئەرکی ڕەتدانەوەی موسڵمانێتی موسڵمانان لە ئەستۆ دەگرن.

لێرەوە ناکرێ زیادەڕۆچووانمان سەرکەوتوو بن، تا ڕازی نەبن بە پابەندبوون بە پەیڕەو و ڕێبازی پێغەمبەرەوە، لە حوکم و بڕیاردان لەسەر خەڵك و کردەوە و بیروباوەڕیان.

## زۆری کتێبەکان مانای فرە هزری ناگەیەنێ

بیروباوەڕی (٥٠٠ بەرگەکە) هەمووی دەخولێتەوە بەدەوری چەسپاندنی هاوبەشدانانی موسڵمانان یان گومڕابوونیان یاخود پێویستی ڕق لێبوونەوەیان و کۆچ کردن و دوورکەوتنەوە لێیان و تۆبە لێوەرگرتنیان و کوشتنیان ئەگەر کرا.

نزیکەی نیوەی فیقهی (٥٠٠ بەرگەکە) بەدەوری حەرامی ئەو شتانەدا دەخولێتەوە، کە ڕاجیاییان لەسەرە، هەر لە وێنەگرتن و گۆرانی و مۆسیقا و پەیکەر و بازرگانی بانکەکان و سیستەم و یاساکان (کە زۆربەیان دەچنە ناو بازنەی بەرژەوەندییە ڕەهاکانەوە)... تاد.

نیوەکەی تر فیقهی (٥٠٠ بەرگەکە)لە کتێبەکانی تردا هەن، لەوانەیە پێشتر لە کتێبەکانی موسڵماناندا نووسرابێ، لە شێوازی نوێژ و حەج و مەرجەکانی ڕۆژوو و زەکات و یاسا و حوکمەکانی هاوسەرگیری و تەڵاق.

ئەمەیان هەمووی چیرۆکێکە.

## زیادەڕۆچوون چییە؟

لەبەر ئەوەی زیادەڕۆچوون دووبارە دەبێتەوە، ئەوا واباشە لێرەدا پێناسە بکرێ، ئەگەر بەگشتیش بێ. پێناسەی لیژنەی هەمیشەیی فەتوادان وەردەگرین، کە لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا هاتووە: ئەو ئەندازەیە چییە کە ئەگەر مرۆڤ تێیپەڕێنێ لە ئایندا، بە زیادەڕۆچوون دادەنرێ؟ پێناسەی زیادەڕۆچوون چییە؟

وەڵام:

((ئەو ئەندازەیەی ئەگەر مرۆڤ تێی بپەڕێنێ لە ئایندا بە زیادەڕۆچوون دادەنرێ، ئەو بریتییە لە زیاد قوڵبوونەوە لەوەی شەرع دایناوە، زیادەڕۆچوون: قوڵبوونەوەیە لە شتێکدا و بە زۆر گونجاندیەتی، پێغەمبەر "درود و سڵاوی خوای لێبێ" ڕێگری کردووە لە زیادەڕۆچوون لە ئایندا، ئەوەی گەلانی پێش ئێوەی تیابردووە، زیادەڕۆچوونیان بووە لە ئایندا...))[1]، ئەوەندە مەبەستە.

دەڵێم:

ئەگەر موسڵمانێت بینی وتی موسڵمانم، پێویست ناکات بە زۆرەملێ پشکنین بکرێ بۆ دڵ و نیازەکەی و حوکمی ئیسلام لەبارەیەوە، ئەگەر سەرپێچیەکت لێ بینی، ئەوا بە هەڵە دایبنێ نەوەك کوفر و هاوبەشدانان.

---

(١)فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث والإفتاء (١/ ٣٨٢)، جمع أحمد بن عبدالرزاق الدويش، طبع دار المؤيد.

دان بەمەدا دەنێن لە ڕووی تیۆریەوە، سەبارەت بە جێبەجێکردن ئەوا ڕۆچوون و بە زۆر گونجان هەمووی لای ئەوانە.

خـوای مـەزن هـەمووان سـەرکەوتوو بکـات بـەرەو میـانڕەوی و هاوسـەنگی. دوورکەوتنەوە و فەرامۆشکردنی زیادەڕەوی و ڕۆچوون.

# چەند نموونە و وردەکاریەکی توێژینەوەکە
# لە فەتوا و ڕا و بۆچوونەکان

## سەرەتا

تەکفیر کردنی زۆربەی موسڵمانان بە دیارترین و مەترسیدارترین تێبینی دەمێنێتەوە لەسەر هزری ناوخۆیی، مادده و کەرەستەی تەکفیر یەك شتە، ئەوەی موسڵمانێکی بێ تاوان کافر بکات – لەوانەیە موسڵمان لە بۆچوونێك یان کردەوەیەکدا هەڵە بکات – ئەوا بۆی ئاسانە تەکفیری ئەو کەسەش بکات کە ستەمی کردووە یان پڕوپاگەندەی ستەم و گەندەڵی لەبارەوە کراوە، بەتایبەت کە ڕەوشتی فەتوا ئەوەیە جیاوازی ناکات لە نێوان کەسێك و کەسێکی ترەوە لەسەر بنچینەی شوێن و پێگە یان دەسەڵات یاخود پلەو پایە. هەڵەی حوکمە عەرەبی و ئیسلامییەکان – بە دڵنیاییەوە بە دەوڵەتی خۆشمانەوە – لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە ئاگاداری تەکفیر و کەرەستە و ڕەگ و ڕیشە و سەرچاوەکەی نین، گومانیان وایە مادەم ئەم فەتوایانە موسڵمانان بە مەزهەبی خۆیان دادەنێن ئەوا هیچ زیانێکی نییە.

نا وانییە... ئەمە ئەو شتەیە زیادەڕۆچووان دەیانەوێ بیگەیەنن بە دەسەڵاتدار و حکومەتەکان.

بەڵام ڕاستییەکان – لە هزر و واقیعدا – ئەم پڕوپاگەندەیە بەدرۆ دەخەنەوە، گشتگیری هزری تەکفیر بۆ هەمووان لە کەسی سادە و زانا و دەسەڵاتداران وا دەکات سەنگی هەبێ و جۆش و خرۆش بە توێژەر دەدات بۆ تاوتوێ کردنی، چونکە ئەگەر تەکفیر کورت هەڵهات لە کەسی سادە و لاوازدا و کەسی پلەو پایەداری فەرامۆشکرد، ئەمە مانای وایە دابەزیوەتە پلەی هەرە ژێرەوە، شایەنی توێژینەوە نییە.

## کاریگەری تەکفیر لەسەر ناوبانگی شانشینەکە

ئەمە شتێکی ڕاستە، بادانەوە نییە بۆ پشتگرتن لە بیرۆکەی نوێسازی، بەڵام ئەمە واقیعەکەیە، ڕاوێژکاریش باوەڕ پێکراوە.

ئەم پرسە (تەکفیر) بە کورتی و پوختی و ڕەگو ڕیشەکانی لەلای ئێمە هەڵقوڵاون، پەیوەندی بە هەموو موسڵمانەوە هەیە، دەیانوروژێنێ، وا دەکات بە چاوێکی سوك سەیری شانشینەکە و ڕۆڵەکەی لە جیهانی ئیسلامدا بکەن، ئەمە ئەو تەکفیرەیە کە گشتێنراوە بەسەر زۆربەی موسڵمانانندا: شیعە و سۆفی و جەهمییەکان (ئەم نازناوە بۆ ئەهلی سوننە بەکاردەهێنن لە شوێنکەوتووانی مەزهەبی ئەشعەری) جگە لەوانیش. دەبێ حکومەت ڕۆڵی یەکلاکەرەوە لەم بابەتەدا بگێڕێ، یان دەبێ بڵێ ئەو لەگەڵ ئەم فەتوا و کتێبانەدایە، یاخود نابێ مۆڵەت بەوانە بدات، دەوڵەت بەکاربهێنن بۆ خزمەتی مەزهەب و ئەو هەڵانەی تێیدایە لەبارەی ئیسلام و موسڵمانان.

بەڵێ – لە ڕووی ڕەوشتی و زانستیەوە – دەبێ ئەم تێبینیە بە زیندوویی بمێنێتەوە، چونکە ئەوەی ئەم ڕۆژانە دەیبینین لە حەڵاڵ کردنی خوێنی موسڵمانان لە عێراق و پاکستان و جەزائیر و جگە لەو وڵاتانەش، چەندین هۆکاری هزری هەیە، فەتوایە تەکفیریەکان کە لە کۆمەڵگەکەماندا دەردەچن لە بەرپرسیارێتیمان ناخەن، ئەگەر بڵێن ڕەنگدانەوەی دیدی کۆمەڵگە و دەوڵەتەکەمان نییە بۆ ئەوانی تر، ئەگەر هەندێك فەتوا لە ئەزهەرەوە دەربچن سەبارەت بە تەکفیرکردنی ئێمەی سعودی، ئەوا حوکمەتی میسر بەشێك لە بەرپرسیارێتی هەڵدەگرێ.

لەبەر ئەوەی لەسەر کۆمەڵگە و دەوڵەت پێویستە؛ چاودێری ئەم زیادەڕۆچوونە هزرییە بکات و گفتوگۆ لەگەڵ ئەم موفتی و زانستخوازانە بکات، کە خاوەنی ئەم هزرەن، لێرەدا ناڵێم ئەو موفتیانە ناچار بکرێن بە دانی فەتوایەك، کە بڕوایان پێی نییە؛ بەڵام ئەم فەتوایە توونـد و تیژانە لە دژی موسڵمانان، یان ئەوەتا لە نەزانی و

نەشارەزایی بەوانی تر سەرچاوەی گرتووە، یاخود لە بێ ئاگابوون لەو بەلگانەی موسڵمانێتی ئەو دەچەسپێنێ هاتووە.

ئەگەر هۆکارەکە، نەشارەزایی بێ بەوانی تر؛ ئەوا پێویستە لەسەرمان، وێنەی تەواو بۆ موفتی و زانایان بگوازینەوە، تەنانەت ئەگەر ئەم کارە، وابخوازێ موفتییەکان ببرێنە گەشتی دۆزینەوە و گفتوگۆ ئامێز لەگەڵ موسڵمانانی تر، لە میسڕ و شام و عێراق و مەغریب و عومان و یەمەن و ئێران و پاکستان و تورکیا... تاد.

ئەگەر هۆکارەکە، لاوازی بەلگە هێنانەوە و دابەزاندنی بەلگەی تایبەت بە هاوبەشدانەران بێ لەسەر موسڵمانان، ئەو کاتە پێویستە جیاوازییەکانی نێوان موسڵمانان و بێ باوەڕان ڕوون بکرێتەوە، جەخت لەسەر ئەمە بکرێتەوە بۆیان، ئەگەر ئەم کارە پێویستی بە پشت بەستن بێ بە چەند زانایەك لە جیهانی ئیسلامی و هێنانیان بۆ گفتوگۆ لەگەڵ زانایانمان، هاوشێوەی ئەوەی لە (پەیماننامەی مەککەی پیرۆزدا) ڕوویدا، کە تیایدا دانرا بە موسڵمانێتی و شەرعیبوونی هەشت مەزهەبە ئیسلامییەکە، تیایدا پولێك لە زانایانی ڕیزی دووەمی شانشینەکە تیایدا بەشداربوون.

کەواتە دەوڵەت و کۆمەڵگە، دەتوانن شتی زۆر و کاریگەر بکەن، بەڵام بێ دەنگ بوون لە ئاست ئەم قەبارە و جۆرە لە تەکفیر کردنی موسڵمانان و بەسوك سەیرکردنیان – سەرباری دەرکەوتن و ڕۆشنی و بڵاوبوونەوەی – شتێکی دوودڵ کەرە، تەنها گفتوگۆی نیشتمانی بەس نییە بۆ ئەمە، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ لاواز دەبێ، فەتوایەکیش بەس نییە کە بە فشاری باروودۆخ دەرکراوە، بەڵکو پێویستی بەکاری بەردەوام و سەخت و دوور و درێژ و کاریگەر هەیە، ئەمە سەرەتا هەمووی بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگەکەمانە، ئینجا بۆ کۆمەڵگە موسڵمانەکان.

ئامانج خستنەڕووی ئەم شتانە نییە، بەوەی حوکم لەسەر هەندێك لە موسڵمانان بدرێ، بەوەی ڕاستیان پێکاوە، هەندێکی تریش هەڵەیان پێکاوە، بەڵکو ئامانجی چەسپاندنی موسڵمانێتی هەمووانە، هەروەها سەلماندنی ئەوەی خوێن و ماڵیان پارێزراوە، یەکسانن لە ماف و ئەرکەکاندا.

کێشەی زانا و موفتی و زانستخوازە شەرعییەکانمان، ئەوەیە پێیان وایە ئەوەی لەگەڵیان ڕاجیاوازە مافی موسڵمانێتی و هاوڵاتی بوون و خوێن و ماڵ پارێزراوی نییە، ئەمە کرۆکی کێشەکەیە، پێشەکیەکە بۆ پرسی بەبیدعەچی دانان و تەکفیر کردن.

بەو مانایەی: ئەگەر (سەلەفییەکی زیادەڕۆچوو) باوەڕی هێنا بەوەی خوێن و ماڵی من پارێزراوە، ئەوا تۆمەتبارکردنی ئەو بۆ من بە کوفر یان بێ دینی یاخود بیدعەچێتی یان عەلمانیەت یاخود نەتەوە پەرستی، دوای ئەوەی باوەڕی بە پارێزراوی خوێنی من هەبووە، ئەوا ئەمە سوکترە، ئەم دۆخە باشتریشە لەوەی باوەڕی بە موسڵمانێتی من هەبێ و خوێن ڕشتنی منیشی پێ دروست بێ!

پرسی خوێن بابەتی سەرەکییە! دواتر تەکفیر دێ، چونکە هۆکاری خوێن ڕشتنە.

ئینجا بە بیدعەچی و بە گومڕا و بە تاوانبار دانان دێ... چونکە زۆربەی زیادەڕۆچووان هاودەنگن لەسەر سزادانی کەسی بێ باوەڕ و گومڕا..

دەبێ کەسی توندڕەو – لە هەر مەزهەبێك بێ – تێبگەیەندرێ، کە خوێنی هاوڵاتی نا جەنگاوەر حەڕامە، تەنانەت ئەگەر بێ بڕواش بێ... ئەوەش کە پێشینانی مەزهەب – جا هەر مەزهەبێك بێ – نووسیویانە، مانای ئەوە ناگەیەنێ شەرعی دابەزێندراوە، بەڵکو بریتین لە وتەی مرۆڤ، کە نە بەهەشت و نە دۆزەخیان بەدەستە.

لەگەڵ گرنگی لەبەرچاوگرتنی ژیاننامەی پێغەمبەر و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دووڕواندا، کە چۆن مافەکانیان پارێزراو بوونە، وەك: هاوەڵانی تریان.

ئەم کارە پێویستی بە ڕۆشنبیری تازە هەیە لەبارەی مەزهەبەوە، ئەگەر شتێکی نوێشنەبێ بۆ پێشنیازی گشتی ئیسلام، بەڵام شاراوە و کپ کراوە، کە خۆ هەڵکێشانی مەزهەبی شاردویەتیەوە.

ئەم بیرۆکانە لە کۆن و نوێدا، بوونیان هەبووە لە پێشنیازی بەشێك لە موسڵماناندا.

دەبێ دەوڵەت و کۆمەڵگەکان، قوڵی قەیرانە هزرییە کەڵەکە بووەکە بزانن بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو، لە دەرەنجامی زاڵبوونی حوکمڕانان و بەکارهێنانی زانایان وەك ئامرازێك بۆ پاکتاوکردنی دژەڕاکان، کە چەندین بنەما و بنچینە دانراون بۆ ڕیشەکێشکردنی دوژمنانی دەوڵەت، بە تێپەڕینی کات ئەم بنەمایانە بوونەتە شەرع و یاسا، نەوەك کۆشش و بۆچونێکی مرۆیی.

## پرسەکە تەنها پەستبوونێکی سیاسی نییە، بەڵکو هەڵەیەکە بەرامبەر بە شەرع

ناتوانین قەناعەت بەوانی تر بکەین، بەوەی دەوڵەت هیچ کاریگەرییەکی نییە لەسەر زانا و دامەزراوە ئاینیەکانی لای خۆمان، هەروەك ناتوانین بڵێین فەتواکانی دەستەی گەورە زانایان دژی تەکفیر و تەقاندنەوە – ئەگەر واشبێ لە چەند فەتوایەکی هەڵاویردراوی خاوەن دۆخی تایبەتدا – تێکگیراون، تیایدا پاشینان ڕایان لەگەڵ پێشینان جیاوازە، هەر چەندە ستایشی کتێب و فەتواکانی پێشینان دەکرێ و وەسیەت دەکرێ بەوەی بخوێندرێنەوە.

مردنی بزافی ڕەخنەیی لە ناو سەلەفییەتدا، یەکێکە لە گەورەترین هۆکارەکانی ئەم مەگەرسات و نەهامەتییە، سەرباری دژایەتی کردنی ڕەخنەی ناوخۆیی.

هـەموو ئـەو هۆکارانـەی دەوتـرێن، وەك: یارمەتیـدانی ئیخـوان و بیرۆکـە و هزرەکانی ئەفغانستان، ئەمانە وردەکاری و پەراوێزن لەسەر دەقی کێشەکە، ئەویش ئەوەیە هزری ناوخۆیی لە ڕەسەنایەتی و کورت و پوختیەکەیدا: هزرێکی تووندڕەوی زیادەڕۆچووە، ئەگەر دەتەوێ بڵێ: تەکفیرییە.

ئەمە کێشەی سەرەکییە، دایکی کێشەکانە، کە بەدەوریدا دەسوڕێینەوە، باسی هۆکارە یارمەتیدەرەکان دەکەین، بێئاماژە کردن بـە کێشە سـەرەکیەکە، هـەر کاتێـك پـەییمان بـە کرۆکـی کێشـەکە بـرد، دانماننـا بـە بنچـینەی کێشـەکە، ئـەوا ئەمـە وردەکارییەکان دەهەژێنێ و لاوازیان دەکات.

درەخت؛ هەر چەندە لق و پۆپەکانی ببڕی، ئەوا هـەر بەزینـدووی دەمێنێتـەوە، ئەوەی لێـی بـڕاوە دەیگێڕێتـەوە، هـەر لقێـك لـە جیـاتی لقێـك، هـەر گەڵایـەکیش لـە جیاتی گەڵایەك دێنێتەوە.

ئەگەر ڕەگ و ڕیشەی لق و پۆپەکانت بڕی، ئـەوا ئەگـەر کـەمێکیش پێـوە بچێ، ئەوا بەخۆیان دەمرن.

لێـرەدا پێویستە، هـیچ کەسـێك وا لـێم تێنـەگات مـن داوای بـڕین و ڕیشەکێش کردنی وەهابیەت دەکەم، نا ئەم داوایە ناکەم.

## کەڵەکەبوونی پەراوێزەکان هەڕەشە لەسەر بنچینە ڕەسەنەکە

خودی وەهابییەت دەڵێت: گوزارشت دەکەم لە ئیسلامی ڕاستەقینە و پاك و پوخت.

باشە، ئایا ئیسلامی پاك و پوخت پێش وەهابییەت بوونی هەبووە یان نا؟

ئەگەر پێش وەهابییەت هەبووبێ؛ ئەوا کێشە نییە ئێمە ئەم فەتوا و ڕا و بۆچوونانە تەکفیریانە فەرامۆش بکەین، دەست بە خودی ئیسلامەوە بگرین؟ ئەمە ئەگەر ڕاستگۆ بین لەوەی ئامانجمان بانگەوازە بۆ ئیسلام، نەوەك بۆ کەسەکان.

ئەگەر نەشبووبێ؛ ئەوا خەسڵەتە سەلەفییەتەکەی نامێنێ، خەسڵەتە مەزهەبییەکەی دەچەسپێ (ئەمە ئەو شتەیە کە شوێنکەوتووانی ئەم سەلەفییەتە ڕەتی دەکەنەوە). شتێکی تێبینی کراوە هەر کاتێك مەزهەبێك لەسەر یەکێکی تر کەڵەکە بوو، ئەوا زیادەڕۆچوون زیاد دەبێ و لێبوردەیی و هاوسەنگی کەم دەبێتەوە.

ئیسلامی لای ئیبن تەیمییە، ئاسان و میهرەبانترە لە ئیسلامی لای وەهابییەت.

ئیسلامی لای چوار پێشەواکە، فراوانتر و میهرەبانترە لە ئیسلامی لای ئیبن تەیمییە.

ئیسلامی لای هاوەڵە مەزنەکان میهرەبانتر و فراوانترە لە ئیسلامی لای چوار پێشەواکە.

ئیسلامی دەق فراوانتر و میهرەبانتر و مرۆڤ دۆستانەترە لە ئیسلامی مێژوو و ئیسلامی پەراوێزەکان.

کەواتە ئێمە دەناڵێنین؛ بە دەست کێشەی کەڵەکەبوونی پەراوێزە شرۆڤەییەکان، کە وەڵامگۆی بارودۆخە سیاسی و مەزهەبی و کۆمەڵایەتییەکانە، گیرمان نەخواردووە و نا ناڵێنین بە دەست ئیسلام وەك پەیام و دەق.

کەسی خۆرئاوایی و خۆرهەڵاتی دەبێ لەمە تێبگەیەندرێ، ئەمە بەهێزترین و کاریگەرترین بانگەوازە بۆ ئیسلام.

کەسی خۆرئاوایی پاساوی هەیە، لە تێکەڵکردنی ئیسلام (ئیسلامی دەق) و (پەراوێزە شرۆڤەیی و ڕاڤەییەکان).

لەبەر ئەوەی خودی موسڵمانان ئیسلام و پەراوێزەکان تێکەڵ دەکەن.

بەڵکو لەوانەیە لە لایەنی کرداریدا، زیاتر شوێن پەراوێز و کەڵەکەبووەکان بکەون.

کار لەسەر پەراوێزەکانە.. ئەم هەموو کتێب و کاسێت و وتار و بانگەوازە پان و پۆڕانە هەر لەم پێناوەن.

نموونەیەك وەربگرە، ئەم نموونەیەش لە ئیسلامی دەق:

خـوای پایەبـەرز فەرموویـەتی:﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾ البقـرة: ٦٢. واتـە : ( بێگومـان ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە" لەئوممـەتی محەممـەد (درود و سڵاوی خـوای لـێبێ)" ، ئەوانـەش بوونەتـە جوولەکـە، گاورەکـانیش ، سابئەش ، ئەوانـە هەردەسـتەیەکیان بـاوەڕی دامـەزراوی هێنابێت بـەخواو ڕۆژی دوایـی و کـارو کـردەوەی چـاکەی ئەنجامـدابێت ، جـا ئەوانـە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە ، نەترس و بیمیان دەبێت ، نە غەم و پەژارەش ڕوویان تێ دەکات).

جارێکی تر دەقەکە بخوێنەوە و لێی ورد ببەوە!

ئایا ئەم دەقە ڕوونە؟ یان مەبەستی ڕوون نییە؟ ئایا ئەمە لە کوێی یاد و هۆشی مەزهەبی و بەرتەنگی تاقمگەریی جێی دەبێتەوە؟!

ئەم دەقە بەڵێنی بەهەشت بـە هـەر کەسێك دەدات، بـاوەڕی بـەخوا و بـە ڕۆژی دوایی هەبێت، بە مەرجی ئەنجامدانی کار و کردەوەی چاك، جا موسڵمان بێ یـان لـە ئاینەکانی تر بێ.

من دەزانم هەندێك کەس دەترسێن لەوەی دان بەم ڕاڤەیەدا بنێن، بەهۆی زۆر و بۆری فشاری فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی دژی (واتای ئەم ئایەتە).

موسڵمانی پەڕاوێزگەرا دەڵێت: لێرەدا چەند دەقێکی تر دژی ئەم دەقە؟

دەڵێین: باشە، ئایا دەتەوێ بڕیاری تێکگیران لەسەر دەقەکانی قورئان بدەیت، یان دەتەوێ بڵێی هەندێك لە خاوەن ئاینەکان لەوانەیە کوفر بکەن؟

ئەگەر وتی: مەبەست تێکگیرانی ئایەتەکانی قورئان نییە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە پێویستە کۆی ئایەتەکانی قورئانی بەیەکەوە وەربگیرێ.

دەڵێین: هەر چەندە دەقە قورئانیەکان بەیەکەوە کۆبکەیتەوە، ئەوا ئەم دەقە بە ڕاشکاوی بەلایەنی کەم گریمانەیەك بەدەستەوە دەدات سەبارەت بە ڕزگاربوونی ئەو کەسەی کاری چاك دەکات لە هەڵگرانی ئاینەکانی تر. وتم (گریمانە)، ئەمەش وەك دابەزین لە بۆچوونی خود، ئەگەرنا دەقەکە ڕاشکاوە؛ لەکاتێکدا ئێوە گریمانەی ڕزگاربوونی ئەو موسڵمانانە ناکەن، کە سوژدە و ڕکوع دەبەن. (سەرقاڵبوونی کەسی زیادەڕۆچوو، بەم گۆڕەپانە فراوانە لە ئیسلامی دەقدا، بێ ئاگای دەکات لە سەرقاڵ بوون بە بەرتەنگی مەزهەبگەرایی).

گرنگتر لەوەش ئەوەی دەقەکە بخوێنێتەوە، وا هەست دەکات یەکەم جارە دەیخوێنێتەوە...!! ئەمەش ئاماژە و بەڵگەیە لەسەر واز هێنانمان لە دەق و سەرقاڵبوونمان بە پەڕاوێزی کەڵەکەبووی ڕاڤەیی، کە مرۆڤ دایناوە، وەك وەڵامگۆی دۆخ و کاریگەربوون بە دەوروبەری سیاسی و مەزهەبی و ئاینی.

ئەمە تەنها یەك نموونە بوو، لێرەدا خستمەڕوو، بۆ ئەوەی نەوترێ ئەم وتەیەم تەنها تیۆری و بیردۆزدانانە و چیتر.

توانا و گونجاوی هەیە بۆ ڕاستگۆ بوون لە نوێسازیدا، بە گەڕانەوە بۆ ئیسلامی پاك و ساف، کە مەزهەبە ململانێکەرەکان خۆی پێ هەڵدەکێشن، توانا هەیە بە مەرجی فەرامۆشکردنی کتێبە مەزهەبییەکان، ئەگەر بۆ یەك کاتژمێریش بێ، لە

هەر ڕۆژێکدا، بۆ ئەوەی لەم کاتژمێرەدا لە قورئان بکۆڵنەوە بە وردی، نەوەك تەنها خوێندنەوە بەمەبەستی فەڕ و بەرەکەت؛ ئەگەر وایانکرد، ئەوا لەوانەیە قورئانی پیرۆز جێگایەکی هەبێ لە نێو کتێبە مەزهەبییەکان و فەتوا ژینگەییەکاندا.

دەبێ کتێبی خوا – کە پاکترین ئیسلامی دەقە – هەلێکی ڕاستەقینەیە بۆ برەخسێنرێ، نەوەك فرسەتی بۆ برەخسێندرێ تەنها بۆ فەڕ و بەرەکەت و خوێندنەوەی بێ ڕامان و هەڵوێستەکردن لەلای هەر ئایەتێکی پیرۆز.

خوای پاك و بەرز فەرمانی بە ڕامان و وردبوونەوە کردووە، ئەوانەی مەزهەبگەران ئەگەر ڕامانیان کردبا بۆ هەڵوەستەکردن لە هەمبەر ئایەتی پێشوو، ئەوا کتێب و شتی مشتومڕ هەڵگریان لەبارەی ئایەتەکە دەنووسی، کە خودی ئەم شتانە دەبویە سەرچاوەی فەلسەفە و کێشمەکێشی نێوان موسڵمانان.

ئەی چی دەبێ ئەگەر چەندین ئایەتی تر زیاد بکەین:

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ..(٢٨٦) ﴾البقرة. واتە : ( ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك مەگەر بە قەدەر توانایی خۆیی نەبێت).

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا (٤٠) ﴾النساء . واتە: ( بەڕاستی خوا بەقەدەر تۆزقاڵێك ستەم " لە ئادەمیزاد " ناکات ، خۆ ئەگەر چاکەیەك هەبێت" بەرەکەتی بەسەردا دەڕێژێت و " چەند بەرابەری دەکات و لەلایەن خۆیەوە پاداشتی گەورەو بێ سنوور دەبەخشێت" بەچاکە خوازان" ).

﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ....(١٢٣) ﴾ النساء . واتە: ( " پاداشت و ڕێزو نرخ " نە بە ئارەزووی ئێوەیە ،نە بە ئارەزووی خاوەنانی کتێبە ، ئەوەی خراپەو گوناهێك بکات ، ئەوە بەهۆیەوە سزادەدرێت ، هیچ

کەس و هیچ هێزێکی تری دەستناکەوێت ، جگە لە خوا پشتگیریی بکات و یارمەتی بدات ) .

﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾ ﴾الزلزلة . واتە : ( جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجامدابێت دەیبینێتەو. ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت ،دەیبینێتەوە ).

جگە لەمانەش زۆر ئایەتی نیگابەخشی تر بە ناخ و دەروون و فەلسەفە و ڕامان و وردبوونەوە و ئاسۆ فراوانی و ڕێکخەری شڵەژان و ڕەحمەت و مرۆڤایەتی... تاد.

بەڵام هاوەڵانی پەڕاوێز و دژەڕاکان، هیچ هەل و فرسەتێکیان بەجێنەهێشتووە بۆ ڕامان لە کتێبی خوادا بۆ ئەوانەی لە دوای خۆیان دێن، بەڵکو خێرا پەلەیان کردووە لە هۆشداریدان لە بارەی ڕاڤەکردن بە ڕا و بۆچوون، لەگەڵ ئەوەی ڕۆژانی هەندێك ئایەت پێویستیان بە ڕا و بۆچوون و شوێنەوار نییە.

دواتر سوننەت و شوێنەوارە تێکەڵبووەکان بە هەڵبەستن و باروردۆخیان مەزن کردووە.

لە ناویشیاندا ئەم شتانەیان گەورە کردووە، کە پێچەوانەی دەقەکانی قورئانە، بەمەش ئەم شوێنەوارانە ڕۆیشتوونەتە ناو ڕاڤەکانی قورئان و تێکیانداون، وایلێهاتووە قورئان شوێنی شوێنەوارەکان کەوتووە، نەوەك بە پێچەوانەوە.

تەنانەت وایلێهاتووە؛ دروستە ئایەتێکی پیرۆز بە فەرموودەیەکی لاواز یان وتەیەکی قەتادە یاخود ڕاڤەیەکی موجاهید هەڵبوەشێتەوە.

ئا بەم شێوەیە ئیسلام وەك چێشت لێنانێکی بەپەلە لێهاتووە، هەر بە نەکوڵاوی پێشکەشی خاوەن ماڵ و میوانەکان کراوە، خاوەن ماڵەکە بە ناخۆشییەوە دەیخوارد،

میوانـەکانیش شـەرمیان کـرد بگەڕێنـەوە، بۆیـە دوای کـەمێك خـواردن بانگەشـەی ئەوەیان کرد تێربوونە.

پێگەیشتن و کوڵانی ئیسلام بە ڕامان دەبێ لە دەقی یەکەم (کتێبی خوا و ئەوەی لـە پێغەمبـەری خـواوە هـاتووە بـە ڕاسـت و دروسـتی و بـەپێوەری توونـد)، لەگـەڵ سەرنجدانی هێڵە گشـتییەکانی ئیسلام و باڵادەست نـەبوونی وردەکارییـە بچوکەکان لەسەر بنچینە گشتی و هێڵە سەرەکییەکان.

ئا ئەمڕۆ ئێمە باجی ئـەم کەڵەکەبوونـەی پـەڕاوێزەکان دەدەیـن، کـە هانـدەرە و دوژمنکاری دروست دەکات، ڕێگرە لە ڕێنوێنی قورئان و بانگەواز و میهرەبانی و مرۆڤ دۆستیەکەی.

سەبارەت بە دەقی سوننەتی پێغەمبەر، ئەوا جیاواز نییە لەگەڵ دەقی قورئانی، لە میهرەبانی و ڕێنوێنی و مرۆڤ دۆستی و پاراستنی مافەکاندا، بەڵام ئەوەندە هەیـە دەقی سوننەت خوای مەزن ئەرکی پاراستنی هەڵنەگرتووە، بۆیە بوارێکە بۆ تێخستن و خـەیاڵ و هەڵبەسـتن لەلایـەن ئەوانـەی پۆشـاکی پیاوچـاکانیان پۆشـیوە، درۆزنـی پوچەڵکەرەوەن. دەبێ هەر فەرموودەیەك بخرێتە بەردەم ڕێنوێنی قورئـانی پیرۆز و لەگەڵیدا بەراورد بکرێ، هەر فەرموودەیەکیش دووربخرێتەوە، کە کۆك نەبێ لەگـەڵ گیـانی گشـتی ڕێنـوێنی قورئـان، تەنانـەت ئەگـەر زنجـیرەی هاتنەکەشـی ڕاسـت بـێ. زنجیرەی فەرموودە مانای ڕاست و دروستیەکەی ناگەیەنێ، بەڵکو بەشێکە لە ڕاست و دروستیەکەی، تەنانەت دەقی فـەرموودە ئەگـەر زنجیرەکـەی ڕاسـت و دروسـتیش بـێ، ئـەوا پێـوەر و مـەرجی خـۆی هـەن بەهـەمان شـێوە. هەنـدێك لـە فەرموودەناسـان تیۆرێکی باشیان لەم بارەوە نووسیوە، وەك: خەتیبی بەغدادی لە کتـێبی (الکفایـة) و ئـیبن جـەوزی لـە پێشـەکی کتـێبی (الموضـوعات)، بـەڵام تیۆرەکـە هـەر بـە تیـۆر دەمێنێتەوە، دانا بەزێنرێنە سەر زەمینەی واقیع.

## بەهەمان شێوە زیانی ناوخۆییش

زیادەڕۆچوونی ناوخۆیی (گرنگ نییە چ ناوێکی لێ دەنێی وەهابی یان سەلەفی)، زیانەکەی تەنها لەسەر دەرەوە کورت نابێتەوە، یان تەنها لەسەر ناوبانگی شانشینەکە، بەڵکو بەسەر ناوخۆشدا دەشکێتەوە، ئەو هاونیشتمانیانە کافر دەکات، کە خوێندنەوەی جیاوازیان هەیە بۆ ئیسلام، لە شیعە و سۆفی و لیبراڵییەکان، هەموو ئەوانەی ناویان هێنرا موسڵمانن، خاوەنی خوێندنەوەی ترن بۆ ئایین، تەواو وەك چۆن وەهابییەکان خوێندنەوەی تایبەتی خۆیان هەیە. ترسەکە لەوەدایە لەگەڵ دواکەوتنی چارەسەر و تێپەڕینی کات، ئەوا ئەوانە (کە ڕاجیان لەگەڵ وەهابییەت) دەبنە ئامانج بۆ کوشتن، مادەم تەکفیرکردنیان بەڵگەدارە لە کتێبە کۆنەکاندا، بێ ئەوەی ڕەخنە یان نوێسازی یاخود گفتوگۆ یان ڕاستکردنەوە لە ڕێگەی پەیڕەو یان وتار یان ئامۆژگارییەکان ...هتد، بۆ ئەم کتێبانە ئەنجام درابێ.

## هێمایە نهێنییەکان

ئەوە مەترسییە لە فەتوا تەکفیرییەکاندا هەیە، ئەوەیە لە زۆربەیاندا (هێمای نهێنی) هەیە، کە تەنها پەیڕەوانی مەزهەبەکە لێی تێدەگەن، بەرپرسان و نووسەران لەگەڵ فەتوای هاوسەنگ و لاستیکی ژیان دەگوزەرێنن، وا گومان دەبن ڕەوتی ناوخۆیی ڕۆڵی خۆی بەتەواوی گێڕاوە و نکۆڵی کردووە لە تەکفیر کردنی موسڵمانان و تەقاندنەوەیان بە پشتێنی تەقێنەر و بەرپرسیارێتیەکەی تەواو بووە. بەڵام درك بەوە ناکەن، ئەو موفتیانەی فەتوایان داوە بە حەڕامی ڕشتنی خوێنی موسڵمان، کەسی دژەڕای خۆیان بە موسڵمان دانانێن!! ئەگەر بە موسڵمانیشی دابنێن، ئەوا چەندین فەتوایان هەیە دەربارەی کوشتنی ئەو موسڵمانانە وەك تەمبێکردن، ئەم فەتوایانە لە باوەڕپێکراوترین سەرچاوەکانی هزری ناخۆیدا هاتووە، لە فەتواکانی زانایاندا، لەوانەیە هەندێك لەو زانایانە لە ناو ئەو کۆمەڵەیە زانایانە دابن، کە

بەرپەرچی تەکفیرکاران دەدەنەوە، ئەو بەرپرس و بیرمەندانەی کە پەیوەندیان بە هزرەکەوە نییە، ئاگاداری ئەوە نین، کە یەك کۆت و بەند لەوانە وا لەم زانایانە بکات دەستیان کراوە بێ لەم کارەدا، بەمەش پێی وایە فەتوای ئەم زانایانە تێك نەگیراون، ئەو کاتە هەموو فەتواکانیان دەڕژێنە خزمەتی تەکفیرەوە، ئەگەر هاتووە هەڵواردن بکەین بۆ پاساو هێنانەوە بۆیان بە هۆی فشاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و هێرشی تەکفیرکاران بۆ سەر زانایان، بەوەی ئەوان ئاینی خۆیان فرۆشتۆتە دەسەڵات، لێرەوە تەکفیر زیاتر بەهێز و چەسپاوتر دەبێ لە زەویدا.

## تێکگیرانی قوتابخانەکە

قوتابخانەی وەهابیەت؛ زۆر هێرشی کردۆتە سەر دوو کۆمەڵە، ئەوانیش سۆفی و شیعەکانن، بە پاساوی زیادەڕۆچوون لە پێشەواکان و زاناکانیاندا، ئەم کەسە شیعەیە زۆر شت لەبارەی پلەوپایەی پێشەواکەی دەگێڕێتەوە، فلان سۆفییەش دەڵێ شێخەکەی لەسەر ئاو دەڕوات، لە هەواشدا دەفڕێ ... تاد.

لەوانەیە وەهابییەتیش لە ڕەخنەگرتن لەم شتانەدا بیگەیەنێتە تەکفیر، لەوانەیە ڕاستی لەگەڵ وەهابیەتدا بێ لە ڕەخنەگرتن لەم شتانە، بەڵام نەك لە تەکفیرکردندا.

بەڵام کێشە لێرەدا نییە، بەڵکو کێشە لەوەدایە، قوتابخانەی وەهابییەت ڕاست ناکات لە ڕەخنەگرتن لەمانە.

چۆن؟

لەبەر ئەوەی کاتێك قوتابخانەی وەهابییەت، زیادەڕۆچوونی سەلەفییەت لە زاناکانیدا دەبینێ، پاساوی بۆ دێنێتەوە، هەروەك چۆن شیعە و سۆفییەکان پاساو بۆ کارەکانیان دێننەوە.

ئایا نموونەیەکتان دەوێ؟! زۆر نموونە دەبینین بە تێروتەسەلی لە ژیاننامەی زانایاندا، کە ئەم قوتابخانەیە پێیان هەڵدا دەدات. بۆ نموونە ئەگەر ژیاننامەی ئیبن تەیمییە ببینن لە کتێبی (الجامع في سيرة ابن تيمية)[1]، زۆربەی ئەو شتانە لەم کتێبەدا دەبینن، کە زیادەڕۆچووە سۆفییەکان لەبارەی پێشەواکانیان دەیڵێن بێ نکۆڵی لێکردن...!، ئەگەر ژیاننامەی پێشەوا ئەحمەد وەربگرین لە کتێبی ئیبن جەوزیدا (مناقب الإمام أحمد)، ئەوا شتی وای تێدا دەبینن کە لەلای کەسی سۆفی یان شیعە بوونی نییە؛ کتێبەکە لە بازارەکاندا لەبەردەستە، هەمووانیش ستایشی دەکەن. بگەڕێنەوە بۆ ژیاننامەکانی شێخ محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب و ئەوەی تێیدا وتراوە، زۆر شتی وای تێدا دەبینن کە پێشەواکانی قوتابخانەی وەهابیەت لەسەر هەمان شت نکۆڵی لەوانی تر دەکەن، لە بابەتی (زیادەڕۆچوون لە پیاوچاکاندا)، ئەم کارە پێویستی بە بەخۆداچوونەوە و خۆپاراستن لە تەکفیر هەیە.

لەوانەیە بوترێ: ژیاننامە هەردەم ئەم ئاڕاستەیە وەردەگرێ، جا دەڵێین:

فەتوایەکی بەکۆمەڵتان پێدەدەین، لەلایەن لیژنەی هەمیشەیی فەتوادان بە سەرۆکایەتی شێخ ئیبن باز، بە ئەندامێتی هەر یەك لە عەبدولڕەزاق عەفیفی و عەبدوڵای کوڕی قعود و عەبدوڵای کوڕی غەیدان! ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ.

## پرسیارەکە ئەوەیە:

ئەم پرسیارە ئاڕاستەی لیژنەکە کراوە، تیایدا خوێنەر ئەو شتەی بەلایەوە نامۆیە کە لە پێشەکیەکەی (المغني) ئیبن قودامەی حەنبەلیدا خوێندویەتیەوە (واتە لە خودی ژیاننامەی ئیبن قودامەدا)، چونکە لە ژیاننامەی ناوبراودا هاتووە، کە خاوەنی کەرامەت بووە، یەکێکیش لە کەرامەتەکانیشی بریتی بووە لەوەی: ((شتێکی

(١) عەلی عیمران کۆی کردۆتەوە، بەکری باوکی زەید ستایشی کردووە، لە بەرگێکی مەزنی (٧٠٠ لاپەڕە) پێکهاتووە.

کــردووە، کــە هاوەڵــە مەزنــەکان نــەیانکردووە، ئــەویش ئەوەیــە کــە لەســەر ئــاو ڕۆیشتووە)).

دواتر پرسیارکەرەکە پرسیاری کردووە: چۆن مۆڵەت بە بڵاوبوونـەوەی کتێبێـك دەدرێ لە ژێـر سەرپەرشتی سـەرۆکایەتی لیژنـەی فـەتوا، لـە کاتێکـدا نموونـەی ئـەم ئەفسانانەی تێدایە، کە سەردەکێشێ بۆ هاوبەشدانان بۆ خوا؟!

**ئەمەش وەڵامەکەی:**

لیژنەی هەمیشەیی وەڵامێکی داوەتەوە، تیایدا هاتووە:

((هەڵە مەگرە لـەوەی کتێبەکـەی بڵـاو کردۆتـەوە!، دواتـر ئەمـە شـتێکی نکۆڵی لێکراو نییە! لە ئەفسانەکانیش نییە!، ئەم جۆرە شـتانە ڕوویانـداوە بـۆ هەنـدێك لـە هاوەڵان "ڕەزای خوایان لێبێ"، وەك ڕێز و کەرامـەتێك بۆیـان))، ئـەوەی مەبەسـتمان بوو ئەوەندەیە!.

دەڵێم: ئا ئێوە دەبینن!، شێخ لەسەر ئاو دەڕوات!، کارێکی نکۆڵی لێکـراو نییـە!، تەنانەت لە ئەفسانەکانیش نییە، بەڵکو کەرامەتە.

ڕێگریـان لـە پرسـیارکەرەکە کـردووە، کـرچ و کـاڵی و هەڵـە بگـرێ لەوانـەی کتێبەکەی بڵاوکردۆتەوە (لە کاتێکدا خۆیان کتێبەکەیان بڵاوکردۆتەوە).

بۆ زانیاری وتەی لیژنەکە، کە ئەم کارە بۆ هەندێك لە هاوەڵانیش ئەنجامـدراوە، وتەیەکی ڕاست نییە، مەبەستیان لەوەیە کـە لـەبارەی عـەلائی حـەزرەمی و سـەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە گێڕدراوەتەوە. ڕاستەکە ئەوەیە کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس ئەسپسوارەکانی موسڵمانانی لـە بەشـێکی ڕووبـارێکی عێـراق پەڕاندۆتـەوە کـە قـوڵ نەبووە، ئەمەش کارێکە دەکرێ بکرێ.

سەبارەت بەو گێڕانەوانەی کە دەڵێن بـە لەشـکرەوە لـە دەریـادا پەڕیونەتـەوە و دەریاش ئەوانی هەڵگرتووە، لە ژێر هەر ئەسپێك چیایەکی مـەزن دروسـت بـووە، تـا

ئەسپەکە لەسەری بحەسێتەوە!، ئەمانە گێڕانەوەی درۆن، لەلایەن سەیفی کوڕی عەمری تەمیمیەوە هەڵبەستراون، ناوبراو هەڵبەستێکی درۆزنە و بە بەڵگە ناهێنرێتەوە، ئەمانە ئەو شتانەن کە لیژنەکە دەڵێ ئەم کارانە بۆ هەندێك لە هاوەڵانیش ڕوویداوە.

**پوختەکەی لێرەدا ئەوەیە :** ئێمە وەك چۆن لە لیژنەکە دەبورین لە بەڕاستدانانی هاووێنەی ئەم ئەفسانانە، ئەوا با پاساویش بهێنینەوە بۆ شیعە و سۆفییەکان. با هەمووان وەك برای موسڵمان بمێنینەوە، لەگەڵ هاندانی ڕەخنەی ناوخۆیی لە هەر مەزهەبێکدا، ئەمە باشترە لە ڕەخنەی دەرەکی، کاتێك هەر مەزهەبێك هەڵدەستێت بە تیرگرتنە ئەو شتەی ناو مەزهەبەکانی تر، کە شتەکە لە ناو خۆیشیدا هەیە یان لێی نزیکە.

ئێستاش لە دوای ئەم ڕێخۆشکردنە پێویستە، ئەوا دێینە سەر نموونە سەلمێنەرەکان.

## یەکەم: فەتوایە بەکۆمەڵەکان

### ( فەتواکانی لیژنەی هەمیشەیی )

لیژنەی هەمیشەیی لە پاڵ موفتی، چەندین ئەندامی فەتوا لەخۆدەگرێ، کە ژمارەیان لە سێ موفتی کەمتر نابێ، لەوانەیە ژمارەیان بگاتە پێنج یان زیاتر، لەوانەی ناومان بردن.

### نموونەی ( ١ ) لە فەتوا جفرەدارەکان لە تەکفیردا!

بۆ نموونە فەتوایەکی لیژنەی هەمیشەیی هاتووە، لەبارەی سنووری جیاکەرەوەی نێوان کوفر و ئیسلام، ئەمەش دەقی وەڵامەکەیانە:

((سنووری جیاوازی نێوان ئیسلام و کوفر، بریتییە لە: شایەتمان دەربڕین، لەگەڵ ڕاستگۆبوون و دڵسۆزی و کارکردن بەپێی داخوازیەکانی، هەر کەسێك ئەمانەی

تێدا بێنەجێ ئەوا ئەو کەسە موسڵمانێکی باوەڕدارە، بەڵام ئەو کەسەی دووڕوویی بنوێنێ و ڕاستگۆ نەبێ و دڵسۆن نەبێ، ئەوا باوەڕدار نییە، هەروەها ئەو کەسەش کە شایەتمان دێنێ، بەڵام هاوبەشدانان ئەنجام بدات، کە هەڵوەشێنەرەوەی شایەتمانە! وەك ئەوەی تکا بە مردوان بکات لە خۆشی و ناخۆشیدا، ئەوەش کە حوکم کردن بە یاسا دەستکردەکان بە باشتر دابنێ لە حوکم کردن بەو بەرنامەیەی خوا دایبەزاندووە، یاخود ئەوەی سوکایەتی بکات بە قورئان یاخود بەوەی لە سوننەتی پێغەمبەرەوە (درود و سڵاوی خوای لێبێ) چەسپاوە، ئەو کەسە بێ باوەڕە ئەگەر نوێژ بکات و ڕۆژووش بگرێت))[1].

## نموونەیەك لە ڕەخنەگرتن لەم فەتوایە

هەر کەسێك شایەتمان بهێنێ، ئەوا لەڕووی حوکمەوە موسڵمانە، ئەگەر ڕاستگۆ و دڵسۆزیش نەبێ، پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) لەسەر ئەمە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دووڕوواندا دەکرد، لە ڕووی ڕووکەشیەوە وا ڕەفتاری لەگەڵیاندا دەکرد کە موسڵمانن، لایەنی دەروونی ئەوانیشی بۆ خوای پاك و بەرز بەجێهێشتبوو، لە کاتێکدا دەبینین لیژنەکە سورە لەسەر باسکردنی ئیمان، لەگەڵ ئەوەی پرسیارەکە لەبارەی سنووری جیاکەرەوەی نێوان ئیسلام و کوفرە. سەبارەت بە ئیمان؛ ئەوا ڕاستە دووڕووان بڕوادار نین، هەروەها لە ناخیشدا موسڵمان نین، بەڵام لە ڕووکەشدا موسڵمانن، ئێمەش حوکم بە ڕووکەش دەدەین، خوای گەورەش لێپرسینەوە لەلایەنی دەروونی دەکات. ئەو دەرگایە بچوکەی لیژنەکە کردوویەتیەوە، لەوانەیە ملکەچی هەندێك ڕاڤە و لێکدانەوە و قۆستنەوەی زیادەڕۆچووان بێ، بەمەش هەندێك مەرج بە مەرج بگرن، لەسەر ئەم مەرجانە هەندێك حوکم بنیات بنێن... تاد، ئەوەی کتێبەکانی زیادەڕۆچووان بخوێنێتەوە، دەبینێ لەلای ئەوان هاووێنەی ئەم مەرج و

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ٢/ ٤٥.

هەڵاواردنانە لەلای ئەوان هەیە، کە دەقە شەرعییەکان باسیان نەکردووە، بەڵکو لە فەتوا مەزهەبییەکاندا هاتوون.

ئەوەی هەرە گرنگە؛ ڕاڤەی لیژنەکەیە بۆ ئەم وتەیەی: ((کارکردن بەپێی داخوازییەکانی)). ئەم کارکردنە بەپێی شایەتمان، لەلای لیژنە بریتی نییە هەڵگەڕانەوە یان سوکایەتی کردن بە قورئان یان تانەدان لە پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ)، شتی تریش جگە لەو داخوازیانەی موسڵمانان لەسەری کۆکن، کە ئیسلام پوچەڵ دەکەنەوە، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە بەپێی داخوازیەکانی تایبەتمەندییە وەهابییەکان، کە تیایدا جیاوازن لەگەڵ ئەوانەی پێش خۆیان، لە حەنبەلییەکان و جگە لە خۆشیان، هەر بۆیە بەم وتەیە شرۆڤەیان کردووە: ((وەك ئەوەی تکا بە مردوان بکات لە خۆشی و ناخۆشیدا، ئەوەش کە حوکم کردن بە یاسا دەستکردەکان بە باشتر دابنێ لە حوکم کردن بەو بەرنامەیەی خوا دایبەزاندووە،)).

لە چەند توێژینەوەیەکی ڕابردوودا، ئەوەمان ڕاڤە کردووە کە ئەم شتە ڕاجیایی تێدایە، لە نێوان موسڵماناندا؛ سەبارەت بەوەی ئایا دروستە یان ناپەسەندە یاخود قەدەغەیە یان بیدعەیە. ئەوپەڕی ئەوەی کەسی نا وەهابی لەبارەی ئەم شتانەوە دەڵێ ئەوەیە کە هاوبەشدانانی بچوکە، هەڵگەڕانەوە نییە، تەنانەت لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامیش نییە.

سەبارەت بەوەی دووەم؛ ئەوا لیژنەکە لە فەتواکانی تردا شتەکەی بۆ ئێمە یەکلا کردۆتەوە، کاتێك حوکم کردنی بە یاسا دەستکردەکان، بە کوفرێکی بچوکتر داناوە لە کوفری ڕەسەن، کە نابێتە هۆی دەرچوونی ئەنجامدەرەکەی لە ئیسلام، بەم پێیە ئەمە یەکێك نییە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، ئەم هاوسەنگییەی دوایی بەهۆی فشاری سیاسیەوە بوو، لە کاتێکدا زیادەڕۆچووانی تر بەردەوام بوون لەسەر تەکفیر کردنی دەوڵەت و زانایان، هەر لەبەر ئەم هۆکارە، لەگەڵ ئەوەی ئەم بابەتە لە کۆنەوە بابەتێکی ڕاجیایی بووە، بابەتی – حوکم کردن بە جگە لەو بەرنامەیەی خوا

دایبەزاندووە – ڕۆشنترە لە ئاماژەکردن بە کوفر، لە پیاوێك کە تکا بە پێغەمبەر دەکات و هاواری لێ دەکات یان هاواری هەندێك لە پیاوچاکان دەکات، چونکە ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾المائدة: ٤٤.

واتە: (بێ گومان ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا دایبەزاندووە، ئا ئەوانە بێ باوەڕن). ڕاشکاوە لەبارەی کوفر و بێ باوەڕی ئەوەی حوکم بەوە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، بەڵام ئایا ئەمە کوفری بچوکە، یان کوفر مەزنی دەرخەرە لە ئیسلام؟ ئەمە خاڵی ڕاجیاییە هەر لە سەردەمی ئیبن عەبباسەوە.

بەڵام ئەوەی دەڵێت: ئەی پێغەمبەر خوا، بە هانای ئوممەتەکەت وەرە؛ بەڵگەی قورئانی لە کوێیە، سەبارەت بەوەی ئەم کەسە دژی ئیسلام هەڵسوکەوتی کردووە و لە ئایین دەرچووە؟ لەوانەیە دەربڕینەکەی خراپ دەربڕیبێ یان بێ ئەدەبی کردبێ یاخود گومانی بردبێ بەوەی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) گوێبیستی وتەکەی دەبێ لە هەر کوێیەك بێ، چونکە هەموو دوو شەممە و پێنج شەممەیەك کردەوەکان بۆ پێغەمبەر نمایش دەکرێن، هاوارکەرەکە پێی خۆشبووە، پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) گوێبیستی ئەم وتەیەی بێ، بەمەش تکای بۆ بکات لەلای خوا، چونکە پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) لە گۆڕەکەیدا زیندووە... تاد. ئەمە بەڵگە هێنانەوەی هەندێك لە سۆفییەکان و هەندێك لە ئەهلی سوننەیە. دەربارەی ئەم جۆرە کردەوانە، ئەوا هیچ ئایەتێکی ڕاشکاوی لەبارەوە نییە.

بەم پێیە؛ واباشتربوو زانا وەهابییەکان لەم بابەتەدا ڕاجیاییان پەسەند کردبا. بابەتی یەکەمیان یەکلا کردباوە.

بەڵام ئێمە پێچەوانەمان بەدی کرد، ئەوا بە یەکلاکراوەیی حوکمی کوفر دەدەن لەسەر ئەو کەسەی هاوار و تکا لە پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) دەکات – لەگەڵ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی ڕاشکاو نییە لەسەر کوفر کردنی –، لەگەڵ ئەوەی

ڕاجیان لە بارەی کوفری ئەوەی حوکم دەکات بە جگە لەوەی خوا دایبەزاندووە، هەر چەندە دەقی ڕاشکاو هەیە لەسەر کوفر کردنەکە (جا چ کوفری مەزن یان بچوك بێ).

ئــا لێــرەوە متمانــە بــە زانایــان لاواز دەبــێ، لێرەشــەوە زیادەڕۆچــووان زیادەڕۆچووەکانی تر کافر دەکەن.

بەڵام خودی زانایان، لە هەندێك شتی کەم و بچوکدا زیادەڕۆچوون، لە هەنـدێك شتی تریشدا ئاسانکاریان گرتۆتەبەر، بەهۆی فشاری سیاسیەوە.

کەواتە تەکفیر کردنی ئەو کەسەی هاواری مردووان دەکات، لێرەدا مەبەست ئەو کەسەیە هاواری پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) یان پیاوچاکان دەکات.

ئەمە تەکفیر کردنی زۆربەی ئەهلی سوننە دەگەیەنێ، چ جای شیعەکان.

لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەهلی سوننە پێیان وایە تەوەسول کردن بە پێغەمبەرەوە بە زیندوویی و بە مردوویی دروستە.

داوا لێکردنی بە زیندوویی و بە مردوویی دروستە.

تکا لێکردنی بە زیندوویی و بە مردوویی دروستە.

هاوار کردنە ئەو بە زینوویی و بە مردوویی دروستە.

پێشیان وا نییە لە ئایین هەڵگەڕاونەتەوە و بێ باوەڕن.

بەڵکو بەم ئایەتە پیرۆزە کار دەکەن: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾﴾النســـاء: ٦٤.

واتە: (خۆ ئەگەر ئەو خەڵکە بەڕاستی کاتێك ستەمیان لەخۆیان کـرد " بـە لادان لـە شـەریعەت " بهاتنایـە بـۆلای تـۆ ، داوای لێخۆشـبوونیان لـەخوای گـەورە بکردایـە ، پێغەمبەریش داوای لێخۆشبوونی بۆ بکردنایە ، ئەوە بێگومان ئەوکاتە دەیانزانی کە خوا تۆبەو پەشیمانی وەرگرەو میهرەبان و دلۆڤانە).

ئەوان وشەی (جاۆوك) دەگشتێنن بۆ پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) بە زیندویی و بە مردوویی.

ئەو فەرمووداەنەش دێننەوە، کە هەواڵ دەدەن سەبارەت بەوەی هەر درود و سڵاوێك لەسەر پێغەمبەر بدرێ، ئەوا پێی دەگات، کردەوەکان بۆی نمایش دەکرێن، چەندین بەڵگە هێنانەوەی دوور و درێژی قەناعەت پێنەکەریان هەیە، بەڵام ئەوەیان لەسەر لادەدات کە کوفریان کردبێ، بەهۆی لێکدانەوە (تأویل)ەوە.

ئەوان لێکدانەوە و بەڵگە هێنانەوەی خۆیان هەیە، ئەگەر قەناعەت پێنەکەریش بن، بەڵام بەڵگە هێنانەوەی وەهابییەکان لەسەر لە ئایین دەرچوونی ئەوانە و حەڵاڵکردنی خوێنیان زۆر دوورترە لە قەناعەت دروست کردن، بەهۆی ڕاشکاوی ئایەتەکان لە هۆشداریدان لە تەکفیر کردنی موسڵمان و حەڵاڵ کردنی خوێنەکەی، لە بەسەرهاتی ئوسامەی کوڕی زەیددا پەند و ئامۆژگاریمان بۆ هەیە[1].

بە هەر حاڵ: لەم بۆچوونەیاندا ڕاست یان هەڵەیان پێکابێ، ئەوا هیچ موسڵمانێك لە سەر زەوی نییە پێی وابێ پەرستنی جگە لە خوا دروستە، ناوی لێنانێن پەرستش، هەروەك چۆن وەهابییەت بەڵگەی هەیە، پێیان وایە بۆچوونەکەیان ڕاستە، بەم بەڵگانەشیان خوێنی موسڵمانان حەڵاڵ دەکەن. لە دیارترین ئەو زانا موسڵمانانەی دەبنە ئامانجی تەکفیرەکە، بریتین لە زانایان ئوممەت کە وەهابی نین، وەك: زانایانی ئەزهەر و جگە لەوانیش، هەروەها زانا گەورەکانی پێشووی ئەهلی سوننە، وەك: ئیبن حەجەر، زەهەبی، ئیبراهیمی حەربی، زۆربەی زانا پێشووەکانی حەنبەلییەکان، چ جای ئەوانی تر؛ لە توێژینەوەکانی ڕابردوودا ئەوەمان شرۆڤە کردووە.

---

(١) لە بەشی پێشوتری ئەم کتێبەمان باسی ئەم بەسەرهاتە کرا و خرایەڕوو.

هەروەك حوکم کردن بە یاسا دەستکردەکان، وردەکاری تێدایە، جا چ لە ڕووی کوفر بەسەرداداان بێ، لەوەی ئایا کوفری بچوکە یان گەورەیە؟ یان لە ڕووی دۆخی ئەو یاسایانەوە، لەوەی دژی دەقە ڕاشکاوەکانن یان نا؟... هەندێك لە زیادەڕۆچووان پێیان وایە سیستەمەکانی هاتوچۆ و تۆپی پێ بەشێکنلە یاسا دەستکردەکان، کە ئەو کەسە پێی کافر دەبێ کە بە سیستەم دایدەنێ. بابەتەکە لەمەدا زۆر درێژە دەکێشێ، دواتر لەم بارەوە چەند نموونەیەك دەخرێتەڕوو.

**پوختـه**: فەتوایـە جفردارەکـان، کـە زانایـان خۆیـان پـێ دەپـارێزن لـە دەوڵەت، بنچینەن لە فەتوایە بیروباوەڕییە تایبەتەکان، زانستخوازان چاك لێی تێدەگەن؛ هەر بۆیە هیچ کەسێك سەرسام نابێ بە زۆری زیادەڕۆچووانەوە.

بەڵێ لەوانەیە بەرپرسەکان (جفرە نهێنیـەکان) لـە فەتواکانـدا نـەزانن، بـەهۆی چەند شتێکەوە، لەوانە: ئەمە بەرسیارێتی ئەوان نییـە، دووەمیـان: دەورەدراون بـەو کەسانەی کە ئەم فەتوایانە لەوان دەشارنەوە، یان لێکدانەوەی دووری بۆ دەکەن. بەڵام ئەمـــە نابێتـــە هـــۆی لابردنـــی بەرپرســـیارێتی تایبـــەتی، دوای نـــاودەرکردنی زیادەڕۆچوونمان لـە تێکـڕای جیهـانی ئیسـلامیدا، وایلێهـاتووە کەسـی سـعودی کاتێـك دەڕواتـە وڵـاتێکی عـەرەبی یـان خۆرئـاوایی، ئـەوا دەبێتـە ئامـانجی گومـان لێکـردن و چـاودێری و پرسـیارکردن دەربـارەی هۆکـاری گەشـت کردنەکـەی و ئایـا لـە کـوێ دەمێنێتەوە، جگە لەمانـەش لەو پرسیارانەی لـەو گەشتیارانە نـاکرێ کـە هـەڵگری ڕەگـەز نامەیـەکی تـرن. ئایـا ئەمـە کـەمێك هانمـان نـادات بـۆ پێداچـوونەوە بـەو ناوبراوانەی خۆیان شاردۆتەوە یان بێ ئاگان لە هزری ناوخۆییی؟!.

بە هەر حاڵ؛ زیادەڕۆچووان پێویستیان بە ڕاڤەکار نییـە، ئـەوان کەسـانی وایـان تێدایە شارەزان لە مەزهەبەکان، ئەم فێڵ و تەڵەکانەیان لەلا شاراوە نییە کە هەندێك کەسی دەوروبەری دەسەڵات پێی هەڵدەستن، بەڵکو دەبـینی زیادەڕۆچـووان بـاوەڕێکی تەواویان بەم فەتوایانە هەیە، چونکە جگـە لـەم فەتوایانـە فێـری فـەتوا و شـتی تـر

نــەبوو، چ لــە خوێنــدنی زانکــۆ چ لــە خوێنــدنی گشــتیدا، فــەتواکانی تریشــیان نەخوێندۆتــەوە تــەنها لــە دوای ڕووداوە سیاســییە گەرمەکانــەوە نــەبێ، وایکــرد زیادەڕۆچووان گومانیان هەبێ لەوەی ئەم زانایانـە ((ئـاینی خۆیـان بـە کاربەدەسـتان فرۆشتووە))! لەوانەیە بەشێك ڕاستیان لەگەڵدا بێ لە تۆمەتبارکردنی زانایـان، بەڵام ئەوانیش لە نەزانی ڕزگاریان نـەبووە بەهـەمان شێوە، بـەوەی ئـەم فەتوایانـەیان بـە نموونەیەك بۆ ڕاستی وەرگرتووە، سوکایەتیان بە فەتواکانی تری زانایانی موسڵمانان کردووە، لە زانایانی ئەزهەر و جگە لەوانیش.

سەبارەتبەوەی وتم: بەشێك لە ڕاستی لەگەڵ زیادەڕۆچووانە، لە پشتکردنیان لە زانایان و گومان لێکردنیان، چونکە فەتواکانیان (لـە دوای قـەیرانی یەکـەمی کەنـداو ١٤١٠ك) زۆر گۆڕانیـان بەسـەردا هـات بـە بـەراورد لەگـەڵ فـەتواکانیان لـە پـێش ئـەم قەیرانە!، ئەمەش گوزارشت دەکات لە کاریگەری مەزنی سیاسی لەسەر زانایان، هەڵەی سیاسییەکان دەستی پێکرد، کاتێك لە ڕووی سیاسیەوە ئاسودە دەبوون بە فەتوایەکی زیادەڕۆچـوو، چـونکە بـە سـوك و کـەم موسـڵمانەکانی هـەژمار دەکـرد و شانشـینی سعودیەی وەك تاکە دەوڵەتی ئیسلامی دەناساند.

بـەڵام ئـەم بـەخۆدا هەڵدانـە، بـە سـوك ڕوانینـە بەرامبـەر، بـووە هـۆی بـەدوا داهێنانی ئەوەی ئەو فەتوایانەی گەلان و حکومەتەکانی موسڵمانانی پێ کافر دەکرا. دەکـرێ بـەکاربهێنرێ لـە نـاوخۆدا بـۆ دەستخسـتنی دەسـتکەوتەکان، یـان بەلایـەنی کەمەوە نزیك کردنەوەیان.

ئـا لێـرەوە گـرێ کوێرەکـە دەهـات و دەڕۆیشـت... جـەختی لـەوە دەکـردەوە سەرچـاوەی نەخۆشی و دەردەکە بریتییـە لـە نـەبوونی نوێگـەری هـزری گشـتگیری ئیسلامی، پێویستی کرانەوە بە ڕووی گشت موسڵماناندا، فـەرامۆش کردنـی گومـان و پاشمـاوە مەزهەبییـەکان، کـە لـەلای زۆر خـەڵك چەسـپاون، بـەهۆی ئـەو فـەتوا و

بۆچوونانەی بە بەردەوامی دەڕژێنرانە گوێچکەکان لە هەر مزگەوتێك و لە دوو توێی هەر کتێبێکدا.

ئەم کارە زۆر سەختە لەسەر دەوڵەت، چونکە بێ ئاگابووە لە زیادەڕۆچوونی ناوخۆیی و فەتوایە جفرەدارەکان، پاڵپشتی ئەو زانا و بانگخوازە زیادەڕۆچووانەی کرد کە موسڵمانان بە موسڵمان نازانن؛ جا شتێکی سروشتییە لق و پۆپی ناوخۆیی لە زیادەڕۆچوون و تەکفیر بپشکوێنەوە.

نموونەی هاوشێوەی فەتوای پێشوو، یەکێکە لەو فەتوایانەی کەمترین جفرەی تێدایە... لەبەر ئەوەی هەندێك فەتوا زۆر ڕاشکاون، دواتر دەخرێنەڕوو. ئەم فەتوایانە (بە جفرەدار و ڕاشکاوەکان) زۆر دووبارە بوونەتەوە لە ناو فەتواکانی گشت زانایە ناودارەکانی شانشینەکە بەبێ هەڵاواردن، هەر لە سەردەمی شێخ محەممەدی کوڕی عەبدولوەهابەوە تا ئەمڕۆ.

## نموونەی (٢): تەکفیر کردنی سێیەکی موسڵمانان!

یەکێك لە فەتواکانی لیژنەی هەمیشەیی ئەمەیە: ((هاوارکردنی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) هاوبەشدانانی مەزنە))! ئەمەش تەکفیر کردنی زۆربەی موسڵمانانە لە سوننە و شیعە، چونکە لەمەدا زۆربەیان پێیان وایە سوننەتە هاواری پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) بکرێ، کتێبیشیان لەسەر دروستی ئەم کارە نووسیوە[1].

بەڵکو ئەوانەش لەسەر ئەم بۆچوونەن، کە زانایانی شانشینەکە ستایشیان دەکەن، وەك غەمارییە مەغاریبەکان.

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ١/ ٧٧.

هه‌ندێك له زانایانی پێشووش له‌سه‌ر ئه‌مه‌ن، كه زانایانی شانشینه‌كه پیاندا هه‌ڵده‌ده‌ن، له دیارترینیان ئیبن حه‌جه‌ری عه‌سقه‌لانی، خاوه‌ن فه‌تحولباری.

زانایان لێره‌دا ڕاشكاوانه یان ده‌بێ بڵێن: ئه‌وانه‌ی بۆچوونی ئیبن حه‌جه‌ڕ و هاوشێوه‌یان هه‌یه بێ باوه‌ڕن، به‌هۆی كوفری مه‌زنه‌وه.

یان ده‌بێ ده‌ست هه‌ڵبگرن له شوێن پێ هه‌ڵگرانی ئیبن حه‌جه‌ڕ و زانایانی تریش.

ئه‌و موسڵمانانه‌ی شوێن پێی ئیبن حه‌جه‌ڕ هه‌ڵده‌گرن یان ئه‌زهه‌ر، زۆر له‌وانه زیاترن، كه شوێن پێی ئه‌ندامانی لیژنه‌ی هه‌میشه‌ی له سعودیه هه‌ڵده‌گرن.

هاواركردنه پێغه‌مبه‌ر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) یان ته‌وه‌سول كردن پێی له دوای كۆچی دوایی كردنی، زۆربه‌ی زانایانی ئه‌هلی سوننه پێیان وایه دروسته، یان به‌لایه‌نی كه‌مه‌وه ئه‌و كه‌سه ته‌كفیر ناكه‌ن كه ده‌یكات، هه‌روه‌ك پێشوتر شرۆڤه‌ی ئه‌وه‌مان كرد.

به‌ڵێ؛ له‌وانه‌یه ڕاجیاییان هه‌بێ سه‌بارهت به‌وه‌ی ئه‌مه سوننه‌ت یان ڕێپێدراو یاخود ناپه‌سه‌نده، به‌ڵام نه به كوفری بچوك و نه به هی گه‌وره‌شی دانانێن.

## نموونه‌ی (٣): ته‌كفیركردنی نیوه‌ی موسڵمانان!

لیژنه‌ی هه‌میشه‌یی فه‌توایدا: ((هاواركردنه وه‌لییه‌كانی خوا هاوبه‌شدانانی مه‌زنه له‌لای لیژنه‌ی ناوبراو))(١).

به‌ڵێ؛ له‌وانه‌یه ئه‌مه بیدعه یان هاوبه‌شدانان یاخود كارێكی حه‌ڕام بێ، به‌ڵام هاوبه‌شدانانی مه‌زن له‌سه‌ر زۆربه‌ی موسڵمانان جێبه‌جێ نابێ، كه ئه‌م كاره ده‌كه‌ن به‌هۆی نه‌زانیه‌وه یان لاسایی كردنه‌وه‌ی زانایانی تر، دروست نییه ته‌كفیر كه‌سێكی

---

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ١/ ٨٧.

موسڵمان بکرێ کە هاواری وەلییەك دەکات، ئەگەر مەبەستی پێ پەرستش نەبێ، جا بۆ نموونە دەڵێ: هۆ فڵان یارمەتی تۆ، تاکاکەت، هاوێنەی ئەم کەسانە دەبێ فێر بکرێن نەوەك تەکفیر بکرێن.

**نموونەی (٤): منداڵانی بێ بڕوایان لەوانەیە بچنە دۆزەخەوە!**

حوکمی منداڵ و زارۆکەکانی هاوبەشدانەران لای لیژنەی ناوبراو ئەوەیە: ئەوان لە ڕۆژی دواییدا تاقی دەکرێنەوە، هەر یەکێك سەرکەوتوو بوو ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە، ئەوەش کە شکست دێنێ دەچێتە دۆزەخەوە[1]!.

دەڵێم: ئەمە بیروباوەڕێکی گشتییە لای زۆرێك لەو موسڵمانانەی سەرقاڵن بە فەرموودە گێڕدراوە تێکگیراوەکان، کە دروست نییە بدرێنە پاڵ پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ)، ئەو ئایەتە پیرۆزانەیان لەبیر کردووە کە جەخت لەسەر ڕزگاربوونیان دەکەنەوە:

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ۝١٥﴾ الإسراء.

واتە: (ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین) .

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ...۝٤٠﴾ النساء .

واتە : ( بەڕاستی خوا بەقەدەر تۆزقاڵێك ستەم ناکات ) .

هەندێك فەرموودەی تریش فەرامۆش دەکەن، کە بەخۆشیان بە بەڵگەی دێننەوە لە دژی ئەوانی تر، وەك ئەم فەرموودەیە:

((هەر منداڵێکی تازە لە دایك بوو، لەسەر سروشتێکی پاك لەدایك دەبێ)).

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ٣/ ٣٦٥.

جا ئەوەی لەسەر سروشتێکی پاك بمرێ چۆن تاقی دەکرێتەوە.

دواتر تەنها دونیا خانەی تاقیکردنەوەیە، نەوەك دواڕۆژ، چونکە دواڕۆژ تەنها خانەی پاداشت و سزایە. جا چۆن لێپرسینەوە لەگەڵ یەکێکدا دەکرێ کە هەرگیز گوناهی نەکردووە؟!

## نموونەی ( ٥ ): لیژنەکە هۆشداری دەدات لە دژایەتی کردنی تەکفیر!

ئەوەی نامۆیە ئەوەیە من نەمبینی لیژنەی فەتوادان بەرپەرچی کتێبە تەکفیرییەکان بداتەوە، وەك: ئەبو عیسامی مەقدیسی، ئەبو قەتادە، ئەبو بەسیر و جگە لەوانیش.

لە کاتێکدا لیژنەکە چالاك بوو لە هۆشداریدان لە بارەی ئەو کتێبانەی هەوڵیانداوە چارەی تەکفیر بکەن و هۆشداری لەبارەی بدەن و ڕێکخەرەکانی ڕوون بکەنەوە، بەڵکو خاوەنی ئەم کتێبانەیان بە (مورجیئە) بوون تۆمەتبار کردووە؟!

ئایا نهێنی ئەم چالاك بوونە لەم لایەنە، بێ دەنگ بوون لەلایەنەکەی تر چییە؟!

لەگەڵ ئەوەی ئەوانەی هۆشداری دەدەن، لەبارەی تەکفیرەوە و هەوڵی بچوك کردنەوەی بازنەکەی دەدەن هەندێك سەلەفی و وەهابی زیادەڕۆچوون، بەڵام ئاستی زیادەڕۆچوون لای ئەوان کەمترە، چەند کتێبێکیان تایبەت نووسیوە بۆ بەرپەرچدانەوەی فراوانکاری لە تەکفیردا، ئەم چالاکبوونە سەرسوڕهێنەی لیژنەکە لە بارەی بەرپەرچدانەوەی کتێبە هاوسەنگەکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی و بێ دەنگ بوون لەبارەی ئەو کتێبانەی تەکفیری موسڵمانانیان تێدایە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی زانایان کۆمەڵگە دەبەن بەرەو دەستگرتن بە زیادەڕۆچوونەوە، وەك ئەوەی ئەو فەتوایە بشارنەوە کە لە ژێر فشاری سیاسی دەردەچێ.

بۆ نموونە بڕوانە:

هۆشداریدانی لیژنەی هەمیشەیی لەبارەی مورجیئایەتی[1].

لیژنەکە بەرپەرچی چەند کتێبێکی داوەتەوە، کە هۆشداریان داوە لە بارەی ئاشوب و فیتنەی تەکفیر!، کە ئەمانە (التحذير من فتنة التكفير) و (صيحه النذير)، هەر دوو کتێبەکە دانراوی عەلی حەسەن حەلبییە، یەکێکە لە زیادەڕۆچووە هاوسەنگەکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی[2]!.

لیژنەکە بەرپەرچی کتێبی (أحكام التقرير في أحكام التكفير)ی داوەتەوە، کە دانراوی موراد شوکرییە[3].

لیژنەکە بەرپەرچی کتێبی (حقيقة الإيمان)ی عەدنان عەبدولقادری داوەتەوە[4].

لیژنەکە بەرپەرچی کتێبی (ضبط الضوابط)ی ئەحمەد زەهرانی داوەتەوە[5].

لیژنەکە هۆشداریداوە لە بارەی کتێبی: (الحكم بما أنزل الله و أوصول التكفير)، دانراوی خالید عەنبەری[6].

لیژنەکە بەرگری کردووە لە فەتوای محەممەدی کوڕی ئیبراهیم، تیایدا ئەو وڵاتە موسڵمانانەی تەکفیر کردووە، کە یاسا دەستکردەکانیان تێدایە[7].

لیژنەکە لەم بوارەدا چالاکە، بەڵکو هەردەم دەمانبینی لیژنەکە ئامۆژگاری دەکات سەبارەت بە خوێندنەوەی چەند کتێبێك کە تەکفیری موسڵمانانی تێدایە[1].

---

(١)الفتاوى الشرعية في المسائل العصرية، جمع خالد الجريسي، ١٦٦.

(٢) هەمان سەرچاوە: ١٢٤.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١٢٦.

(٤)هەمان سەرچاوە: ١٢٢.

(٥)الفتاوى الشرعية في المسائل العصرية، جمع خالد الجريسي: ١٢٣.

(٦)هەمان سەرچاوە: ٢١ - ٢٢.

(٧)فتاوى اللجنة الدائمة: ١/ ٥٤٤.

## نموونەی ( ٦ ): تەکفیر کردنی وڵاتانی موسڵمانان، بەوەی وڵاتی کوفرن!

لیژنەی هەمیشەیی فەتوای داوە بەوەی هەر دەوڵەتێك یان وڵاتێك حوکمڕانەکانی شەریعەت بەرپا نەکەن، ئەوا ئەم وڵاتانە وڵاتی کوفرن، لەسەر خەڵکەکەی پێوستە کۆچی لێ بکەن! (واتە بێنە شانشینەکە)!، ئەمەش لە فەتوایەکی دوور و درێژدا هاتووە[٢].

ئێمە دەزانین – هەروەك دەخرێتەڕوو – زانایانی شانشینەکە گشت دەوڵەتێکی ئیسلامی و عەرەبی بە دەوڵەت و حکومەتی کافر هەژمار دەکات، بەم پێیە هەر کەسێك قەناعەتی هەبێ بەم فەتوایانە لە هاوڵاتیانی ئەم وڵاتانە، ئەوا یان کار دەکەن بۆ کۆچکردن بۆ شانشینەکە، یاخود مانەوە لە دوای حەج یان عومەرە کردن یاخود بەرەنگاربوونەوەی وڵات و حکومەتەکان لە ناو وڵاتەکانیان لە ڕێی توند و تیژی و خۆتەقاندنەوە.

بەمەش بەرپرسیارێتی ناوخۆیی دەردەکەوێ، لە بەرامبەر تەکفیر و خۆتەقاندنەوە و تێکدان لە وڵاتانی موسڵماندا.

(١)الفتاوى الشرعية في المسائل العصرية، جمع خالد الجريسي: ١٢٩.

(٢)فتاوى اللجنة الدائمة: ١٢/ ٥١.

**نموونەی ( ۷ ): تەكفیر كردنی هەرێمەكانی موسڵمانان.. بەوەی وڵاتی كوفرن**

لیژنـەی هەمیشـەیی فـەتوای داوە، بـەوەی ئـەو حكومەتانـەی كـار بـە یاسـا دەسـتكردەكان دەكـەن لـە وڵاتێكـدا، كـە موسـڵمانان و مەسـیحییەكانی تێدایـە، ئـەوا حكومەتێكی كافرە، هەڵبژاردن بۆ كافران لەم وڵاتانەدا دروست نییە[1].

بەم پێیە گشت حكومـەت و دەوڵەتـە عـەرەبی و ئیسلامییەكان لـەلای لیژنەكـە كـافرن، دروسـت نییـە دۆسـتایەتی بـۆ بنـوێنرێ و دانبنـرێ بـە شـەرعییەتەكەیدا. دەنگدان بۆ جگە لە موسڵمان دروست نییە ئەگەر شایستەش بێ.

ئەگـەر موسـڵمان ئەمـەی زانـی، ئـەوا تـەكفیری دەكـەن، چـونكە ئـەوەی تـەكفیر نەكردووە كە ئەوان تەكفیری دەكەن، ئەم چیرۆكە دوور و درێژە.

**نموونەی ( ۸ ): لیژنەكە بەدەستهێنانی ڕەگەزنامەی وڵاتـانی عەرەبی و جگـە لـەوانیش بە حەرام دادەنێ**

لیژنەكـە فـەتوا دەدات بـە حـەرام بـوونی هـەڵگرتنی ڕەگەزنامـەی حكومەتـە كافرەكانی ئەو وڵاتانە[2].

دەڵێم: ئەم فەتوایە بۆ ئەوەی ڕابمێنێ لـەوە فـراوانترە كـە هەنـدێك ئەندێشـەی دەكەن، دروست نییە ڕەگەزنامەی هیچ دەوڵەتێكی ئیسلام و نـا ئیسـلامی هـەڵبگیرێ! چونكە فەتواكە جەختی كردۆتەوە لەسەر پرسی (حكومەت)، ئێمەش ڕای زانایـانی شانشینەكە لەبارەی حكومەتەكان و وڵاتانی موسڵمانان دەزانین.

(۱)هەمان سەرچاوە: ۱/ ۲۷۱.

(۲)هەمان سەرچاوە: ۲/ ٦۹.

**نموونەی (٩): حەرامکردنی پەنابردنە بەر دادگاکانی وڵاتە ئیسلامییەکان و جگە لەوانیش بۆ یەکلا کردنەوە پرسەکان**

لیژنەکە فەتوایداوە بە حەرام بوونی پەنابردنە بەر یاسا دەستکردەکان لەو وڵاتانەی شەریعەت جێبەجێ ناکەن[1]. بەم پێیە بۆ موسڵمانان لە جیهانی ئیسلامیدا دروست نییە پەنا ببەنەبەر دادگاکانیان بۆ یەکلاکردنەوەی پرسەکان! لەبەر ئەمە هەندێك لە موسڵمانان ڕەخنە لە شانشینەکە دەگرن، بەهۆی ئەم فەتوایەوە کە بە دەستوەردان دادەنرێ لە دادگا و وڵاتانی موسڵماناندا، لەگەڵ ئەوەی موسڵمان ناچارە لە خۆرئاوادا سەرباری وڵاتانی موسڵمانان پەنا بباتەبەر ئەو دادگایانەی لەوێدا هەن، بۆ یەکلاکردنەوەی پرسەکەیان، جا چ کار بکات بە یاسا دەستکردەکان یان شەرعییەکان، ئەگەرنا مافەکان پەکدەخرێن.

ئەوەی نامۆیە؛ ئەوەیە من ئەم ڕۆژانە، ئەوەم خوێندۆتەوە کە پارێزەرانی (دامەزراوەی خێرخوازی پارێزەران) سکاڵایەکی لە ئەمریکا بەرز کردۆتەوە، بەهۆی لەکار وەستاندنی، ئەم دامەزراوەیە یەکێکە لە لکاوترین ڕێکخراوە خێرخوازییەکان بە قوتابخانەی ناوخۆیی شانشینەکەوە، هەروەك چۆن ئەم ڕێکخراوە ناچاربوو وابکات، ئەوا موسڵمانانیش بەهەمان شێوە ناچارن پەنا ببەنەبەر دادگاکانی وڵاتانی خۆیان یان وڵاتە خۆرئاواییەکان، کە کار دەکەن بە یاسا دەستکردەکان.

---

(١)هەمان سەرچاوە: ١/ ٥٤٤.

**نموونەی (١٠): حەرامکردنی پارێزەرایەتی مەگەر بە چەند مەرجێك نەبێ!**

لیژنەکە خوێندنی پارێزەرایەتی بە دروست نازانێ، مەگەر توێژەر و خوێنەری ئەم بوارە خاوەنی ڕۆشنبیریەکی شەرعی فراوان بێ، کە ببێتە قەڵایەك بۆی تا لانەدات[1].

**نموونەی (١١): دۆستایەتی و دوژمنایەتی**

سەبارەت بە دۆستایەتی و دوژمنایەتی، ئەوا بەشێکی مەزنی داپۆشیوە لە فەتواکانی زانایانی شانشینەکە؛ لەوانەش ئەندامانی لیژنەی هەمیشەیی، زانایانی دەرەوەی لیژنەکە، بانگخوازان، لەگەڵ فراوانکارییەکەی گەورە لەم بابەتەدا و بە مەرج گرتنی شتانێکی نا پێویست. دەکرێ لەم بارەوە بگەڕێیتەوە بۆ:

فەتواکانی هەمیشەیی لیژنەکە: ٢/ ٤٧.

کۆی وانەکانی حەرەمی مەککە، هی ئیبن عوسەیمین: ٣/ ٣٥٧.

فەتوایە شەرعییەکان، کۆکردنەوەی جریسی: ٢٩٦.

زۆربەی کتێبەکانی شێخ فەوزان.

زۆربەی کتێبەکانی حەمودی تویجری... جگە لەوانەش.

تەنانەت هیچکتێبێك لە بیروباوەڕدا، لەلای وەهابییەت بەتاڵ نییە لە بیروباوەڕی (دۆستایەتی و دوژمنایەتی)، لەگەڵ ئەوەی زۆر بەدەگمەنی لە کتێبەکانی پێشیناندا هاتووە، یان هەر نەهاتووە.

---

(١)هەمان سەرچاوە: ١/ ٥٤٨.

**نموونەی (١٢): مەترسیدارترین بنەما: ((هەر کەسێك کافر تەکفیر نەکات ئەوا بەخۆیشی کافرە))!**

لیژنەکە ((هەر کەسێك کافر تەکفیر نەکات ئەوا بەخۆیشی کافرە)) بە بنەمایەکی شەرعی ناودەبات![1].

لەگەڵ ئەوەی ئەم یاسایە مەترسیدارترین بنەمایە، مشتومڕێکی زۆری لەسەر هەیە، بەم بنەمایە تەکفیری زانایان کراوە، لەلایەن دژەڕا زیادەڕۆچووەکانیانەوە.

ئەم بنەمایە شەرعی نییە یان گشتگیر نەبێ. لەبەر ئەوەی کافر لای ئێوە لەوانەیە لای جگە لە ئێوە کافر نەبێ.

بەڵێ؛ ئەوەی کافری ڕەسەن، وەك: کەسی بتپەرست، کافر نەکات، ئەوا هیچ کەسێك ڕێگری ناکات لە کافرکردنی ئەم جۆرە کەسە.

بەڵام کێشە ئەوەیە، ئەم بنەمایە بەکارهاتووە لە ناو پێکهاتەی وەهابییەتدا بۆ تەکفیر کردنی ئەو کەسانەی، تەکفیری ئەوانە ناکەن، کە وەهابییەت ئەوانی کافر کردووە، ئەمە لە زۆربەی بەکارهێنانەکانی کتێبەکانیدا بەم شێوەیە. ئەمە بنەمایەکە بەهۆیەوە دەتوانرێ کۆمەڵگەی پێ تەکفیر بکرێ...

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێك جولەکە و نەسرانیەکان کافر نەکات، تەنها بە (خاوەن کتێبەکان) ناویان بهێنێ، ئەوا لەلای وەهابییەکان، ئەم کەسە کافر دەکرێ. بەڵام لەلای موسڵمانانی تر کافر ناکرێت، بەم پێیە موسڵمانانی تر کافر دەبن، کەسێکیش کافر تەکفیر نەکات، خۆیشی کافرە.

ئەگەر کەسانێك لە وەهابییەکان، خۆیان پاراست لە تەکفیر کردنی ئەم موسڵمانانە، ئەوا ئەوانیش دەبنە کافر.

---

(١)الفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ١٣٦.

ئــهوهی ئهوانــهش کـافر نــهکات، خۆیشـی کـافره، جـا بــهم شـێوهیه تـا بازنهکـه بهرتهسك دهبێتهوه، تا دهگاته یهك دوو کهس.

ئــهوهی نامۆیــه ئهوهیــه، ئــهم لیژنهیــه ئــهم بنهمایــه بــه بنهمایــهکی شــهرعی ناودهنێ)!.

**نموونهی ( ١٣ ): هــهر کهسـێك بــه تــهنها نــاوی ( خــاوهن کتێبــهکان ) لــه جولهکــه و نهسرانییهکان بنێ، ئهوا کافره!**

لیژنهکه فهتوایدا سهبارهت بهوهی ههر کهسێك خۆی بگرێتهوه له کافر کردنـی جولهکه و نهسرانییهکان، تهنها به ناوهێنایان به (خاوهن کتێبهکان) وازبێنی[1].

لهگهڵ ئهوهی ئهم بابهته وردهکاری تێدایه، ههندێك له خاوهن کتێبهکان کافرن، ههندێکی تریان ڕاجیاییان لهبارهوه ههیه، بهڵگهش بهدهستی ههر دوو لایهکهیه.

دواتر لێرهدا کوفری گهوره و بچوك ههیه.

ئــــهم ئایهتــــه:﴿ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾ المائدة: ١٧.

واته : (سوێند بێت بێگومان ئهوانه بێ باوهڕ بوون که وتیـان : بهڕاسـتی خـوا ، ههر مهسیحی کوڕی مهریهمه ) . ڕاشکاوتر نییه لـهم فهرمایشـته : ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾المائـدة: ٤٤. واتـه : (بـێ گومـان ئـهوهی حـوکم و داوهری نهکات بهو بهرنامهیهی که خوا دایبهزاندووه، ئا ئهوانه بێ باوهڕن).

ئهی بۆچی سهبارهت به ئایهتی دووهم وردهکاری دێننه ئاراوه، دهربارهی ئایـهتی دووهمیش گشتاندن دهگرنهبهر؟ لهگـهڵ ئـهوهی ئایـهتی یهکـهم لـهبارهی کـافرکردنی بهشێکی خاوهن کتێبهکانه بهکرداری، له کاتێکدا ئایـهتی دووهم گشـتییه و بـه نـاوی ناسێنهر (لـ)، که ئاماژه به گشتاندن دهکات.

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ٢/ ١٤٠.

ئه‌وه‌ی مه‌به‌سته ئه‌وه‌یه که ته‌کفیر کردنی زیاده‌ڕۆچووان بۆ زانایان، به‌هۆی ورده‌کاری کردنه‌که‌یانه بۆ ئایه‌تی، وه‌ك ته‌کفیری زانایانه بۆ ئه‌و که‌سه‌ی ئایه‌تی یه‌کەم نه‌گشتێنێ.

هه‌مووان له هه‌ویری ته‌کفیر ده‌پێژن و لێی ده‌خۆن.

ئه‌گه‌ر نوێگه‌ریه‌کی گشتگیریش نه‌کرێ بۆ هزری ناوخۆیی، کرانه‌وه به‌ڕووی هزری گشتی ئیسلامی و فه‌لسه‌فه‌ی ئیسلامی ڕوونه‌دات، ئه‌وا ده‌رده‌که هه‌ر ده‌مێنێ، هه‌موانیش به‌شدارن له هه‌ویر شێلان و پێژتن و خواردنه‌که‌دا.

## نموونه‌ی ( ١٤ ): ته‌کفیر و به‌بیدعه‌چی دانان و هۆشداریدان!

هۆشداریدان له ته‌ریقه‌ت و مه‌زهه‌به سۆفییه‌کانی تیجانی و قادری و شیعه و ئیبازی و بیرلویه و نه‌ته‌وه‌ییه‌کان، به ئه‌ندازه‌ی ته‌کفیرکردنیان و دوژمنایه‌تی کردنیان و بانگه‌وازی کردن بۆ ڕق لێبوونه‌وه‌یان... تاد، ئه‌مه گه‌لێك زۆرن[1].

## نموونه‌ی ( ١٥ ): حه‌ڕام کردنی کردنه‌وه‌ی قوتابخانه بیانیه‌کان! حه‌ڕام کردنی شوێن به کرێ گرتن بۆ سه‌رپه‌رشتیاره‌کانی!

لیژنه‌که پێی وایه کردنه‌وه‌ی قوتابخانه بیانیه‌کان له وڵاتانی موسڵماندا و به‌کرێگرتن و به‌کرێدانی بینایه پێیان حه‌ڕامه... تاد[2].

(١)فتاوى الشرعية، جمع الجريسي، چه‌ند لاپه‌ڕه‌یه‌کی بۆ ئه‌م بابه‌ته تایبه‌ت کردووه ١٥٥ - ١٨٢.

(٢)فتاوى اللجنة الدائمة نقلا من كتاب الجريسي: ١٨٩.

## نموونەی ( ١٦ ): گومڕاکردنی ئەشعەرییەکان و بەبیدعەچی هەژمارکردنیان

لیژنەکـە ئەشـعەرییەکانی لـە ئـەهلی سـوننە دەرهێنـاوە[1]. لـە کاتێکـدا ئەشعەرییەکان زۆرینەی ئەهلی سوننەت، هەموو زانایانی شام و میسڕ و عێڕاق و مەغریب ئەشعەرین.

لەگەڵ ئەوەی لەم بە بیدعەچی دانانە گشتییە چەند شتێك کەڵەکە دەبن، لە فـەرمانکردن بــە ڕق لێبوونــەوەیان و بوغزانــدنیان و سەرزەنشــتکردنیان و دوورکەوتنـەوە لێیـان... تـاد، ئەمـەش سەردەکێشێ بـۆ کاردانـەوەی پێچـەوانەوە و دژایەتی کۆتا نەهاتوو.

## نموونەی ( ١٧ ): نوێژ لە دوای کەسی هاوبەشدانەر دروست نییە!

لیژنەکە فەتوای داوە؛ بەوەی دروست نییە، نوێژ لە دوای ئەو کەسە بکرێ، کە هاوبەشی گەورەی بۆ خوا بڕیار داوە!![2].

دەڵێم: شتێکی زانراوە؛ هیچ کەسێك نییە لە سەر ڕووی زەوی هاوبەشی مـەزنی بۆ خوا بڕیار دابێ و پێشنوێژیش بکات بۆ موسڵمانان!، کەواتـە ئەمـە یەکێکە لە فەتوایە جفرەدارەکان، مەبەست لە هاوبەشدانەر لێرەدا: ئەبو جەهل و هاووێنەکانی نییە، بەڵکو موسڵمانی خاوەن مەزهەبی ترە، وەك: سۆفی و شیعە...

---

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ٣/ ١٧٤.

(٢)فتاوى اللجنة الدائمة: ١/ ٥٢٢.

**نموونەی (١٨): ئەوەی لە ئایین بە پێویست زانراوە و دەقی ڕاست و دروست!**

لیژنەی هەمیشەی خۆی لادا لە وەڵامدانەوە، کاتێك کەسێك پرسیاری لە لیژنەکە کرد لەبارەی زانا پێشووەکان، کە بەپێی دیدی وەهابییەت دەکرێ تەکفیر بکرێن، کاتێك کەسێك پرسیارێکی جوانی کرد، ئەمەش ناوەڕۆکەکەیەتی، ئەوەی ئێوە ناوی دەنێن هاوبەشدانان لە جیهانی ئیسلامیدا هاوبەشدانان نییە، چونکە تەنها کەسانێك ئەم کارانە دەکەن، کە نەزان بێ، نەزانیش یەکێکە لە پەرچەکانی تەکفیر، یاخود زانایەکی تەئولیکارە، تەئویل و لێکدانەوەش ڕێگرە لە تەکفیر، دواتر پرسیارکەرەکە نموونەیەکی لەسەر ئەمە هێناوەتەوە.

ئەمەی خوارەوە وەڵامی لیژنەکەیە:

((ئەو هەڵەکارە پاساوی هەیە، کە هەڵەی کردووە لە پرسە تیۆرە کۆششکاری "إجتهاد"یەکان، نەوەك ئەوەی هەڵەی کردووە لە شتێکدا، کە بەدەقی ڕاشکاو چەسپاوە و ئەوەی زانینی لە ئاییندا بە پێویست دانراوە))[1].

دەڵێم: بەڵام بابەتی ((دەقی ڕاشکاو)) و ((ئەوەی لە ئاییندا بە پێویست دانراوە))، لەلای ئێوە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لای ئەوانی تر. ئەوەی ئێوە بە دەقێکی ڕاشکاو دەیبینن، ئەوا جگە لە ئێوە بە دەقێکی لاواز یان تایبەتکەر یان هەڵوەشاوە دەیبینێ. ئەوەی ئێوە پێتان وایە زانینی لە ئاییندا بەپێویست دانراوە، دژەڕای ئێوە پێی وانییە زانینی لە ئاییندا بەپێویست دانرابێ.

دژەڕای ئێوە دەتوانێ پێتان بڵێ: (حەڕامی خوێنی موسڵمان زانینی لە ئاییندا بەپێویست زانراوە، ئێوەش حەڵاڵی دەکەن، کەواتە ئێوە کافر و بێ باوەڕن، دەقەکان لەم بارەوە ڕاشکاون، ئێوەش لێکدانەوە و تەئویلی بۆ دەکەن، کەواتە ئێوە بێ باوەڕ و

(١)فتاوی اللجنة الدائمة: ٢/ ٩٢.

کافرن)؛ هەر بۆیە نابێ پەلە بکرێ و زوو بڕیار بدرێ، کە ئەمە لە ئایندا بەپێویست زانراوە یان بەپێی بەڵگە یەکلاکراوەتەوە.

بەڵکو بەم بنەمایەی ئێوە داتانناوە، زیادەڕۆچووان و توندڕەوان ئێوەیان تەکفیر کردووە.

دەبێ ئەوە قبوڵ بکرێ، کە هەر دەقێك کە لەلای ئێوە ڕاست و دروست بوو، مانای وا نییە لەلای جگە لە ئێوەش ڕاست دروستە.

ئەوەش کە پێتان وایە لە ئایندا بەپێویست زانراوە، لەوانەیە جگە لە ئێوە بە پێچەوانەی ببینێ.

لەوانەیە ئەوانەی ئێوە تەکفیر دەکەن یان دژەڕاکانتان، بەم بنەمایەتان ئێوە پابەند بکەن و تەکفیرتان بکەن.

دەقی ڕاست بۆ نموونە بریتییە لە دیاریکردنی ئەوەی ڕاست بووە، بەڵام ئەوەی ڕاست نەبووە، ئەوا ڕاجیایی و قوتابخانەی جیاوازی لەبارەوە هەیە، تەنانەت لە ناو خودی پێکهاتەی فەرمووودەناسانیش... (لەوانەیە پاشکۆیەك لەم بارەوە بنووسین).

ئامۆژگاریمان بۆ ڕەوتی زیادەڕۆچوو، ئەوەیە فراوانکاری بکەن بۆ ئاسۆکانی ژیری، ئاشنا ببن بەوەی یەکدەنگی لەسەرە لە نێوان موسڵمانان، ئەو شتانەش بناسن کە ڕاجیایی لەسەرە. ئەو شتەی زانایانی مەزهەب لەسەر یەکدەنگن، مانای وانییە ئوممەت لەسەری یەکدەنگە، دەبێ قوتابخانە هزری و کۆششکارییەکان هەرس بکەن. با واگومان نەبەن کە تەنها خۆیان لەم دونیایەدان... با بابەتە لێبڕاوەکان کەم بکەنەوە و بابەتە لێنەبڕاوەکان زیاد بکەن و هەندێکیان پەسەند بکەن، بێ سوربوون لەسەری، تەنها لەو دەقانەدا نەبێ، کە ئاماژەی سەلمێنراویان هەیە، لە ڕووی چەسپاویشەوە سەلمێنراون، یان لەوەی موسڵمانان لەسەری کۆکن لە فەرمان و ڕێگری.

### ئا لێرەوە بەرپرسیارێتی ئومەت دێت

ئەرکی دەوڵەت لێرەدا بریتییە لە فراوانکردنی ژیری و عەقڵی گەنجان، بە لەخۆگرتنی ڕاقە و مەزهەب و کۆشش و بۆچوونە جیاوازەکان، دەستهەڵگرتن لە توونـد و تیـژی بـۆ سەرخستنی بیرۆکە یان ڕەوتێك بەسەر ئەوەی تردا؛ چونکە هەمووان بە دەوری یەك ئایندا دەخولێنەوە، بەڵام خوێندنەوەکان جیاوازن، کەواتە خوێندنەوە مەکەن بە ئایین، تێگەیشتنیش مەکەن بە شەرع.

**نموونەی (١٩):**

لیژنەی هەمیشەیی فەتوایدا بەوەی ئاژەڵ سەربڕین بە بۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر، هاوبەشدانانە و دروست نییە گۆشتی ئەم بۆنەیە بخورێ))[1].

دەڵێم: هەر چەندە ئاژەڵ سەبڕین، لەم بۆنەیەدا تەنها، بریتییە لە ئاهەنگێڕان و خۆشی و شادی دەربڕین، بە لە دایکبوونی پێغەمبەر، جا هاوبەشدانان لە کوێدایە؟! ئەم بۆنەیە وەك سەرجەم بۆنەکانی ترە... ڕۆژی نیشتمانی گەورەتر و بەڕێزتر نییە لەم ڕۆژە... لەگەڵ ئەمەشدا شتێکی سروشتییە ئاهەنگ و ئاژەڵ سەربڕین لێرەدا ئەنجام بدرێ لەم بۆنەیە یان بۆنەی تردا... ئایا لەخوا ناترسن لە بەشینەوەی ئەم حوکمە مەزنانە بەسەر موسڵماناندا؟!

ئەوەی ئەم ئاژەڵە سەردەبڕێ بە بۆنەی لەدایك بوونی پێغەمبەرەوە، ئەوا بەم کارەی مەبەستی نییە پێغەمبەر بکاتە پەرستراو و خوا!، بەڵکو ئەمە خۆشی و شادی دەربڕینە وەك گشت بۆنەکانی تر... جا ئەم وشکی و ڕەقییە بۆچی.

(١)فتاوی اللجنة الدائمة: ١/ ١٣٤.

## نموونەی (٢٠): حەرامی گەشت کردن بۆ شام و میسر و عێراق!

گەشتکردن بۆ وڵاتی هاوبەشدانەران، لەلای لیژنەی هەمیشەیی و هەندێك زانایانەوە حەرامە، تەنها بە چەند مەرجێکی سەخت نەبێ دروست نییە، تەنها ئەوەندە بەس نییە گەشتیار بتوانێ نوێژەکانی بکات و بڕواتە مزگەوت، بەڵکو دەبێ ((گەشتیار بەری بوون و دوژمنایەتی خۆی بۆ هەر کافر و بێ باوەڕێکی ئەوێ دەربڕێ!))، گەشتکردن بۆ وڵاتی بێ باوەڕ و کافرەکان بە مەبەستی گەشت و سەیران دروست نییە، مەگەر بە پاساوێکی شەرعی ڕۆشنەوە نەبێ، شێخ فەوزان پێی وایە ئەوەی لە گەشت دەگەڕێتەوە باش نییە میواندارى بکرێ ((بەڵکو پێویستە دوورە پەرێزی لێبکرێ بۆ ئەوەی خۆی و هاوشێوەکانی تەمبێ بکرێن))[1]!.

بۆ زانیاری وڵاتی هاوبەشدانەران – لەلای وەهابییە بەراییەکان – لەم سەدەیەدا تا ساڵی ١٣٩٠ك، گەشتکردنی بۆ ئەم شوێنانەشی دەگرتەوە: میسر و عێراق و شام و کوێت و ئیمارات و گشت وڵاتانی کەنداو، هەموو ئەو دەوڵەتانە، دەوڵەتی هاوبەشدانان و کوفرن. لە چەند توێژینەوەیەکی پێشووتردا بە فراوانی باسمان لەمانە کردووە. وتەی زانایان لەبارەی ئەو دەوڵەتانەی حوکم بەشەریعەت ناکەن بەوەی دەوڵەتی کوفرن، ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەم حوکمە هێشتا گشتگیرە لەلای هەندێك زانایان، بۆ نموونە فەوزان، ناوبراو لە فەتواکانیدا بە ڕاشکاوانە وتویەتی: ئەو دەوڵەتانەی بە دەوڵەتە ئیسلامییەکان ناودەبرێن، دەوڵەتی ئیسلامی نین (ئەم فەتوایەی فەوزان، لە میانەی فەتوایە تاکەکەسییەکانیدا دەخرێتەڕوو).

---

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ٢/ ٩٢.

**نموونەی ( ٢١ ): سڵاوی ئاڵا هاوبەشدانانە!**

لیژنەکە سڵاوی ئاڵا بە حەرام داناوە، پێی وایە بیدعەیەکی داهێنراوە، پێی وایە وەستان لەبەردەم ئاڵا و بە گەورەگرتنی دروست نییە، چونکە خۆچوواندنە بە هاووبەشدانەران، یەکێکە لە پاڵنەرەکانی هاوبەشدانان، کە دژ و پێچەوانەی یەکخواناسییە))[1]!

دەڵێم: ئەو فەتوایانەی سەبارەت بە سڵاوی ئاڵا و سڵاوی سەربازی، تەکفیرکارەکانی دەوڵەت لەم زانایانەیان وەرگرتووە، لە ریزی ئەو بەڵگانەیان داناوە کە ئاماژەن بۆ کوفر و بێ باوەڕی دەوڵەتی سعودییە، هەروەك پێشتر لە لێکۆڵینەوەکەماندا لەبارەی (کتێبە زیادەڕۆچووە هاوچەرخەکان) خستومانەتەڕوو.

**نموونەی ( ٢٢ ): حەرام کردنی ئاهەنگێران بە بۆنە ئیسلامییەکان!**

حەرام کردنی بۆنە ئاینیەکان، وەك: ئیسرا و میعراج، لەدایکبوونی پێغەمبەر، کۆچ، هێرشکردنەسەر خاوەنەکانی بەوەی بیدعەچی و گومڕان، هەروەها بۆنە نیشتمانییەکان و جگە لەوانیش، جەژنە گشتییەکان، وەك: جەژنی دایك و جەژنی خۆشەویستی، ئەم فەتوایانە ئەوەندە زۆرن لە ژمار نایەن[2]. لەگەڵ ئەوەی لە هەمان سەرچاوەدا بە دروستیان زانیوە ئاهەنگ بگێڕدرێ بە هەفتەی مزگەوتەکان، هەفتەی هاتوچۆ، هەفتەی شێخ محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب، هاوشێوەکانی... ئەمەش تێکگیرانە.

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ١/ ١٤٩، ١٥٠.

(٢) بۆ نموونە بڕوانە: الفتاوى الشرعية ٣٦١ و لاپەڕەکانی دواتری.

دواتر لە نامەکانی شێخ ئیبن بازدا هاتووە، پیرۆزبایی بە بۆنەی ساڵی نوێی کۆچی وەرگرتووە و پیرۆزباییشی بەم بۆنەیەوە ناردووە، ئەمە بەپێی پێوانەی ئەوان بێ بیدعەیە، بەڵام هەندێك جار تێکدەگیرێن.

**نموونەی ( ٢٣ ): حەڕام کردنی فیلم کارتۆنی ئیسلامی**

لە ناو فەتواکانی لیژنەی هەمیشەییدا فیلم کارتۆنی ئیسلامی حەڕام کراوە[١]، ئەی چی سەبارەت بە نا ئیسلامییەکان؟!

**نموونەی ( ٢٤ ): وێنە لە کتێبەکانی قوتابخەکاندا حەڕامە، ئەگەر لەبارەی چۆنیەتی دەستنوێژیش بێ!**

هەمان لیژنە کۆششی کرد بۆ لادانی گومانی ئەوەی پێی وایە وێنەی تیشکی دروستە[٢]، جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی دروست نییە وێنەکان بڵاو بکرێنەوە، ئەگەر بۆ بانگەوازیش بێ، نابێ وێنەی فێرکاری بۆ دەستنوێژگران و نوێژخوێنان بڵاو بکرێتەوە، چونکە ڕاستی بە حەڕام بڵاو ناکرێتەوە، ئامانج پاساو بە هۆکار و ئامرازەکان نادات[٣]، وێنە ڕۆشنکەرەوەکان لە وانەی خوێندکاراندا دروست نییە، چونکە پێشینە چاکەکان بەبێ ئەم وێنانە فێربوونە[٤]. کاتێك یەکێك لە مامۆستایان پرسیارێکی ئاڕاستەی لیژنەکە کرد، بە وێنەگرتنی قوتابیان لە گەشتێکدا یان

(١)الفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ٤٣٨.

(٢)فتاوى اللجنة الدائمة: ١/ ٤٦٢ - ٤٦٣.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١/ ٤٨٤.

(٤) هەمان سەرچاوە: ١/ ٤٧١.

هاوشێوەکەی، ئایا دروست یان نا، لیژنەکە وەڵامی دایەوە وێنەگرتن یەکێکە لە گوناهە گەورەکان و هۆکارێکە بۆ هاوبەشدانان، گوێڕایەڵی کەسێك ناکرێ لە سەرپێچی خوای بەدیهێنەردا[1].لیژنەکە فەتوایدا بەوەی دروست نییە گیاندارەکان وێنەیان بگیرێ بۆ فێرکردنی قوتابیان، جا چ دڕندەکان یان جانەوەرەکان بن، دروست نییە وێنەیان بگیرێ لە کتێبەکانی زانست و زیندەوەرزانی و پزیشکی و کشتوکاڵی جگە لەوانیش، مەگەر بۆ پێویستی نەبێ[2]. فەتوایداوە بە حەرام بوونی کارکردن لە شوێنەکانی وێنەگرتن[3]، فرۆشتنی ئامێرەکانی وێنەگرتن، مەگەر فرۆشیار بزانێ، کڕیار بەکاری ناهێنێ بۆ وێنەگرتنی گیاندارەکان[4]، حەرامکردنی زنجیرە دراما ئاینییەکان[5]، چ جای ئەوانی تر.

### نموونەی (٢٥): فەرمانبەری بانك نەفرین لێکراوە، ئەگەر پاسەوانیش بێ!

لیژنەی هەمیشەیی فەتوایداوە، بەوەی هەر کەسێك کار لە بانکە سووکارەکان بکات، ئەگەر شوفێر یان پاسەوان یاخود چایەچییش بێ، ئەوا بەشدارە لە کارەکەیاندا، لەژێر هەڕەشەی نەفرین و دوورخرانەوەدایە لە ڕەحمەتی خوا[6].

---

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ١/ ٤٥٤.

(٢) هەمان سەرچاوە: ١/ ٤٧١ — ٤٧٢.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١/ ٤٩٨.

(٤) هەمان سەرچاوە: ١/ ٤٩٠.

(٥) هەمان سەرچاوە: ١/ ١٩٧.

(٦) هەمان سەرچاوە: ١٥/ ٣٨، الفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ١١٩٦.

**نموونە (٢٦): چاککردنەوەی بانکەکان حەرامە!**

لیژنەکە فەتوایداوە بە حەرام بوونی چاککردنەوەی بانکەکان! ئەو کرێکارانەیان بە گوناهبار داناوە، کە ئەم کارە دەکەن! بەهەمان شێوە حەرامی کردووە ئامێرەکانی بانکەکان چاك بکرێنەوە و کەل و پەلیان پێ بفرۆشرێ و جگە لەمانەش[١].

**نموونەی (٢٧): بەکرێدانی خانوو بە بانك حەرامە!**

لیژنەی هەمیشەیی فەتوایداوە، بەوەی دروست نییە خانوو بەکرێدان بە بانك حەرامە... پارەی کرێیەکەشی لەم دۆخەدا حەرامە[٢].

**نموونەی (٢٨): دوکان بەکرێدان بۆ سەرتاشین یان وێنەگری حەرامە!**

دروست نییە دوکان بەکرێ بدرێتە سەرتاشەکان — کە ڕیش دەتاشن — و وێنەگران[٣].

**نموونەی ( ٢٩ ): بەکرێدانی دوکان بە شتە خۆراکییەکان حەرامە!**

دروستت نییە دوکان بەکرێ بدرێتە جگەرە فرۆشان و گۆڤارە ڕووت و قوتەکان[٤].

دەڵێم: هەموو دوکان و بازارەکان جگەرە و گۆڤار دەفرۆشن، کە ئێوە پێتان وایە ڕووت و قوتن... تاد.

---

(١)فتاوى اللجنة الدائمة: ١٥/ ٦٣.

(٢) هەمان سەرچاوە: ١٥/ ٣٦.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١٤/ ٤٤٤.

(٤) هەمان سەرچاوە: ١٤/ ٤٤٧.

بڕوانە چۆن شوێنکەوتووانی ئەم فەتوایانە، جیا دەبنەوە لە کۆمەڵگە، پێیان وادەبێ کۆمەڵگەیەکی نەفامین؟.

ئەم فەتوایە لەسەر مێزەکەیە، نەوەك لە ژێرەوەی بێ، بە چاودێریەکی فەرمییە، ئینجا دێین و قسە دەکەین لەبارەی نامۆیی گەنجان لە کۆمەڵگەدا لە ڕووی دەروونی و هزریەوە...؟!!

**نموونەی ( ٣٠ ): سەیرکردنی یارییە وەرزشییەکان حەرامە!**

لیژنەکە فەتوایدا بە حەرام بوونی سەیرکردنە یارییە وەرزشییەکان، دوای ئەوەی چەند مەرجێکی سەختی دانا، لە داپۆشینی شەرمگە "عەورەت"ەکان (مەبەستیان ڕانە، کە ڕاجیایی تێدایە)، دەبێ ئامێرەکانی ڕابوردنی تێدا نەبێ، نابێ لەسەر خەڵات بێ... تاد[1]. بە پوختی فەتوایان داوە یاریەکان بەم جۆرەی کە ئێستا هەیە حەرامە.

**نموونەی ( ٣١ ): حەرامی هاوسەرگیری کردن لەگەڵ شیعە، ئەگەر کراش ئەوا دەبێ هەڵبوەشێنرێتەوە، چونکە هاوبەشدانەرن!**

لیژنەی هەمیشەیی فەتوایداوە، بە حەرام بوونی هاوسەرگیری لەگەڵ شیعەکاندا، ئەگەر ئەمەش کرا، ئەوا دەبێ هەڵبوەشێنرێتەوە، چونکە زانراوە هاوبەشدانانی مەزن ئەنجام دەدەن[2]!!.

دەڵێم: ئایا شوێنەواری ئەم فەتوایە چییە لە سەر موسڵمانان لە شیعە و سوننە؟.

لە عێراق و لوبنان و سوریا... ئەوانەی کە جیاوازی لە نێوان و کەسی شیعە و سوننەدا ناکەن...؟!

(١) هەمان سەرچاوە: ١٥/ ٢٣٨.

(٢) هەمان سەرچاوە: ١٨/ ٣١٣.

## نموونەی ( ٣٢ ): چارەسەرکردنی ژن لە ئەستۆی پیاودا نییە!

لیژنەکە فەتوایداوە، بەوەی لەسەر مێرد پێویست نییە چارەسەری ژنەکەی بکات[(١)].

## نموونەی ( ٣٣ ): بیمەکردن

سەبارەت بە فەتوای حەرامکردنی بیمەکردن، تەنها ئەوە نەبێ لە چەند سنوورێکی بەرتەسکدا ڕێگەیان پێدراوە، لەم بارەوە بڕوانە ئەوانەی لە فەتوایە شەرعییەکاندا هاتووە[(٢)].

## نموونەی ( ٣٤ ): حەرامکردنی فرافیرە!

تەنانەت یاری (فرافیرە) لەلای لیژنەکە حەرامە[(٣)].

## نموونەی ( ٣٥ ): حەرامکردنی یاری پەڕەکان

لیژنەکە فەتوایدا بە حەرام کردنی یاری (پەڕەکان)، تەنانەت ئەگەر قوماریشی تێدا نەبێ، بەڵگەی لیژنەکە ئەوەیە دەبێتە هۆی کات بەسەربردن و لەوانەیە ڕق و کینە ببەشێتەوە[(٤)].

دەڵێم: ئەمە لەسەر گشت یارییەکان جێبەجێ دەبێ.

## نموونەی ( ٣٦ ): حەرام کردنی یاری بۆکیمۆن!

لە فەتوایەکی دوور و درێژدا لیژنەکە یاری بۆکیمۆنی حەرام کردووە[(٥)].

---

(١) هەمان سەرچاوە: ١٤/ ٤٤٧.

(٢)الفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ١٢٠١ - ١٢١٥.

(٣)الفتاوى الشرعية: ١٥٧٨.

(٤)فتاوى اللجنة الدائمة: ١٥/ ٢٣٨.

(٥)الفتاوى الشرعية: ١٥٨٢.

**نموونەی ( ٣٧ ): حەرام کردنی زنجیرە درامای تاش ماتاش!**

لیژنەی هەمیشەیی فەتوایداوە بە حەرام بوونی سەیرکردنی زنجیرە درامای "تاش ما تاش"، لە فەتوایەکی دوور و درێژ و نامۆدا ئەمە ڕوون کراوەتەوە! لە دیارترین هۆکارەکانی فەتواکە، هەروەك لیژنەکە وتویەتی ئەمانە:

گاڵتەکردن بە خێرخوازان! دانانی ڕیشی دەستکرد! لاساییکرنەوەی شێوەزارەکانی وڵاتان!، لیژنەکە وەسفی زنجیرە دراماکەی کردووە بەوەی: ((پەستی و نزمی بڵاو دەکاتەوە و گاڵتە بە هەندێك شتتی ئایین دەکات... تاد))[1].

**نموونەی ( ٣٨ ): ماچکردنی قورئان حەرامە!**

ماچکردنی قورئان حەرامە، چونکە بیدعەیە[2].

**نموونەی ( ٣٩ ): لەوەتەی هەزار ساڵە هاوبەشدانان لە مزگەوتی پێغەمبەردا بوونی هەیە!**

لیژنەی هەمیشەیی فەتوایداوە، بەوەی گومبەتی سەر گۆڕی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) حەرامە، یەکێکە لە هۆکار و ئامرازەکانی هاوبەشدانان[3].

دەڵێم: ئەمە بوێری نواندنە بەرامبەر پێگەی پێغەمبەرایەتی، چونك دەبێ هاوبەشدانان لە دوورگەی عەرەبیدا نەمابێ تەنها لە پاڵ پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) نەبێ؟ ئەم سەغڵەتبوونە بە گومبەتەکان هیچ پاڵپشتێکی نییە لە دەقی ڕاست و دروست، لە ناو هاوەڵان و شوێنکەوتووان هەبووە، لەسەر گۆڕی خزمەکانی تەلارێکی بچوك یان نەقشێك یاخود هاوشێوەی دروستکردووە. ئەمە بەگوێرەی

(١)الفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ١٦٠٠، رقم الفتوى ٢١٦٨٥، لە ٧ مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٤٢١ك.

(٢)الفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ٤١٨.

(٣)فتاوى اللجنة الدائمة: ٩/ ٨٢.

تێپەڕینی کات گەشەی کردووە، پێویست بەم هەستیارییە ناکات، تەنها لە پێناو سەرخستنی بۆچوونێکی محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب.

ئەگەر یەکێك لە ئەندامانی لیژنەی هەمیشەیی بڵێ: لەوەتەی هەزار ساڵ یان زیاترە هاوبەشدانان لەناونەچووە لە پاڵ پێغەمبەردا؟! ئەوا بەم پێیە ئەو شوێنەی هاوبەشدانانی تێدایە دەبێ ببوغزێنرێ، لە خراپترین شوێنەکانیش دەبێ، هەروەك ئەو شوێنەش کە هاوبەشدانانی تێدا نییە لە خۆشەویسترین شوێنەکان دەبێ لەلای خوا و باوەڕداران.

ئەم پێشێلکردنە و بێ ڕێزییە بەرامبەر بە پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) — ئەگەر بەو مەبەستەش نەبێ — هەموو موسڵمانان تورە دەکات. خوای مەزن لە لیژنەکە ببورێ، لە مردووانی خۆشبێ و زیندووانیشی بەرەو هاوسەنگی و میانڕەوی ڕێنوێنی بکات.

## نموونەی (٤٠): حەرام کردنی لەبەرکردنی پێڵاوی پاژنە بەرز لەلایەن ئافرەتەوە

(پرسیار: حوکمی لەبەرکردنی پێڵاوی پاژنە بەرز لەلایەن ئافرەتەوە و بۆیاغکردنی نینۆکەکان چییە؟

وەڵامەکە ئەوەیە: لەبەرکردنی پێڵاوی پاژنە بەرز لەلایەن ئافرەتەوە دروست نییە، چونکە لەوانەیە ذووچاری بەربوونەوەی بکات (!!!!!)، بەپێی شەرع مرۆڤ فەرمانی پێکراوە خۆی لە مەترسییەکان دووربگرێ (!!!!!)، وەك: گشتگیری ئەم فەرمایشتەی خوای مەزن: ﴿... تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ... ﴿١٩٥﴾﴾ البقرة. واتە: (...بەدەستی خۆتان، خۆتان بەرەو تیاچوون مەبەن... ).

﴿...وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ... ﴿٢٩﴾﴾ النساء. واته : (...خۆتان مەکوژن...).

هەروەك — پێڵاوی پاژنە بەرز — باڵابەرزی ئافرەت زیاد لە سروشتی خۆی دەردەخات (!!!!!!). لەمەشدا دەرخستنی بەشێك لە جوانیە ، کە ڕێگە لێگیراوە لەوەی

ئافره‌تی باوه‌ڕدار ده‌ریبخات ، به‌پێی ئه‌م فه‌رمایشته‌ی خوای پاك و به‌رز: ﴿ ...وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ ...﴿٣١﴾ ﴾النور . واته: (...جوانی و زینه‌تی خۆیان ده‌رنه‌خه‌ن به‌ته‌واوی بۆ هاوسه‌ره‌كانیان نه‌بێت ، یان باوكی خۆیان... ) . سه‌بارەت به بۆیاغكردنی نینۆكه‌كان، ئه‌وا دروست نییه بۆی، چونكه ڕێگه ده‌گرێ له گه‌یشتنی ئاو به نینۆكه‌كان و شۆردنی ئه‌نجام نادرێ[1].

(١)اللجنة الدائمة للبحوث العلمية، فتوى رقم ١٦٧٨.

## پوختەی قسە لەسەر فەتواکانی لیژنەی هەمیشەیی

ئا بەم شێوەیە چەند نموونەیەکمان هەڵهێنجا، لە فەتواکانی لیژنەی هەمیشەیی لە بوارەکانی بیروباوەڕ و حوکمەکاندا، ویستمان کورتبڕ بێ، نەمانویست فەتوایە هاوشێوەکان بگوازمەوە – هەروەك پێشتر خرایەڕوو، دووبارە بوونەوە بنچینەیە تیایاندا –، نەمانویست توێژینەوەکە گران بکەین بە دووبارە کردنەوە، سەرباری ئەوەی خوێندنەوەی ئەم کتێبانە کاتی زۆری ویستووە. ئەگەر هاوسەنگیەکی ڕاست یان گشتی هەڵنەوەشاوە بەشتێکی تایبەتمان بینبێ ئەوا باسمان دەکرد.

بینیتان ئەم فەتوا و ڕا و بۆچوونانە هەموویان زیادەڕۆچوونێکی زۆر و دووربوون لە واقیع و هاوچەرخێتی بەدەستەوە دەدەن. یەکێك لە هۆکارەکانی ئەم زیادەڕۆچوون و توندڕەوەییە، بریتییە لە نامۆبوونی گەنجان و دابڕانی دەروونیان لە کۆمەڵگە، بە سوك و کەم سەیرکردنی کۆمەڵگەیە. نەمانویست سەرنج و ڕوونکردنەوە لەسەر گشت فەتواکان بدەم، چونکە زۆربەیان پێویستیان بە ڕوونکردنەوە نییە.

ئێستا دەڕۆینە سەر فەتوایە تاکەکەسییەکان، دوای ئەوەی فەتوایە کۆمەڵیەکەمان بینی، کە پێویست بوو هاوسەنگ و میانڕەو ئارامتر بووبان، کەواتە ئەوەمان لا نامۆ نییە شتێك لە تاکێکی ئەم زانایانەوە دەربچێ، کە پاڵپشتی زیادەڕۆچوون بکات.

## دووەم: فەتوایە تاکە کەسییەکان

### فەتواکانی شێخ ئیبن جبرین

ئەندامی لیژنەی فەتوایە

١- حەرامی بەدیاری بەخشینی گوڵ

ئیبن جبرین فەتوای داوە بە حەرام بوونی بە دیاری بەخشینی گوڵ، گوایە لاساییکردنەوەی کوێرانەی کافر و بێ باوەڕەکانە!.

ئەمەش دەقی فەتوایە: ((پرسیار: پرسیار لە بەڕێزتان دەکەم؛ سەبارەت بە دیاردەیەك، کە ڕووی لە زیادبوون کردووە لە ناو نەخۆشخانەکاندا، ئەم دیاردەیە دزەی کردووەتە ناو کۆمەڵگەی موسڵمان، لە کۆمەڵگە بێ باوەڕەکانی خۆرئاوایی بۆمان گوازراوەتەوە، ئەویش بریتییە لە بەدیاری بردنی گوڵ بۆ نەخۆشەکان، لەوانەیە بە نرخی گرانیش بکڕدرێن، جا ڕای ئێوە چییە سەبارەت بەم نەریتە؟

وەڵام: گومان لەوەدا نییە ئەم گوڵانە سوود و بایەخیان نییە، نە شیفا بۆ نەخۆشەکە دێنێ، نە ئێش و ئازارەکەی کەم دەکاتەوە، تەندروستی باشیشی بۆ ناهێنێ، نەخۆش و دەردیش ڕا نامالێ، تەنها بریتین لە ڕووەکی دەستکردی گوڵدار، بە دەست یان بە ئامێر دروست کراون، بە نرخێکی بەرز دەفرۆشرێن، دروستکەران قازانجی لێدەکەن، کڕیارەکان زیانی تێدا دەکەن.

ئەمە تەنها بریتییە لەلاساییکردنەوەیەکی کوێرانەی خۆرئاوا، بێ کەمترین بیرکردنەوە، ئەم گوڵانە بە نرخێکی زۆر گران دەکڕدرێن، یەك یان دوو کاتژمێر، یان ڕۆژێك یاخود دوو ڕۆژ لەلای نەخۆش دەمێننەوە، ئینجا بەبێ سوود لەگەڵ زبڵ و خاشاك فڕێ دەدرێن، وا باشترە نرخەکەی هەڵبگیرێ

و له‌شتی باش خه‌رج بکرێ كه سوودی بۆ دین یان دونیا هه‌بێ، جا هه‌ر كه‌سێك ببینێ یه‌كێك گوڵی دیاری ده‌كڕێ یان ده‌فرۆشێ، ئه‌وا ده‌بێ ئاگاداری بكاته‌وه، به‌ڵكو تۆبه بكات، واز له‌م كڕین و فرۆشتنه بهێنێ، كه زیانێكی دیاره))[1].

٢- سڵاوكردنی سه‌ربازی حه‌ڕامه

ئیبن جبرین: دروست نییه ده‌ست دابنرێته سه‌ر سه‌ر (سڵاوی سه‌ربازی بكرێ)[2].

٣- سه‌فه‌ركردن بۆ سه‌ر گۆڕی پێغه‌مبه‌ر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) حه‌ڕامه

پێی وایه سه‌فه‌ركردن بۆ سه‌ر گۆڕی پێغه‌مبه‌ر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) حه‌ڕامه!

به‌ڵكو ده‌بێ گه‌شتیار مه‌به‌ستی سه‌ره‌دانكردنی مزگه‌وتی پێغه‌مبه‌ر بێ![3].

٤- بڕینی شریت حه‌ڕامه

بڕینی شریت، كه له كاتی كردنه‌وه‌ی پڕۆژه‌یه‌ك یان دامه‌زراوه‌یان یان كه‌رتێكی گشتی ئه‌نجام ده‌درێ، له‌لای ئیبن جبرین بیدعه‌یه و لاساییكردنه‌وه‌ی بێ باوه‌ڕانه![4].

٥- پێی وایه ده‌بێ توندگیری له بابه‌ته بیروباوه‌ڕیه‌كان نه‌وه‌ك فیقهییه‌كان بگیرێته‌به‌ر

(١)اللؤلؤ المكين من فتاوى ابن جبرين: ٥٨.

(٢)الفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ٥٦١.

(٣) هه‌مان سه‌رچاوه ٤٠١.

(٤) هه‌مان سه‌رچاوه ٤٢٠.

ئیبن جبرین پێی وایە دەبێ لێبوردەیی هەبێ لە ڕاجاییە فیقهییەکاندا، توندگیری لە ڕاجیاییە بیروباوەڕییەکاندا هەبێ، وەك: وەستان لەسەر عەرش و سیفەتەکان... تاد[1].

دەڵێم: لەگەڵ ئەوەی لە پێشترە ئاسانکاری و لیبوردەیی لەو مەسەلانەدا بکرێ، کە توندگیری تیایاندا، دەبێتە هۆی بوغز و ڕق و کینە لە نێوان موسڵماناندا، وەك: بابەتە بیروباوەڕییەکان، ئەو ڕاجیاییەی موسڵمانان کە تیایدا داوا دەکەن توندگیری بگیرێتەبەر ئەم بابەتانەن، کەچی هەمان بیانوی ڕاجیایی فیقهی هەیە، لە ڕووی دروستی دەق یان ڕافەکەی یان هاوشێوەکەی.

### ٦- زنجیرە دراماکان دروستن، بەڵام حەرامن! :

ئیبن جبرین؛ مۆڵەتی داوە بە ڕوانینە زنجیرە دراماکان، بە چەند مەرجێك: لەوانە وێنەی ئافرەتانی تێدا نەبێ، گۆرانی و مۆسیقاشی تێدا نەبێ... [2].

دەڵێم: ئەم جۆرە زنجیرە درامایانە لە کوێدا بوونیان هەیە؟!

### ٧- تانەدان لە ڕەچەڵەکی نەوەی هاشم

ئیبن جبرین؛ تانە لە ڕەچەڵەکی نەوەی هاشم دەدات بە گشتی[3].

دەڵێم: لەگەڵ ئەوەی ڕێکخراوترین ڕەچەڵەکی عەرەبە، دەسەڵاتدار و زانا و ڕەچەڵەکناس و خەڵکی سادەش بەشداریان لە ڕێکخستنیدا کردووە. ئەم

(١) فەتواکانی: ٢٩٦.

(٢)الفتاوى الشرعية: ١٥٩٩.

(٣) هەمان سەرچاوە: ١٦١٧.

فەتوایە زۆربەی هاشمییەکانی لە شانشینەکەدا تووڕە کرد، کەلێنی نێوان هاشمییەکان و وەهابیەکان قووڵتر کردەوە.

## ٨- کەی نا موسڵمانان بە پاساودار دادەنێین؟!

ئیبن جبرین پاساو نادات بە کەسێك کە هەواڵی خراپی لەسەر ئیسلام و موسڵمانان بیستووە، ئەمەش ڕێگەی لێگرتووە لە هاتنە ناو ئاین، بەڵکو لەسەری پێویستە بە دوای ڕاستیدا بگەڕێ[1].

دەڵێم: ئەگەر یەکێك کۆششی کرد، لێکۆڵینەوەی ئەنجامدا، هەندێك فەتوای ئیبن جبرینی بەدی کرد، ئەمەش ڕێگری لێکرد ببێتە موسڵمان، ئایا پاساو و بیانوی هەیە یان نا؟.

لەلای ئیبن جبرین هیچ پاساوێکی نییە، بۆ نموونە لەلای زانایانی ئەزهەر پاساوی هەیە.

چیرۆکەکە بەردەوامە.

فەتوایەکە یەکە، بەڵام هەر تاقمێکی موسڵمانان پاساو بەکەس نادا، مەگەر ئەوە نەبێ کە شوێنی دەکەوێ.

زیادەڕۆچوونیش هەر زیادەڕۆچوونە. قەناعەتی نایە مەگەر بیرۆکە و هزرەکەی پەسەند بکەی و شوێنی بکەوی، ئەگەرنا تۆ کافری یان گوناهبارێکی کەمتەرخەمی.

زیادەڕۆچوون لە فەتواکانی ئیبن جبرین پێویستی بە قسەی زۆر نییە؛ لەگەڵ ئەوەی ئەگەر هاوسەنگیەکی ڕاشکاومان بینیبێ ئەوا باسی دەکەین.

---

(١) فتاوى وأحكام في نبي الله عيسى: ٧٩، جمع علي العماري.

## فەتواکانی شێخ ساڵح فەوزان

چالاکی هەیە لە دانان و نووسین و فەتوادان و وتاردانـدا، هـیچ کتێبێکـی بـەتاڵ نییـە لـە زیادەڕۆچـوون، جگـە لـە کتـێبی (المواریـث) نـەبێ، کـە نموونەیـەکی لـێ دەخرێتەڕوو. پێشتر هەندێك لە فەتواکانی ناوبراو خرانەڕوو، لە زۆربەی فەتواکانی پێشوودا (فەتواکانی لیژنـەی هەمیشـەیی فـەتوادان)دا بەشـدارە، هـەر بۆیـە پێویسـت ناکات زۆرێك لە فەتواکانی لێرەدا دووباره بخەینەڕوو، بەڵام پێویستە کتێبەکانی بە خێرایی بخرێنەڕوو و ئاماژە بە بابەتەکانی بکرێ.

شێخ فەوزان یەکێکە لە هەڵۆیەکانی وەهابییـەت، کـە زیـاتر لـە ٢٠ کتـێبی هـەن، خەریکە هیچیان بـەتاڵ نـەبن لـە زیادەڕۆچـوونی ئاشـکرا؛ دیـارترین کتێبـەکانی کـە زیادەڕۆچوونی تێدایە:

١. **الإرشاد إلى صحيح الإعتقاد والرد على أهل الشرك والإلحاد**

دەڵـێم: لـەم کتێبـە هـەموو ئەوانـەی وەهـابی نـین، تـەکفیر کـراون و بـە بیدعەچی دانـراون، هاوبەشدانەران، کە لە ناونیشانی کتێبەکەدا هاتووە، کاتێك کتێبەکــە دەخوێنیــەوە بــۆت دەردەکــەوێ تــەنها مەبەســتی موســڵمانانە، (خوانەناسان)یش کاتێك خوێنـەر بەرچاوی دەکـەوێ، وا هەسـت دەکـات شـێخ وەڵامی کـارڵ مـارکس یـان لیـنین دەداتـەوە... نـا وانییـە، بـەڵکو مەبەسـتی لـە (خوانەناسان) ئەشعەری و موعتەزیلە و ماتوریـدی و ئیبـازی و زەیدیەکانـە... تاد. ئەم ناونیشانانە (جفرەی نهێنین)، تـەنها ئەوانـە لێـی دەزانـن کـە لەسـەر مەزهەی وەهابیەتن، لەوانەیە لە خوێنەر تێکبچێ، نەزانێ مەبەستی کامەیـە، تەنها دوای ئەوە دەزانێ کە جفرە نهێنیەکان دەکاتەوە.

٢. **ڕاڤەی کتێبی ( العقيدة الواسطية )ی ئیبن تە یمییە ( وەك کتێبی پێشووە ).**

٣. **البيان في أخطاء بعض الكتاب**

نکۆڵی کراوە لە شتە تازە پەیدابووەکان، تەنانەت نکۆڵی کردووە لە سرودی ئیسلامی و شانۆگەری و کاری نواندن لە قوتابخانەکاندا... تاد.

٤. **مجموع محاضرات في الدعوة والعقيدة**

٥. **الخطب المنبرية**

٦. **من أعلام المجددين في الإسلام**

(لەم کتێبەدا زیادەڕۆچوون کراوە لە ئیبن تەیمییە و محەممەدی کوڕی عەبدولوەهابدا).

٧. **رسائل في مواضع مختلفة**

(ناونیشانەکەی بەم شێوەیە، هەمان شتی تێدایە، کە کتێبەکانی ڕابردوو تێیاندایە).

٨. **نقد كتاب الحلال و الحرام**

(ئەمە بەرپەرچی کتێبی حەڵاڵ و حەرامی قەرزاویە، قەرزاوی لەم کتێبەیدا گۆرانی و مۆسیقا و وێنەگرتن و هاوشێوەکانی بە مەرج بە حەڵاڵ داناوە).

٩. **ڕاڤەی کتێبی ( التوحيد )ی محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب**

١٠. **ڕاڤەی کتێبی ( كشف الشبهات )ی محەممەدی کوڕ عەبدولوەهاب**

١١. **التعقيب على ما ذكره الخطيب في حق الشيخ محمد بن عبدالوهاب...**

١٢. **كتاب التوحيد**

ئه‌مه به په‌یڕه‌وی خوێندن دانرا له قوتابخانه ناوه‌ندیه‌كان، له نزیكه‌ی ساڵی ١٤١٣ك! به‌ڵام ته‌نها ناوه‌كه‌یان سڕیوه‌ته‌وه! به‌مه‌ش قوتابی له قوناغه‌كانی فێركردنی گشتیدا فێری ته‌كفیر ده‌بن به ئاسانی، هه‌ر له ته‌مه‌نی ١٥ ساڵیه‌وه.

١٣. **كتاب التوحيد**

(له بنچینه‌دا ئه‌م كتێبه كۆمه‌ڵێك وتار و فه‌توان، كه له گۆڤاری بانگه‌واز بڵاوكراونه‌ته‌وه).

ده‌ڵێم: ئه‌مانه نموونه‌ی چه‌ند كتێبێكی ئه‌ون كه خوێندوومنه‌ته‌وه – جگه‌له كتێبی "**التعقيب على ما ذكره الخطيب**" نه‌بێ كه ده‌ستم نه‌كه‌وت –، له گشت ئه‌م كتێبانه‌دا زیاده‌ڕۆچوونی ڕاشكاوم بینی، تیایاندا ڕاشكاوانه ته‌كفیری ئه‌و موسڵمان و ڕه‌وت و مه‌زهه‌ب و حكومه‌تانه كراوه، كه دروست نییه ته‌كفیر بكرێ، تیایاندا ئه‌و كه‌سه به بیدعه‌چی دانراوه، كه بیدعه‌چی نییه، ئه‌و كه‌سه به گومڕا دانراوه كه گومڕا نییه.

زۆر ئه‌و شتانه‌ی باسی كردووه، ده‌چنه ناو هه‌ڵه یان شتی ناپه‌سه‌ند یاخود كۆشش و ئیجتهاده‌وه.

له‌وانه‌ی نكۆڵی كردنه‌كه‌ی بگاته ئاستی نكۆڵی كردن له ڕێپێدراو و سوننه‌تیش.

ئه‌گه‌ر وه‌ڵامی هه‌ڵه‌یه‌كی دابایه‌وه، ڕاستی بكردایه‌وه ئه‌وا كێشه‌یه‌ك نه‌ده‌بوو، به‌ڵام جار وایه هێرشه سه‌ر ڕێپێدراو یان ناپه‌سه‌ند یاخود هه‌ڵه ده‌كات و به هاوبه‌شدانان دایده‌نێت، ئه‌مه‌ش ئه‌وپه‌ڕی زیاده‌ڕۆچوونه.

## چەند نموونەیەکی ورد لە فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی شێخ ساڵح فەوزان

١- بەرپەرچی شێخ فەوزان بۆ کتێبی (هزیمة الفكر التكفيري)! خالید عەنبەری، وەسفی نووسەری ناوبراوی کردووە، بەوەی یەکێکە لە مورجیئەکان، بانگەوازی کردووە بۆ خۆ بەریکردن لێی![1].

دەڵێم: لەگەڵ ئەوەی عینبەری خۆیشی لە زیادەڕۆچووانە، هاوسەنگی نەنواندووە تەنها لە لایەنی سیاسیدا نەبێ، لەگەڵ بە تیۆری کردنی پەرچەکانی تەکفیر.

٢- خۆپیشاندانەکان حەرامن، بە پاساوی ئەوەی لە کاری موسڵمانان نییە[2].

٣- شێخ فەوزان؛ لە هەموو ئەندامانی لیژنەی هەمیشەیی و دەستەی گەورە زانایان، زیاتر ڕاشکاوانە تەکفیری حکومەت و دەوڵەتە ئیسلامییەکان کردووە[3].

٤- شێخ فەوزان؛ پێی وایە پەنهان کوشتن و گێرەشێوێنی لە خودی خۆیدا حەرام نییە! بەڵکو (بۆیە حەرامە، چونکە ئاشوب و خراپە و کوشتار بەسەر موسڵماناندا دێنێ)[4]. بۆ زانیاری ئەوانەی شایستەی کوژرانن لەلای فەوزان، ئەو موسڵمانانەن کە ئەو داخوازیانە جێبەجێ ناکەن کە پێشتر قسەمان لەسەر کردن!.

---

(١) الفتاوى الشرعية للجريسي: ٢٨٤.

(٢) الفتاوى الشرعية: ١٦٣٢.

(٣) بڕوانە فەتواکانی لەبارەی یەکخواناسی و لەبارەی مانای حوکم کردن بە جگە لەو بەرنامەیەی خوا دایبەزاندووە: ١١٦.

(٤) كلمات مضيئة لأصحاب الفضيلة العلماء في الإرهاب، جمع عمرو عبد المنعم سليم: ١١٣.

به‌م پێیه ئه‌گه‌ر په‌نهان کوژی، ئاشوب و خراپه به‌سه‌ر موسڵماناندا نه‌یه‌نێ، وه‌ك ئه‌وه‌ی کوژراو نه‌ناسراو بێ، ئه‌وا ئاساییه! ئه‌مه واتای فه‌تواکه‌یه نه‌وه‌ك ڕووکه‌شی فه‌تواکه...!

ئه‌مه به‌شێکه له جفره‌دارکردن، که زۆر خه‌ڵك لێی بێ ئاگایه... بۆ زانیاری په‌نهان کوشتنی بێ باوه‌ڕی جه‌نگاوه‌ر به‌شێکه له شه‌ڕ، قسه له‌سه‌ر ئه‌وه نییه، به‌ڵام کاتێك ده‌یخوێنیه‌وه به دروستیان زانیوه کافر په‌نهان کوژ بکرێ، ئه‌مه‌ش به‌پێی تێڕوانینی ئه‌وان هه‌موو موسڵمانان ده‌گرێته‌وه، مه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر ڕای ئه‌وان بێت.

ئه‌مانه ته‌نها چه‌ند نموونه‌یه‌کن، هیچ زیاده‌ڕۆچوونێك نییه پێشتر ڕوویدابێ، مه‌گه‌ر له‌لای شێخ ساڵح فه‌وزان باشترین به‌شی هه‌یه، به‌ڵام من له‌به‌ر دووباره نه‌بوونه‌وه ته‌نها ئه‌وه‌م باسکرد.

## لە فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی شێخ ئیبن عوسەیمین

بەر لە خستنەڕووی چەند نموونەیە لە زیادەڕۆچوونی شێخ ئیبن عوسەیمین، لە فەتواکانیدا یان لە تووندگیریەکەی لەهەمبەر شتە تازەکاندا، دەبێ جەخت بکرێتەوە لەسەر ئەوەی ناوبراو یەکێك بوو لە دیارترین زانایانی شانشینەکە، ئەگەر ئەندامیش نەبووبێ لە لیژنەی فەتواداندا، بەڵام ئەو ئەندامێکی دیار بوو لە دەستەی گەورە زانایاندا.

ناوبراو لەگەڵ شێخ ئیبن باز، زۆر قبوڵ کراو بوون، خوا ڕەحمیان پێ بکات و لێیان ببورێ. زۆر فەتوای فیقهی داوە، کاریگەریەکی ئەرێنی مەزنی هەبووە، بەڵام بەتاڵیش نییەلە شوێنەوار و کاریگەری نەرێنی، بەهۆی ئەو قوتابخانەیەی شوێنی کەوتووە، کە تایبەتمەندە بە زیادەڕۆچوون دژی موسڵمانی بەرامبەر. خاڵە ئەرێنیەکانی لە فیقهەکەیدایە، خاڵە نەرێنیەکانیشی لە زیادەڕۆچوونی لە بیروباوەڕدایە؛ بە وردی باسکردنی ئەمە، پێویستی بە خستنەڕووی دوور و درێژ هەیە، بەڵام بە وردی باسکردنیشی هیچ شتێکی تازە فەراهەم ناکات.

لە نموونەکانیشیدا بە دوور و درێژی باسیان ناکەین، چونکە دووبارە کردنەوە باش نییە، ئەگەر فەتواکانی بگوازمەوە، لەبارەی تەکفیر کردنی ئەوانەی هاواری پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لێبێ) دەکەن، ئینجا ڕەخنەی لێبگرم، ئەوا سوودی زۆر نابێ، چونکە پێشتر فەتواکانی لیژنەیی هەمیشەیی فەتوادانمان لەم بارەوە گواستەوە و ڕەخنەشمان لێگرت، بەهەمان شێوە لە توێژینەوەی فەتواکانی هەر دوو موفتی پێشوو و پێشووتر ئەوەمان خستەڕوو.

## چەند نموونەیەك لە فەتواكانی شێخ ئیبن عوسەیمین

### ١. فەتوای ئاو پرژێن ( ڕەشاشە ):

نامۆترین و توندترین فەتوای شێخ ئیبن عوسەیمین، ئەوەبوو کە لە ناو مزگەوتەکاندا بڵاوکرایەوە، لە کاتی دەرکەوتنی ئاوپرژێن (ڕەشاشە)... بەڵام دوای گەڕانێکی زۆر نەمتوانی دەستم بکەوێت لە ناو کتێبەکانیدا، لەوانەیە لە میانەی ئەو کتێبانەیدا چاپ بکرێ کە هێشتا لە چاپ نەدراون. فەتواکەی ئەوە دەگەیەنێ: هەر کەسێك ئاوپرژێن بهێنێتە ماڵەوە، ئەوا ناپاکی لە خێزانەکەی کردووە، لە ناو ئاگردایە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر دەفەرموویت: ((هەر کەسێك بمرێ و ناپاکی لە خێزان و ژێر دەستەکانی بکات، ئەوا خوای مەزن دەیخاتە ئاگرەوە)). ئەوەندە مەبەستمان بوو.

ئەم فەتوایە وایکرد زۆرێك لە خەڵك سەریان لێبشێوێت، چونکە هەندێك کەس حوکمی ئەوەی لەسەر هەندێکی تر دەدا کە خەڵکی ئاگرە، ئەگەر تۆبە نەکات، چونکە ئاوپرژێنی هێناوەتە ناو خانەوادە و خێزانەکە، شێخ ئاوا و ئاوای وتوە.

سەبارەت بە فەتواکە؛ ئەوا گومان لەوەدا نییە لەوپەڕی زیادەڕۆچووندایە، چونکە چۆن بڕیار دەدەین فڵان پیاوە ناپاکی لە خانەوادەکەی کردووە؟ چونکە بەکارهێنانی ئاوپرژێن لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، سەرباری ئەوەی خاوەنی ماڵێکی ڕێنوێنی کراوە، زۆر سورە لەسەر منداڵ و ئەندامانی خانەوادەکەی زیاتر لە خودی خۆی، لەوانەیە چاوپۆشی لە هەندێك شت بکات بۆ خۆی بەڵام بۆ ئەندامانی خانەوادەکەی واناکات. سەرباری ئەوەی – ئەگەر ئەمە هەڵەش بێ – ئەوا چۆن حوکمی ئەوە دەدات بکەرەکەی لە ئاگری

دۆزەخدایە؟! مرۆڤ لەسەر گشت کردەوەکانی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ، بە چاکە و خراپەکانەوە، نەوەك تەنها لەسەر یەك هەڵە یان یەك چاکە: ﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ ﴾ القارعة.

واتە: (جا ئەوەی تەرازووی خێری سەنگین بێت . ئەوە لە بارودۆخێکی خۆش و ئاسوودەدا ژیان دەباتە سەرو زۆرپێی ڕازیە . ئەوەش تەرازووی "خێروچاکەی" سووك بێت "گوناهی زۆر بێت" . ئەوە دایکی ئەو دۆزەخە "باوەشی بۆکردۆتەوە" ) . شتەکە کێشان و پیوانی تێدایە، تەنها خراپە یان تەنها چاکە ناپێورێن، بەڵکو چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوە.

ئەم فەتوایە شاردرایەوە و بێ دەنگی لێکرا، دوای ئەوەی ئاوپڕژێن گەیشتە ناو ماڵی خودی زیادەڕۆچووانەوە.

ئەم پەلە کردنە لە حەڕام کردنی هەر شتێکی تازەدا، شتێکی نوێ نییە لە ناو قوتابخانەی ناوخۆیی وەهابییەتدا.

## ٢. فەتوا سەبارەت بە نوێژنەکەر

لەگەڵ ئەوەی زۆربەی زانایانی شانشینی عەرەبی سعودی، پێیان وایە نوێژنەکەر، کافرە و کوفری مەزنی کردووە، بەمەش لە ئاینی ئیسلام دەرچووە! (ئەمە تەنها خۆیان پشتگیری لەم ڕایە دەکەن)، بەڵام زۆربەیان باسی ڕاجیایی دەکەن لەم بابەتەدا، ئینجا ڕایەك پەسەند دەکەن بەسەر ئەوانی تردا، بەڵام شێخ ئیبن عوسەیمین فەتوایەکی دوور و درێژی هەیە لەبارەی نوێژنەکەر، تیایدا زۆر حوکمی باسکردووە، لەوانە: نوێژنەکردن لەسەر نوێژنەکەر، ئەگەر بەهۆی تەمبەڵیەوە نەیکات، ئەگەر دانیش بنێ بە واجب بوونی، میرات ناگرێ،

میراتیشی لێ ناگیرێ، لێخۆشبوونی بۆ نییە، سەدەقەی لە جیاتی ناکرێ، حەجی لە جیاتی ناکرێ، ئافرەتەکەی لێ حەرام دەبێ، گرێبەستی هاوسەرگیریەکەی هەڵدەوەشێتەوە، نابێ بێتە ناو مەککەوە، بە هەڵگەڕاوەیی دەکوژرێ، لە گۆڕستانی موسڵمانان نانێژرێ، نوێژی لەسەر ناکرێ، تا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە، لەگەڵ فیرعەون و هامان تا هەتایە لێ نایەتە دەرەوە...تاد. لەمەدا لە زانایانی تری شانشینەکە توندگیرتر بوو، لەگەڵ ئەوەی ئەم بابەتە ڕاجیایی تێدایە، زۆربەی زانایان پێیان وایە نوێژنەکەر بە گوناهبار دادەنرێ نەوەك بە کافر، یان کوفرێکی بچوك ئەنجام دەدات نەوەك کوفری مەزن، ئەمەش لە ئایین نایکاتە دەرەوە، بی بەشی ناکات لە مافەکانی، ئەم فەتوایە بە شێوە دەربڕینی جیاواز دووبارە بووەتەوە[1].

٣. **پێی وایە لە مزگەوتەکاندا نوێژ بە نەعلەوە بکرێ، بە مەبەستی سوننەت زیندوو کردنەوە[2]**

دەڵێم: ئەم فەتوایە ڕەچاوی ئەو جیاوازیانەی نەکردووە، کە لە نێوان مزگەوتەکانی سەردەمی پێغەمبەر و ئەوانەی ئەم سەردەمەمان هەنە.

٤. **فەتوایەك سەبارەت بە حەرام کردنی ناونانی نەسرانیەکان بە مەسیحییەکان[3]**

٥. **تەکفیر کردنی ئەوە دەڵێت: یا محەممەد، یا عەلی[4]**

دەڵێم: ئەوەی وا دەڵێت بە هەڵەکار دادەنرێ، نەوەك بە کوفرکەر، پێشتر هۆکارەکانی ئەمە ڕوونکرانەوە.

---

(١) بروانة: فتاوى ابن عثيمين: ١٢/ ١٥٠، والفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ٧٤

(٢) فتاوى ابن عثيمين: ١٢/ ٣٨٧.

(٣) كتاب الدعوة لابن عثيمين: ٢/ ١٧٧.

(٤) مجموع فتاوى ابن عثيمين: ٢: ١٦٣.

٦. **ئەو وتەیەی خەڵك دروست نییە، كە لە كاتی مردنی یەكێكدا دەڵێن: ((ئەی دەروونی ئاسوودە))[1].**

بەڵگەی شێخ لە حەڕام كردنی ئەمەدا، ئەوەیە ئەمە گەواهیدانە بۆ مردوو بە چوونە بەهەشت.

دەڵێم: ئەمە بەو شێوەیە نییە، نابێ بگشتێندرێ، چونكە ئەمە نزا یان نیمچە نزایە. ئەگەر بەتێروتەسەلتر باسی بكردایە باشتر دەبوو.

٧. **تەكفیر كردنی ئەوانەی قوربانی بۆ گۆڕ و وەلییەكان دەكەن**

ئەوانە تا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدان[2]!!

دەڵێم: لە ڕاستیدا قوربانی نە بۆ گۆڕ و نە بۆ خاوەن گۆڕەكە ناكرێ، ئەوەی باوە ئەوەیە هەندێك خەڵك قوربانی دەكەن بۆ ڕێزگرتن لە سەردانكەرانی گۆڕ، چونكە لە وڵاتانی ئیسلامیدا هەندێك گۆڕ هەن خزمەتگوزار و شوێنی حەوانە و گڵكۆ و جێگای مانەوەیان لە دەوروبەریدا هەیە (لەگەڵ ئەوەی سەردانكردنی گۆڕەكان، لە ڕووی شەرعییەوە فەرمانی پێكراوە، ڕاجیایی هەیە لەبارەی سەفەر كردن بۆ سەریان)، هەندێك خەڵك هەڵدەستن بە قوربانی كردن و ئاژەڵ سەربڕین بۆ ڕێزگرتن لێیان بەپێی نیازی خۆی، یان نیازی خاوەن گۆڕەكە، لەبەر ئەوەی قوربانیكەرەكە باوەڕی وایە، ئاژەڵ سەربڕین بۆ ئەو سەردانكەرانە پاداشتی تێدایە، چونكە بە كارێك هەڵدەستن كە فەرمانبەرداری گوێڕایەڵییە. ئەمە هەموو ئەو شتەیە كە دەكرێ، - بەپێی ئەوەی من دەیزانم – هیچ موسڵمانێك نییە گومان ببات كە خاوەن گۆڕەكە خوایە، لە كاتی سەربڕینی ئاژەڵەكە ناوی ئەو ناهێنێ، بەڵكو ناوی خوای مەزن

(١) فتاوی ابن عثیمین ٣/ ١٤٠.

(٢) فتاوی العقیدة لإبن عثیمین ٣٠، ٣١، ٢٢٠.

دێنێ، پێی وا نییە بەهەشت یان دۆزەخ بە دەستی خاوەن گۆڕەکەیە، بەڵام زیادەڕەوی کردن لە بە گەورەگرتنی گۆڕ و گڵکۆکان کاری زیادەن، لە شەریعەتەوە سەرچاوەی نەگرتووە، هەروەك زیادەڕۆچوونی ئەو زیادەڕۆچووانەش لە شەریعەتەوە نییە.

٨. ئیبن عوسە یمین

پێی وایە ئەوەی بانگەشەی ئازادی هزر و بیروباوەڕ بکات، ئەوا کافرە[1].

٩. نامە ناردن بۆ پێغەمبەر لە دوای کۆچی دوایی کردنی هاوبەشدانانی مەزنە[2]

ئەمەش بەپێی بۆچوونی ئیبن عوسەیمین.

١٠. ئیبن عوسە یمین

پێی وایە ئەوە بڵێت: (بەناوی گەل، بەناوی عەرەبایەتی، بەناوی هاوڵات) ئەوا کوفری کردووە، ئەگەر مەبەستی تەبەڕوك و هاوار کردن بێت، بەڵام دروستە ئەگەر مەبەستی قسە کردن بێ بەناوی گەلەوە[3].

١١. ئیبن عوسە یمین

کاتێك پرسیاری لێکرا، لەبارەی وێنە فێرکارییەکان، وەك ئەوەی لەلای ناوی وشتر (جمل) پیتی (ج) دابنرێ و بەم شێوەیە... شێخ وەڵامی دایەوە ((بەو مەرجەی سەری وێنەکە ببڕدرێ، بکرێتە وشترێکی بێ سەر))[4]!.

(١) مجموع فتاوى و رسائل ابن عثيمين: ٣/ ٩٩.

(٢) فتوى العقدية: ٣٩٦.

(٣) مجموع فتاوى و رسائل إبن عثيمين: ٣/ ٨٨.

(٤) الفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ٤٤٣.

### ١٢. خۆپیشاندنی جەماوەری:

ئەمە لای ئیبن عوسەیمین دەچێتە ناو ڕابواردن و گاڵتە و شتی نا دروستەوە، ئەنجام دان و ئامادەبوون تیایدا حەرامە[١].

### ١٣. ئیبن عوسەیمین:

فەتوایداوە بە حەرام بوونی وتەی ئەوەی دەڵێت: ((بارودۆخەکان وایان ویستووە، چارەنووسەکان وادەخواز))[٢].

### ١٤. ئیبن عوسەیمین:

فەتوایداوە بە حەرامی ناونای داری ناسراو بە (بەندەکانی خوڕ) بەو ناوە[٣].

### ١٥. ئیبن عوسەیمین

دروست نییە هیچ کەسێك وەسف بکرێ بەوەی (حوجەتولئیسلام)ە[٤].

دەڵێم: ئەمە باشە، بەڵام ناوبراو نکۆڵی ناکات لە وەسفکردنی ئیبن تەیمییە بەوەی (شێخی ئیسلام و بەڵگەی ئادەمیزادە... تاد)، بەڵکو ئەمە بەوپەڕی سینە فراوانیەوە بەکاردێنێ.

### ١٦. لیژنەکە و ئیبن عوسەیمین

---

(١) الفتاوى الشرعية، جمع الجريسي: ١٥٦٨.

(٢) مجموع فتاوى و رسائل ابن عثيمين: ٣/ ١١٣.

(٣) مجموع فتاوى و رسائل ابن عثيمين ٣/ ١١٤.

(٤) كتاب الدعوة: ٢/ ١٧٧.

پێیان وایە ئاژەڵ سەربڕین بۆ جگە لە خوا (! بەم شێوەیە) هاوبەشدانانی مەزنە[1]. لەگەڵ ئەوەی لەسەر زەوی ڕوودەدات، قوربانی کردن نییە بۆ وەلییەك یان مردوویێك، بەڵکو ئاژەڵ سەربڕینە بۆ ڕێزگرتن لە سەرەدانکەران بەپێی نیازەکەی... لەوانەیە ئەمە بچێتە ناو چوارچێوەی ناپەسەند یان بیدعە یاخود حەرامەوە... بەڵام بڕیاردان لەسەری بە هاوبەشدانانی مەزن شتێکی ترە...

## ١٧. ئیبن عوسەیمین و حەرام کردنی خوێندنی زمانی ئینگلیزی

((بەناوی خوای بەخشندەی دلۆڤان، درود و سڵاو لەسەر سەروەری پێغەمبەران و نێردراوان پێغەمبەرمان محەممەد و خانەوادە و گشت هاوەڵانی، شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێبێ لە کتێبەکەیدا "إقتضاء الصراط المستقيم مخالفة أهل الجحيم" وتویەتی: (زمانی عەرەبی دروشمی ئیسلام و موسڵمانانە، بۆ موسڵمان دروست نییە قسە بە جگە لەو زمانە بکات) (لا ٢٠٣). پرسیار لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێبێ) کرا لەبارەی نزاکردن لە نوێژدا بە زمانی فارسی؟ ئەویش پێی ناپەسەند بوو. هەروەها شێخ وتویەتی: زمانێکی خراپە و دروست نییە سوێندی پێ بخورێ و نوێژ و گشت پەرستشەکانی دیکەی پێ بکرێ)) (لا ٢٠٤). کەسێکی سەلەفی لە فەرموودەی سەعیدی کوڕی عەلائی بەرزەعی گێڕاویەتیەوە، ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی بەلخی بۆمانی گێڕاوەتەوە، عەمری کوڕی هارونی بەلخی بۆمانی گێڕاوەتەوە، ئوسامەی کوڕی زەید بۆمانی گێڕاوەتەوە، لە نافیعەوە، ئەویش لە ئیبن عومەرەوە ڕەزای خوایان لێبێ، وتویەتی: پێغەمبەری خوا (درود و سڵاوی خوای لێبێ) فەرموویەتی: هەر کەسێك بزانێ بە عەرەبی بدوێت، ئەوا با بە نا عەرەبی نەدوێت، چونکە دەبێتە مایەی دووڕوویی)) (لا ٢٠٥). شتێکی زانراوە،

(١) مجموع الثمين، فتاوى العقيدة، وفتاوى اللجنة الدائمة: ١/ ١٣٤.

ڕاهاتن لەسەر قسەکردن بە نا عەرەبی، هەردەم دەبێتە کارێکی نا ڕەوا، چونکە وا دەکات خاوەن زمانەکانت خۆشبوێ، کە کافر و بێ باوەڕن.

ئەمەش پێچەوانەی بیروباوەڕی دۆستایەتی و دوژمنایەتی بێ باوەڕانە. شێخی ئیسلامی ئیبن تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێبێ وتویەتی: ((بزانە خۆڕاهێنان لەسەر زمان کاریگەری لەسەر ژیری و عەقڵ و ڕەوش و ئایین جێدەهێڵێ، بەشێوەیەکی بەهێز و دیار. بەهەمان شێوە کاریگەریش دەکاتە سەر خۆچوواندن بە پێشینەکانی ئەم ئوممەتە لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان، لە کاتێکدا خۆچوواندن بە پێشینان دەبێتە هۆی زیادبوونی ژیری و ئایین و ڕەوش)) (لا ٢٠٧).

ئەوەی دەبینم لە منداڵیەوە زمانی ئینگلیزی فێری منداڵەکەی دەکات، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەری؛ چونکە سەردەکێشێ بۆ ئەوەی منداڵەکە ئەم زمانەی خۆشبووێت، دواتر خۆشویستی ئەوانەی بەم زمانە دەدوێن؛ ئەمە ئەگەر کابرا لە منداڵیەوە منداڵەکانی خستە ناو کرداری فێربوونی زمانی ئینگلیزی یان زمانەکانی ترەوە.

با ئەو کەسە لە خوابترسێ، کە دەیەوێ ئەم زمانە بهێنێتە ناو موسڵمانان، بە خوا ئەوەی پشتی پێ دەبەستێ تیادەچێ، با ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا بیری خۆی بهێنێتەوە، کە فەرموویەتی: ((هەر بەندەیەك خوای مەزن بیکاتە سەرپەرشت و کاربەدەست، بە ناپاکی کردنەوە بمرێت، ئەوا خوای مەزن بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات))، موسلیم گێڕاویەتیەوە، خوایەگیان پەیامەکەم گەیان، تۆ شایەت بە[1]. تەواو بوو.

(١) گوێبگرە بۆ: شرح زاد المستنقع، كتاب النكاح، الشريط التسجيلي الثاني، الوجه الثاني.

## لە فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی شێخ بەکری باوکی زەید

شێخ بەکری کوڕی زاید ئەندامی دەستەی گەورە زانایان و لیژنەی هەمیشەیی فەتوادانە، لە هەموو زانایانی شانشینەکە میانڕەو و هاوسەنگ و چالاکتربووە (کاتێك دەڵێم: هاوسەنگتر بووە، ئەوە مەبەستم بە بەراوردکردنیەتی بەو زانایانەی هەن، ئەگەرنا خوا لێی ببورێ زۆر زیادەڕەوی دەکات لە سەرزەنشت کرنی حەنەفییەکاندا). شێخ بەکر سەلەفییە نەوەك وەهابی، بە بەڵگەی ئەوەی ناوبراو ستایشی ئەو کەسانە دەکات، کە هاوڕێیانی بە هاوبەشدانانی مەزن تۆمەتباری دەکەن، وەك غەمماریيەکانی مەغاریبە، شێخ بەکر زانستی لای ئەوان خوێندووە، وتەی هاوسەنگی لەبارەیانەوە هەیە، شێخ وەهابی نییە، چەند وتەیەکی هەن لەبەرکراون لەبارەی سەرزەنشت کردنی زیادەڕۆچوونی وەهابیەتەوە، بەڵام ناتوانێ بیسەلمێنێ، یان سەختە ئەوە بکات، بەڵام سەلەفییەکی وشکە، لەسەر ڕێبازی ئیبن تەیمییە و ئیبن قەییمە.

بە هەر حاڵ: شێخ بەکری باوکی زەید بەهەمان شێوە خەسڵەتێکی دیکەی هەیە، کە دووری دەخاتەوە لە ڕەوتی وەهابی، ئەویش ئەوەیە زۆر لێکۆڵینەوەی فیقهی دەکات – کە خەڵك پێویستیان پێی هەیە – زۆر بە کەمی فەتوای لە بوارەکانی بیروباوەڕدا داوە، بەپێچەوانەی وەهابی و سەلەفییەکان.

زیاد لە ٦٠ کتێبی هەیە، زۆربەیانباشن و تەنها بابەتی فیقهی پوختن.. وەك:

١. التقنين والإلزام؛ ٢. أجهزة الإنعاش وعلاوة الوفاة؛ ٣. طفل الأنابيب؛ ٤. خطاب الضمان البنكي؛ ٥. الحساب الفلكي؛ ٦. البوصلة؛ ٧. التأمين؛ ٨. التشريح وزراعة الأعضاء؛ ٩. بطاقة الإئتمان؛ ١٠. بطاقة التخفيض؛ ١١. المثامنة في العقار؛ ١٢. الجناية

على النفس وما دونها؛ ١٣. أدب الهاتف؛ ١٤. تسمية المولود؛ ١٥. تصنيف الناس بين الظن واليقين[١]...، بەم شێوەیە.

ئەمانە چەند بابەتێکی هاوچەرخن، سوپاسی ئەم شێخە دەکرێ لەسەر ئەم بابەتانە، تەنانەت ئەگەر لە هەندێکیاندا پێی خلیسکابێ، وەك توونـدگیری لە بەحەرام گرتنی پەیکەر و کاری نواندن، بەڵام ئێمە ئاسودە دەبین بە هەر هاوسەنگییەك لە ناو قوتابخانەی وەهابییەتدا، ئەگەر خوار و خێچیش بێ، چونکە گشت ئادەمیزادێك هەڵەکارە.

بەڵام بایەخدانی بەو شتانەی، کە سوود و کەڵکیان بۆ خەڵك هەیە، یەکلاکردنەوەی کێشەی ئەوان لەبارەی پێشهاتە هاوچەرخەکانەوە، کارێکی ئەرێنییە، دەبێ بە گەرم و گوڕی ستایشی بکەین لەسەر ئەمە.

بەڵام شێخ پارێزگاری نەکرد لەم خەسڵەتە فیقهییە جوانە، کە حوکمەکان لەبارەی پێشهاتە هاوچەرخەکان دەردەخات... بەڵکو بەهەمان شێوە ڕۆڵی هەبوو لە بابەتی زیادەڕۆچووندا، ئەگەرچی کەمتر بووبێ لە ڕۆڵی هاوڕێیانی لەمەدا.

(١) ئەمە کتێبێکی فیقهی نییە، بەڵام باسی بابەتی دابەشکاری و ڕەخنە لێگرتنی دەکات ، ئەم کتێبە وا لە گەنج دەکات گومانی باش بە موسڵمانی دژەڕای خۆی ببات... بەڵام – لەوەی دیارە – مەبەستی ئەوەیە چاکسازی بکات لە نێوان سەلەفییەکان، کاتێك ڕاجیا و دابەش بوون لەسەرەتای دەیەی ڕابردوو، چونکە خودی شێخ کتێبێکی تری هەیە بە ناونیشانی (الرد على المخالف في أصول الإسلام!!)، مەبەستی لە ڕاجیا لێرەدا تەنها ئەوە نییە کە دژەڕای ئیسلامە، چونکە ئەمە یەکدەنگی لەسەرە، بەڵکو شێخ تیایدا باسی هەموو ئەو موسڵمانانەی کردووە کە دژەڕای سەلەفییەکانن.

لە کتێبەکانی شێخ، کە ئەم هەناسە زیادەڕۆچووە، خاوەن دیدی مەزهەبگەرایی بەرتەسکی تێدا بەدی دەکرێ، ئەمانەن:

معجم المناهي اللفظية[1]؛ ٢. التحديث بما لا يصح فيه حديث؛ ٣. زيارة النساء للقبور؛ ٤. الرد على المخالف من أصول الإسلام؛ ٥. تحريف النصوص. ٦. براءة أهل السنة من الوقيعة في علماء الأمة[2]؛ ٧. التحذير من مختصرات الصابوني في التفسير[3]؛ ٨. بدعة القراء.. تاد.

بەڵام شێخ هێشتا لە هەموو ئەندامانی لیژنەی هەمیشەیی فەتوادان کەمتر زیادەڕۆچووە، لە هەمووان نزیکترە لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە، لە هەموانیش فیقهی فراوانترە، خوای گەورە سەرکەوتووی بکات.

---

(١) زۆر زیادەڕەوی کردووە، لە بە بیدعەدانانی هەندێك وشە و دەربڕین، کە لە نێوان ڕێپێدراو و سوننەتدان.

(٢) ئەم کتێبەی لە هەموو کتێبەکانی دیکەی زیادەڕۆچوونی زیاترە... هێرشی کردۆتە سەر حەنەفییەکان و هەندێك کەسایەتییە دیارەکانیان، وەك عەبدولفەتاح ئەبو غەددە، شتی وا داوەتە پاڵ ئەوان کە نابێ بدرێتە پاڵیان. ئەم کتێبەی پێچەوانەی پەیڕەوی کتێبەکانی تریەتی، چ لە خوێندن و تانەدان لە هەندێك لە زانایانی ئوممەت، یان لە ڕووی ڕەسەنایەتی کتێبەکانی تر تا ئاستێك.

(٣) لێرەدا هەوڵیداوە، بیروباوەڕی سەلەفییەت بەسەر بخات، بەسەر بیروباوەڕی ئەشعەریدا، لەگەڵ زیادەڕۆچوون و توندگیریەکی زۆردا.

## فەتوا و ڕا و بۆچوونەکانی شێخ حەمود تەویجری

حەمود تویجری (١٤١٣ك کۆچی دوایی کردووە) ڕەحمەتی خوای لێبێ، یەکێك بووە لە توونـدگیرەکان لـە بابەتـەکانی بیروباوەڕ و فیقهدا بەیەکسانی... دونیانەویستبوو و پشتی هەڵکرد لە بەرپرسیارێتی و سەرۆکایەتی پۆستی زانستی یان کرداری، یەکێکیش بووە لەوانەی زۆر کتێبی نووسیوە، ژمارەی کتێبەکانی (٤٠ کتێبە).

زۆربەی دانراوەکانی بەرپەرچدانەوەن، زیادەڕۆچوون و جیاکاری زۆری تێدایە، هەروەك زۆر بە توونـدی پشتگیری تایبەتمەندییـەکانی بیروباوەڕی سەلەفی وەهابی کردووە، ئەوەش کە دژی ئەم بیروباوەڕە بووە بە توونـدی تەکفیری کردووە، بە بیدعەچیش داناوە، ئەوەندە بەسە سەیری هەندێك ناونیشانی کتێبەکانی بکەین، کە بێ نیازمان دەکات لە ناوەڕۆکەکەیان. لە دیارترین کتێبەکانی:

١- عقيدة أهل الإيمان في خلق آدم على صورة الرحمن

(ئەم کتێبەی لە هەموو کتێبێی زیاتر زیادەڕۆچوونی تێدایە لە بیروباوەڕدا، هەوڵیداوە ئەوە بچەسپێنێ، کە خوای گەورە ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروستکردووە، هەروەك لە ناونیشانی کتێبەکەشدا دیارە، ئەمەش لە میانەی دەستگرتن بە فەرموودەیەکی لاواز، ئەمەش زێدەڕەوی کردنیەتی لە بەرپەرچدانەوەی موعتەزیلە و ئەشعەرییەکان، ئەمە ئەو زیادەڕەوییەیە کە زۆر جار سەلەفییەکان پاڵدەنێ بۆ زیاد وێچواندنی خوا بە بەدیهێنراوان. پەنا دەگرین بە خوا لە دوژمنایەتی زیاد لە پێویست، کە سەردەکێشێ بۆ زیادەڕۆچوونی پێچەوانە، ئەوەی نامۆیە ئەوەیە، کە شێخ تەویجری تۆمەتباری ئەو کەسە دەکات کە دان نانێ بەوەی ئادەم لەسەر وێنەی خوایە! بەوەی

جەهەمییە! واتە بێ باوەڕە!لەوەش نامۆتر ئەوەیە شێخ ئیبن باز پێشەکی بۆ ئەم کتێبەی نووسیوە و ستایشی کردووە، کتێبە لە چاپدراوە و ناودارە، یەکێکە لە بڵاوکراوەکانی خانی لیواء).

٢- الإحتجاج بالأثر على من أنكر المهدي المنتظر

(تیایدا بەرپەرچی ئیبن مەحمودی داوەتەوە، کە موفتی قەتەر بوو).

٣- إعلان النكير على المفتونين بالتصوير.

٤- إنكار التكبير الجماعي وغيره.

٥- إيضاح المحجة في الرد على صاحب الطنجة.

٦-الإيضاح والتبيين لما وقع فيه الأكثرون من مشابهة المشركين.

٧- تحريم الصور والرد على من أباحه.

٨- تحفة الإخوان بما جاء في الموالاة والمعاداة والحب والبغض والهجران.

٩- تنبيه الإخوان على الأخطاء في مسألة خلق القرآن.

١٠- التنبيهات على رسالة الألباني في الصلاة.

١١- تنبيهات على تصحيح أحمد شاكر لبعض الأحاديث.

١٢- دلالة الأثر على تحريم التمثيل (لعله التمثيل) بالشعر.

١٣- الرد الجميل على أخطاء ابن عقيل.

١٤- الرد على الكاتب المفتون.

١٥- الرد القويم على المجرم الأثيم.

١٦- الرد القوي على الرفاعي والمجهول وابن علوي وبيان أخطائهم في المولد النبوي.

١٧- الرسالة البديعة في الرد على أهل المجلة الخليعة

(بەرپەرچدانەوەی فەتوایەکی لەبارەی ڕێپێدانی گۆرانی وتن)

١٨- السراج الوهاج لمحو أباطيل الشلبي عن الإسراء والمعراج.

١٩- الشهب المرمية لمحق المعازف والمزامير وسائر الملاهي النقلية و العقلية.

٢٠- الصارم البتار للإجهاض على من خالف الكتاب والسنة والإجماع والآثار.

(کتێبێکە لە بەرپەرچی ئەو بەشەی سوو نووسراوە، کە بە ڕێپێدراو دانراوە).

٢١- الصارم المشهور على أهل التبرج والسفور...

(بەرپەرچدانەوەی ئەلبانی لە بارەی باڵاپۆشی، وایلێهاتووە ئەلبانی لەلای تووەیجری بە یەکێك لە بانگخوازانی ڕووت و قوتی دانراوە)!!.

٢٢- الصواعق الشديدة على أتباع الهيئة الجديدة.

٢٣- فتح المعبود في الرد على ابن محمود.

٢٤- فصل الخطاب في الرد على أبي تراب... (لەبارەی گۆرانیەوە).

٢٥- القول البليغ في تحذير من جماعة التبليغ

دەڵێم: ناونیشانەکانی کتێبەکانی تووەیجری، ئەوەندە ڕوونن، پێویست بە خستنەڕووی ناوەڕۆکی کتێبەکانی ناکات، پوختە ئەوەیە کە یەکێکە لە زیادەڕۆچووترین کەسی ناو زیادەڕۆچوان لە بوارەکانی دۆستایەتی و دوژمنایەتی و خۆچوواندن بە هاوبەشدانەران... تاد.

سەبارەت بە بانگخوازەکان، وەك: سەفەر حەوالی و جگە لەویش، ئەوا لە زیادەڕۆچوونە دەرنەچوونە، بەڵکو لە بەرگێکی نوێدا نمایشیان کردووە، لەگەڵ ئەوەی بەکاریشی هێناوە بۆ زیاتر هاندان لە دژی دەوڵەت، خۆ ئەگەر بەرهەڵستیەکەی حەوالی و هاوشێوەکانی بۆ زیاتر فەراهەم کردنی مافەکان بووبا، ئەوا پاساومان بۆ دەهێنایەوە، بەڵام بەرهەڵستیەکەی بۆ زیاتر چەسپاندنی زیادەڕۆچوونە، پێی وایە دەوڵەت کەمتەرخەمە لە لەناوبردنی مەزهەب و تاقم و کۆمەڵە و ڕەوتە ناوخۆییەکان، وەك: شیعە و سۆفی و نوێگەری و لیبرالییەت... تاد.

**کۆتا تێبینی:** ئەمە توێژینەوەیەکی نیمچە کۆنە، پێش چەند ساڵێك نووسیومە، ئەگەر پێداچوونەوەم بۆ کردبووبا ئەوا دەرم نەدەکرد، هەر ڕۆژێك نەزانی و شتێکی زیاتر دەزانم، ناشزانم ئەم زانستە دەبێتە بەڵگە بۆم یان لە دژم، بەڵکو ئەمە دەڵێم، چونکە هەندێك کتێبم هاوکات بوون لەگەڵ ئەم کتێبە، هەر بۆیە پێویست بوو ئەم تێبینیە بدەم. لەوانەیە ڕاجیایی لێرەدا هەبێ لە زمان یان هەندێك بیرۆکەی کەمدا.

# ئەم کتێبەی بەردەستمان...

لە زمانی عەرەبیەوە وەرمگێڕاوە بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی، پێم وایە یارمەتیدەرێکی باشە بۆ ئاشنابوون بەو سەرچاوە و ڕاو بۆچوون و فەتوایانەی رەگ و ڕیشە و ژێرخانی رەوتی توند رەوین لە سەردەمی ئەمڕۆدا.
هیوای تەمەن درێژی و سەرکەوتن بۆ نووسەری بەڕێز دەخوازم، ئومێدم وایە توانیبێتم واتا و مەبەستەکان وەك خۆیان بگوازمەوە و کەڵك بە خوێنەری ئازیز بگەیەنم.

وەرگێڕ






کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
دیزاین - چاپکردن - بڵاوکردنەوە
mdmaktaba@gmail.com
عێراق - کوردستان - هەولێر

چاپخانەی رۆژهەڵات/هەولێر